ناوی کتێب: دین و عەلمانیەت
ناوی نووسەر: مەریوان وریا قانع
بابەت: فکری
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٨
چاپخانە: ئەندێشە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٧٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٥٢٩)ـی ساڵی (٢٠١٨)ـی پێ دراوە.

مافی ئەم کتێبە پارێزراوە©
بەبێ ڕەزامەندیی ئەندێشە، هیچ لایەنێک ڕێگەپێدراو نییە بۆ لەبەرگرتنەوەی ئەم کتێبە، جا گەر بە شێوەی ئەلکترۆنی، کاغەزی، وێنەیی، دەنگی، یان هەر شێوازێکی تری لەبەرگرتنەوە بێت.

پێشکەشە بە:

هەموو ئەوانەی توانای بینینی ئاڵۆزییەکانی دونیایان هەیە، ئەوانەی دونیا بەسەر دین و نادین، دیندار و بێدین، ئیسلام و کافردا، دابەش ناکەن.

# ناواخن

## پێشەکی



## دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (١)

## سەدەی نۆزدەهەم: سەدەیەکی عەلمانی؟

## دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (٢)
## لەدیکبوونی زانستی کۆمەڵناسی



## دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (٣)
## ئەمیلی دۆرکهایم: پێگەی دین لە دونیای مۆدێرندا

## دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (٤)

## ماکس ڤیبەر و تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا



## دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (٥)

## بریان ویلسن: حەتمیەتی بەعەلمانیبوونی دونیا

## ڕەخنە لە ئاین (١)
## کیرکیگارد دژ بە هیگل



## ڕەخنە لە ئاین (٢)
## ئالێکسی تۆکفیل و پەیوەندیی نێوان دین و دیموکراسیەت



## دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (١)
## تالکوت پارسۆن و داڤید مارتین

## دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٢)
## جۆزێ کازانۆڤا و رۆڵی دین لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا



## دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٣)
## تەلال ئەسەد و ئەنترۆپۆلۆژیای عەلمانیەت

## دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٤)
## پیتەر بێرگەر و تێزەی بەناعەلمانییوونی دونیا



## دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٥)
## هابرماز و کۆمەڵگای پۆست عەلمانیەت: ڕۆڵی ئەخلاقی و سیاسییانەی دین

## دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٦)
## دیموکراسیەت یان عەلمانیەت؟
## ئایت بادەر و جیاکردنەوەی دیموکراسیەت و عەلمانیەت لەیەکتری



## دوابەش
## هەندێک دەرەنجامی گشتی
## رەخنە لە عەلمانیەت بە چ مانایەک؟

# پێشەکی

**عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا... عەلمانیەت وەک پرۆسە**

لەنێوان مانگی حەوت و مانگی دوازدەی ساڵی ٢٠١٢ و بە درێژاییی زیاد لە چوار مانگ، من هەڤدە وتارم لەسەر مەسەلەی عەلمانیەت وەک کێشەیەکی تیوری و سیاسی نووسی و لە ڕۆژنامەی ئاوێنەدا بڵاوم کردەوە. لەو نووسینانەدا هەوڵم دا مێژووی دروستبوونی "تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا" و دروستبوونی "عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا" شی بکەمەوە. لە کۆمەڵێک نووسەری گرنگی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستم پێ کرد و تا سەرەتاکانی سەدەی بیستویەکەم درێژەی هەبوو. لەنێوان ئەو دوو سەردەمەشدا بۆچوون و ڕوانینەکانی چەندەها کۆمەڵناس و فەیلەسوفی سیاسیم خستە ڕوو، کە شیکردنەوەی گرنگ و سەرەکییان بۆ مەسەلەی عەلمانیەت و تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا ئەنجام داوە. مەبەستی من لەو نووسینانە ئاگادارکردنەوەی خوێنەران بوو لە مێژووی ئەو دوو چەمکە و لەو گۆڕانکارییانەی بەسەر مانا و دەلالەتەکانیاندا هاتوە. خواستی سەرەکیی من ئەوە بوو زەخیرەیەکی تیوری و فیکری و میتۆدیی ئاڵۆز و نوێ بخەمە بەردەستی هەموو ئەو کەسانەوە کە سەرقاڵی

مەسەلەی عەلمانیەت و شیکردنەوەی پەیوەندیی نێوان و سیاسەت و دین و ژیانی گشتی لە کوردستاندا. هەروەها دەمویست ئەو ململانێ ئایدیۆلۆژییە سەختە هێور بکەمەوە کە لەنێوان بەرەی خۆبەعەلمانیزان و بەرەی ئیسلامییەکانی کوردستاندا لەئارادا بوو. نووسینەکان هەوڵدانێک بوون بۆ تێپەڕاندنی ئەو سەنگەرگیرییە ئایدیۆلۆژی و دینییەی ئەو گروپانە لە کوردستاندا لە یەکتری و لە کۆمەڵگای کوردیان گرتوە. سەنگەرگیرییەک کە ئەگەرێکی گەورەی پێکدادان و توندوتیژبوونی ناوەکی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتوە و وەک یەکێک لە جەنگە ئایندەییەکانی کۆمەڵگای ئێمە دەر دەکەوێت. ئەم سەنگەرگیرییە مێژوویەکی درێژیی لە ناوچەکەدا هەیە و لەدوای هەڵوەشاندنەوەی سیستمی خەلافەتی عوسمانییەوە لە سالانی بیستی سەدەی بیستەم و لە دوای درستبوونی ئەتاتورک و حەسەن بەنناوە لە یەک کاتدا، ئەم ململانێیە لە گەشەکردنی خۆیدا توندتر و هەمەلایەنتر بۆتەوە. لەمرۆشدا نەوەیەک لە کوردستاندا پەروەردە بووە هەندێکیان بە ناوی ئیسلام و ئیسلامیزمەوە عەلمانیەت وەک گوناهی ژمارە یەک و وەک گەورەترین تاوانباری مێژووی ئێمە و مێژووی ناوچەکە وێنا دەکەن و هەموو کارەساتەکانی دونیای ئێمە و ناوچەکە، ئیتر ئەمە دیکتاتۆریەت و سوڵتانیزم و مافیابوونی دەسەلات و گەندەڵی و دزی و کوشتن و بڕینە یان شتێکی دیکە، دەخەنە پاڵ عەلمانیەتەوە و عەلمانیەت لە هەموو تاوانەکان بە بەرپرسیار دەزانن. ئەم ڕوانینە تا ئەو شوێنە دادەبەزێت کە تاوانەکانی سەدام حوسەین و حافز ئەسەد و کوڕەکەی بدەنە پاڵ عەلمانیەت. ستمەگەریی ئەو

سیستمانە لە عەلمانیەتدا کورت بکەنەوە. لە کاتێکدا بەرەی دووهەم هەموو نەهامەتییەکانی هەمان دونیا دەدەنە پاڵ دواکەوتوویی عەقڵیەتی ئیسلامی و نامەعقوولی و توندوتیژی و غەدرکردنی گەورەی ئەم دینە لە مرۆڤ بەگشتی و لە ئافرەت و کەمینەکان بەتایبەتی. کۆکوژیی کورد لە ئەنفالدا، بۆ نموونە، ئەیدەنە پاڵ ئیسلام و پاڵ ئایەتێک لە قورئاندا بە ناوی ئەنفالەوە. بەمەش جینۆسایدی ناو دونیای ئەمڕۆ و ڕەگەزە ئایدیۆلۆژی و بیرۆکراسییە مۆدێرنەکانی بە هێڵێکی ڕاستەوخۆ بە دینەوە گرێ ئەدەن و ئیسلام دەکەنە سەرچاوەی ئەو کۆکوژی و تاوانە گەورەیە.

ئەو نووسینانەی من لەو ماوەیەدا نووسیم، بەشێک بوون لە هەوڵێک بۆ شکاندن و تێپەڕاندنی ئەم سەنگەرگیرییە دووجەمسەرییە کە هەم لەسەر وێنەیەکی هەڵە بۆ عەلمانیەت و هەم لەسەر وێنەیەکی هەڵە بۆ دین دامەزراوە. هەردوو بەرەکە بە هەمان لۆژیکی یەکدی نەفیکردنێکی تەواو کار دەکەن و بیر دەکەنەوە. بەڵام بەداخەوە ئەم نووسینانە تا ئەم ساتە نەک هاریکاریی دروستکردنی دۆخێکی نوێی فیکری و مەعریفی و سیاسیی نەبوون بۆ قسەکردن لەسەر عەلمانیەت و پێگە و ڕۆڵی دین لە دونیای ئەمڕۆدا، بەڵکو هەردوو بەرەکە بە هەمان لۆژیکە ئایدیۆلۆژییە داخراو و ترسناکەکەی خۆیان درێژەیان بەو ململانێیە دا کە لەگەڵ لەدایکبوونی ئیسلامی سیاسییەوە لەم ناوچەیەدا دروست بووە.

لە ئێستاشدا قسەوباسێکی هێجگار زۆر لەسەر عەلمانیەت لە کوردستاندا هەیە و دەکرێت، هەم هەوادارانی عەلمانیەت

خۆیان و هەم دوژمنەکانی لەناو ئیسلامییەکاندا قسە بەیەکتر دەڵێن و پەلامارێکی ئایدیۆلۆژیی پڕ لە توندوتیژیی ڕەمزیی یەکتری دەدەن. یەکێک لە کێشە گەورەکانی ئەم ململانێیە لەوەدایە کە زۆربەی بەشداربووەکانی لە دۆخی بێئاگاییەکی تەواودان لە دونیایەک تیژ و ڕوانینی نوێ کە لەسەر مەسەلەی عەلمانیەت و لەسەر مەسەلەی پێگە و ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا، لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە تا ئەمڕۆ بەرهەم هاتوون. زۆربەی ئەو قسانەی لە دونیای ئێمەدا لەسەر ئەم مەسەلانە دەکرێت، قسەی سەدبارەی بێتام و دۆگمایی پڕ ڕق و پڕ خواستی بە گەمژە و بە نەزانن و بە خائینکردنی یەکترییە. زمانێکی ڕیتۆریکی و ئینشایی ناقۆڵا ململانێکە بەڕێوە دەبات و لە ڕاستییشدا بەشێکی گرنگی ململانێکەی دروست کردوە و درێژە پێ ئەدات. بەشی زۆری ئەو قسانەی دەکرێن، ئەو دیدە دۆگمای و تەقلیدییانە سەبارەت بە عەلمانیەت و پێگەی دین تێناپەڕێت، کە زۆر جار دوو سەدە کاتیان بەسەردا تێپەڕیوە و تا ئێستاش تەپوتۆزی سەدەی نۆزدەهەمیان پێوەیە.

بیرۆکەی ژمارە یەکی ناو ئەم ململانێیە، کە ئەم کتێبە نیشانی ئەدات، بیرۆکەیەکی هەڵەیە، دووبارەکردنەوەی ئەو دۆگما سەرسەختەی ناو فیکری سیاسی و کۆمەڵایەتییە کە مۆدێرنە، واتە پرۆژەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بە ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەتەوە گرێ دەدات و زۆر جاریش بە یەکتریان یەکسان دەکات. ئەم دۆگمایە دەڵێت مۆدێرنە مانای عەلمانیەت و عەلمانیەتیش مانای مۆدێرنەیە. هاوکات دامەزراندنی سیستمی

دیموکراسی و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و قبوولکردنی پلورالیزمیش هەر بە بوون و ئامادەگیی عەلمانیەتەوە گرێ ئەدەن. بەکورتی؛ لەم دیدەدا عەلمانیەت پێشمەرجی تازەبوونەوە و پێشمەرجی دیموکراسیەت و پێشمەرجی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و پێشمەرجی دەستەبەرکردنی مافەکانی مرۆڤە. گەر عەلمانیەت بوونی نەبوو یان بوونی نەبێت، ئەوا لە هیچ یەکێک لەو شتانەی باس کران بوونیان نابێت و نایەنە کایەوە. بۆیە مۆدێرنە مانای عەلمانیەت. ئەم دیدە عەلمانیەت خۆیشی، بە سادەییەکی سەرسووهێنەرەوە، وەک جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، یان دین لە سیاسەت پێشنیار دەکات.

بە دیوی ئەودیودا، ئیسلامییەکان یەک سەدەی ڕەبەقە قسە بە عەلمانیەت دەڵێن و تۆمەتی هەمەجۆر و سادە و بێمانای دەخەنە پاڵ. جارێک یەکسانی دەکەن بە بێدینی و جارێک بە دوژمنی ژمارە یەکی ئیسلام و جارێک بە تێکدەر و شێوێنەری بەها و فەرهەنگی دینی و جارێک بە خۆفرۆشتن بە خۆرئاوا و جارێک بە دزی و جەردەیی و کوشتن و بڕین و جارێکی دیکەش بە سەرچاوەی دروستبوونی دیکتاتۆریەت و ستەمگەریی لە ناوچەکەدا. هەرچی خراپەکارییەکانی دونیای مۆدێرن هەیە دەیدەنە پاڵ عەلمانیەت و لە فۆرمی ئەهریمەنێکی دونیاییدا نماییشی دەکەن، کە دەستەکانی لەگەڵ دەستەکانی ئەهریمەنی ناو دیندا تێکەڵە و بەیەکەوە پەلاماری دین و دینداری و ئەخلاق و کۆمەڵگا و ڕەسەنایەتی ئەدەن. بەکورتیەکەی وەک چۆن عەلمانییەکان عەلمانیەت بە سەرچاوەی سەرەکیی هەموو

-یان زۆربەی هەرەزۆری- دەسکەوتە گرنگەکانی دونیای مۆدێرن دەزانن، ئیسلامییەکان عەلمانیەت وەک سەرچاوەی هەموو، یان زۆربەی خراپەکارییەکانی دونیا، نماییش دەکەن. ئەمیان دەیکاتە چاکەیەکی ڕەها و ئەوی تریان دەیکاتە خراپەیەکی ڕەها.

یەکەمین ئەرکی ئەم کتێبە سڕینەوەی ئەم جەنگە دووجەمسەر و دوالیستییەیە، کە وەک هەموو دووجەمسەری و دوالیزمەکانی ناو فیکر و سیاسەت جگە لە کارەسات هیچی تری لێ چاوەڕوان ناکرێت. ئەم کتێبە دەیەوێت بیسەلمێنێت هەردوو دیدەکە بۆ عەلمانیەت هەڵەن، هەڵەی زۆر گەورەش، کە دەشێت دەرەنجامی سیاسی و کۆمەڵایەتیی زۆر ترسناکیان لێ بکەوێتەوە و ڕەچەتەیەکی پڕمەترسییش بن بۆ چەندەها پێکدادان و جەنگی خوێناوی و ئاییندەیی. ئەم کتێبەیە دەخوازێت نیشانی بدات چۆن تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا لەدایک بووە و بەرهەمهێنەرەکانی سەر بە کام کایەی فیکری و مەعریفین. هەروەها دەخوازێت بەشێکی گرنگی ئەو ڕەخنانە بە خوێنەران بناسێنێت کە لەم تێزەیە گیراوە و ئەو ئەلتەرناتیڤانەش چین کە بۆ عەلمانیەت پێشنیار کراون. بەڵام بەر لەوەی لە لاپەڕەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا ئەم ئەرکانە جێبەجێ بکەین، با لەو جیاکارییە گرنگەوە دەست پێ کەین کە عەلمانیەت وەک پرۆسەیەکی مێژوویی و عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی لە یەکتری جیا دەکاتەوە. بەبێ ئەم جیاکارییە زەحمەتە بزانین بابەتی قسەکردن و بەرخوردەکانمان کامانەیە.

## جیاکردنەوەی عەلمانیەت وەک پرۆسە لە عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا

وەک پێشتریش وتم، لە دونیای ئێمەدا ڕوانینێکی زۆر سادە و بێگومان ناڕاست بۆ عەلمانیەت هەیە، کە پێی وایە مانای عەلمانیەت جیاکردنەوەی دین و سیاسەتە یان دین و دەوڵەتە لە یەکتری. بەڵام ئەم ڕوانینە زۆر گشتی و ناکۆنکریت و ناڕاستە، عەلمانیەت تەنها ئەو جیاکردنەوەیەی نییە. بۆ ئەوەی بەرخوردێکی زانستیمان بەرانبەر بە عەلمانیەت هەبێت، پێویستە بەر لە هەموو شتێک و هەر لە سەرەتای سەرەتاکانەوە دوو چەمک لەم باسەدا لەیەکتری جیا بکەینەوە. یەکەمیان عەلمانیەتە وەک ئایدیۆلۆژیا، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەگوترێت سیکیولاریزم secularism، بە عەرەبی العلمانیە. لەگەڵ عەلمانیەتدا وەک پرۆسە، ئەوەی بە ئینگلیزیی پێی دەڵێت سیکیولاریزەیشن secularisation، بە عەرەبی العلمنە. ئەم دووانەش دوو شتی تەواو جیاوازن و تێکەڵکردنیان ڕێگە لە هەموو هەوڵدانێک بۆ تێگەیشتن لەهەر یەکێکیان لەناو دەبات.

خاڵی سەرەکیی لە عەلمانیەتدا وەک ئایدیۆلۆژیا پێداگرتنێکی سەخت و بەردەوامە لەسەر ئەوەی کە نابێت دین ڕۆڵ لە ژیانی گشتی و سیاسیدا بگێڕێت و پێویستە کورت ببێتەوە بۆ پەیوەندییەکی شەخسی لەنێوان تاکەکەس و خوداکەیدا. عەلمانیەت بەم مانایە تەنها دابڕانی دین و سیاسەت نییە لە یەکتری، تەنها جیاکردنەوەی دین و دەوڵەتیش نییە، بەڵکو بردنەوەی دینە بۆ ناو "ڕووبەری تایبەت" و

پاشەکشەپێکردنیەتی لە "ژیانی گشتی."بە دیوی ئەودیوادا عەلمانیەت بە هیچ مانایەک مانای بێدینی و کوفر و ئیلحاد و سووکایەتیکردن بە دین ناگەیەنێت، پەیوەندیی بە بێدینییەوە نییە، دەوڵەت بە گژ دین و دینداریدا ناچێتەوە، هەوڵی لاوازکردنی دین نادرێت، سووکایەتی بە مرۆڤی دینی ناکات، عەلمانیەت لەم ئاستەدا مانای ڕێکخستنی شێوازی ئامادەگیی دین لە ژیانی گشتیدا و بەپێی ئەم ڕێکخستنەش دین پێویستە بەشێک نەبێت لە ژیانی گشتی، بەڵکو بەشێک بێت لە ژیانی تایبەت و شەخسیی تاکەکەسی ئیماندار خۆی. عەلمانیەت کە ئەمە دەڵێت، هاوکات دەبێت ئەو خاڵە بۆ هەمووان ئاشکرا بێت کە زیاد لە مۆدێلێک بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان دین و ژیانی گشتی لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکانی ئەمڕۆکەدا هەیە، کە دین تیایاندا کورت نەبۆتەوە بۆ پەیوەندییەکی شەخسی لەنێوان ئیمانداران و خوداکانیاندا. ئەگەر بۆ نموونە مۆدێلی فەرەنسی مۆدێلێک بێت لەسەر دابڕانێکی سەختی ئایین و ژیانی گشتی کار بکات، ئەوا مۆدێلی هۆڵەندی ئەو جیاکردنەوە ڕادیکاڵ و پەرگیرەی تێدا نییە و دین لە ژیانی گشتی و سیاسیی کۆمەڵگای هۆڵەندیدا بە شێوازی جیاواز ئامادەیە. ئەم خاڵانە دواتر دێمەوە سەریان، ئەوەی بۆ ئێستا گرنگە خوێنەران لێی ئاگادار بن، کە خواستی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا ناکۆکە بە پێگە و ڕۆڵی دین لە زۆرێک لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا، کە کۆمەڵگای عەلمانین.

بێگومان عەلمانیەت ئایدیۆلۆژیایەکی بەهێزی سەدەی بیستەمە، دونیا دابەش دەکات بۆ دوو مەجالی ناکۆک و دژەبەیەک، کە "ڕووبەری دین" و "ڕووبەری دونیایی"ن،

یان "ڕووبەری دینی" و "ڕووبەری عەلمانی"ن، یان "ژیانی تایبەت" و "ژیانی گشتی"یە. لەم ئایدیۆلۆژیایەدا ڕووبەری دین ڕووبەری ژیانی تایبەتە، بەرانبەر بە ڕووبەری عەلمانیبوون کە ڕووبەری ژیانی گشتییە، بە کایەی سیاسییشەوە. عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا ئەم جیاکردنەوەیەی دین و ژیانی گشتی و دین و ژیانی سیاسی، بە پێشمەرجی سەرەکیی لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن دەزانێت. خەسڵەتی سەرەکیی پرۆژەی مۆدێرنەش لە خەسڵەتی عەلمانیبووندا جێگیر دەکات. بەم مانایە عەلمانیەت جۆرێک لە تێگەیشتن و لێکدانەوەی تایبەتی مێژووە، بەتایبەتی مێژووی لەدایکبوونی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان. زۆر کەسیش پێیان وایە ئەم لێکدانەوەیە بۆ مێژوو هەڵگری یۆتۆپیایەکی گەورەیە، کە یۆتۆپیای نەمانی دین یان پاشەکشەکردنی تەواوەتیی دینە بۆ ناو ڕووبەری تایبەت و ژیانی شەخسیی مرۆڤەکان، یاخود جێگرتنەوەی دین بە زانست و مەعریفەی مۆدێرن لە مێژووی کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا.[1]

وەک هەر ئایدیۆلۆژیایەکی تریش، عەلمانیەت هەڵگری سیستمی حەرام و حەڵاڵی تایبەت بە خۆیەتی، حەلال و حەرامی فیکری و سیاسی و کۆمەڵایەتی. بۆ نموونە، وەک چۆن ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم دەیەوێت "خاوەندارتێتیی تایبەت" نەمێنێت، نازییەت دەیەوێت هەندێک ڕەگەزی ئینسانی نەمێنن یان وەک ڕەگەزی خراپ و نزم بمێننەوە و مامەڵە بکرێن، ناسیۆنالیزم دەیەوێت کۆتایی بە دەسەڵاتی

1 -Van der Veer, Peter (1995). The secular production of religion. Etnofoor, Jaarg. 8, Nr. 2, P.722

نەتەوە و کولتوورێک بەسەر نەتەوە و کولتوورێکی دیکەدا بهێنێت، لیبرالیزم دەیەوێت کۆتایی بە دەسەلاتی گروپ بەسەر تاکەکەسدا بهێنێت، ئاواش عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا دەیەوێت کۆتایی بە دەسەلاتی دین بەسەر ژیانی گشتی و سیاسی و فەرهەنگییەوە بهێنێت، دین کورت ببێتەوە بۆ پەیوەندییەکی شەخسی لەنێوان ئیماندار و خوداکەیدا. عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا نایەوێت دین ڕۆڵ لە ژیانی گشتی و لە ژیانی سیاسی و فەرهەنگیی کۆمەڵگادا بگێڕێت. دین، جا چ بە خۆشی بێت یان بە زۆر، پێویستە بچێتەوە ناو سنووری ژیانی تایبەت و لەوێدا بەو شێوەیەی کە دەیەوێت ڕۆڵ لە ژیانی تاکەکەسە ئیماندارەکاندا ببینێت. بەم مانایە عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا دژ بەوە نییە کە دین ڕۆڵ ببینێت، بەڵکو دژ بەوەیە ڕۆڵ لە ژیانی گشتیدا ببینێت، دەنا دین دەتوانێت لە ژیانی تایبەتیی تاکەکەسدا هەموو ئەو ڕۆڵانە ببینێت کە تاکەکەس خۆی دەخوازێت و هەڵی دەبژێرێت.

لەم گۆشەنیگایەوە عەلمانیەت وەک ئایدۆلۆژیا مێژووی ئەم دوو سەدەیەی دوایی مرۆڤایەتی، سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم، بە شێوازێک نمایش دەکات و دەخوێنێتەوە کە لەگەڵ سەلماندنی ئەو داواکارییە سەرەکییەی خۆیدا بگونجێت. لە خوێندنەوەی ئەو مێژووەدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دین ئەو ڕۆڵە گشتییەی نەماوە کە جاران هەیبووە و لەباتیی ئەوە پاشەکشەی کردوە بۆ ناو سنوورەکانی ژیانی تاکەکەسی. هاوکات ئەم پاشەکشەیە وەک ئاکاری سەرەکیی لەدایکبوونی دونیا و کۆمەڵگا مۆدێرنەکان وێنا دەکات. لەم خوێندنەوەیەدا گەڕاندنەوەی دین بۆ مەجالی

تایبەت دەبێت بە بنەمای سەرەکیی لەدایکبوونی مۆدێرنە، بە بنەمای دیموکراسیەت، بە بنەمای لیبرالیزم و بە بنەمای هەموو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی ناو دونیای مۆدێرن. دیوی ئەودیوی ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە هیچ یەکێک لەو پێشکەوتن و گۆڕانکارییە سەرەکی و گرنگانە ڕوو نادەن گەر دین لە ژیانی گشتیدا ئامادە و چالاک بێت. بۆ ئەوەی دونیا بگۆڕێت و تازە ببێتەوە پێویستە دین بچێتەوە بۆ ناو دڵ و دەروونی ئیمانداران و نەبێتە بەشێک لە ژیانی گشتی و ژیانی سیاسی.

**عەلمانیەت وەک پرۆسە: تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا**

بەڵام وەک وتمان، عەلمانیەت تەنها ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسیی نییە، بەڵکو کۆمەڵێک پرۆسەی مێژووییشە. عەلمانیەت وەک پرۆسە جیاوازە لە عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا. عەلمانیەت وەک پرۆسە لە جەوهەردا باسکردنی چۆنیەتیی لەدایکبوونی دونیای مۆدێرنە. لێرەدا لەباتی باس لە عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا بکرێت، باس لە پرۆسەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" دەکرێت و ئەم پرۆسەیەش وەک پرۆسەی گۆڕان و تازەبوونەوەی دونیا، وەک لەدایکبوونی دونیایەک جیاواز لە دونیای کۆن، وەک هاتنەکایەی هێز و دەزگا و شێوازی حوکمڕانیی تازە و وەک دروستبوونی شێوازی نوێی کەسایەتی و خود و شوناس، نیشان ئەدرێت. ئەگەر عەلمانیەت لە فۆرمی سیکیولاریزمدا ئایدیۆلۆژیا بێت، ئەوە پرۆسەی بەعەلمانیبوون لە فۆرمی سیکیولاریزەیشندا، تیورە یان گریمانە یان تێزێکی فیکرییە سەبارەت بە چۆنیەتیی

لەدایکبوونــی دونیــای نــوێ و چۆنیەتیــی تەفســیرکردنی ئــەو پرۆســەی تازەبوونەوەیــە. عەلمانیــەت وەک ئایدیۆلۆژیــا ســەر بــە کایــەی سیاســییە و بەعەلەمانیبوونــی دونیــا وەک تیــز و تیورەیەکــی فیکریــی ســەر بــە کایــەی زانســتە کۆمەڵایەتییەکانــە، بەتایبەتــی زانســتی سۆســیۆلۆژیا و فەلســەفەی سیاســی.

تیزەی بەعەلمانیبوونــی دونیــا بــاس لــە پرۆســە جیاوازەکان و لــە چۆنیەتیــی لەدایکبوونــی دونیــای مۆدێــرن دەکات، تازەبوونەوە و مۆدێرنیزەکردنێــک کــە لــە ســەردەمی شۆڕشــی پیشەســازییەوە دەســت پــێ دەکات و بەنــاو شۆڕشــی فەرەنســیدا تێدەپەڕێــت و لــە ســەدەی نۆزدەهەمــدا پایــە ســەرەکییەکانی دەچەســپێت. لــەم تێــزەدا ئــەم ســەردەمە تازەیــە ســەردەمی لەدایکبوونــی زیــاد لــە شــتێکە، لەوانــە لەدایکبوونــی زانســت و تەکنۆلۆژیــای مۆدێــرن و چەنــدان پرۆســەی جیــاوازی بەعەلمانیبوونــی دونیــا، کــە بەســەریەکەوە وا دەکــەن پێگــەی دیــن لــەو دونیــا تازەیــەدا تــەواو لاواز و پەراوێــز بکەوێــت، یاخــود کۆتایــی پــێ بێــت و نەمێنێــت. هەندێــک نووســەری بــواری ئەنترۆپۆلۆژیــای دیــن، ئــەم تێــزە بــە یەکێــک لــە "حیکایەتــە گــەورەکان"ی نــاو زانســتە کۆمەڵایەتییــەکان نــاو دەبــەن.[1]

کرۆکــی تێــزی بەعەلمانیبوونــی دونیــا ئەوەیــە کــە پرۆســەی تازەبوونــەوەی ژیانــی سیاســی و کۆمەڵایەتــی و دەزگایــی و فەرهەنگیــی کۆمەڵگاکان لــە ســەردەمی شۆڕشــی پیشەســازییەوە وای کــردوە و بەردەوامیــش وا دەکات ڕۆڵــی دیــن لــە گشــتیتیی

---

١ - بڕوانە:
Van der Veer, Peter (1995). The secular production of religion. Etnofoor, Jaarg. 8, Nr. 2, Religion and Modernity, p. 5.

ژیانی کۆمەڵایەتیدا کەمتر ببێتەوە و تا دونیاش زیاتر تازە ببێتەوە ڕۆڵی دین لەناویدا زیاتر لاواز ببێت. لەم ڕوانینەدا گریمانی بوونی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و پتەو دەکرێت لەنێوان مۆدێرنە و لاوازبوونی دیندا. بە مانایەکی دیکە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا وەک بەشێکی ناوەکیی -ئەگەر نەڵێم وەک لۆژیکی ناوەکی- پرۆسەی تازەبوونەوە دەبینرێت و مامەڵە دەکرێت. هەندێک جاریش دەکرێت دەستەواژەی "بەعەلەلمانیبوونی دونیا" بە "پرۆژەی تازەبوونەوەی دونیا" یەکسان بکرێت. زۆربەی تیورە سۆسیۆلۆژییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و کۆمەڵێک لەو تیورانەش کە لەمڕۆدا باس لە پرۆسەی تازەبوونەوە و بەمۆدێرنبوونی کۆمەڵگاکان دەکەن، پێ لەسەر کەمبوونەوەی ڕۆڵی دین لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، دادەگرن. بەکورتی، گریمانە سەرەکییەکەی ئەم تێزە ئەوەیە: لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکانی بەر لە دونیای مۆدێرندا دین ڕۆڵێکی سێنترالی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بینیوە، لە دونیای مۆدێرندا دین ئەو ڕۆڵە سێنتراڵییە لەدەست ئەدات و تەواو لاواز و پەراوێزیش دەبێت.[1] لەم ڕووەوە بۆچوونەکانی مارکس و دۆرکهایم و فرۆید و ماکس ڤێبەر نموونەی بەرچاوی ئەم تێڕوانینەن بۆ پرۆسەی تازەبوونەوەی دونیا. بە بۆچوونی ئەم نووسەرانە دین لە سەدەی نۆزدەهەمەوە تا دێت پێگە و شوێن و دەسەڵات و هێزە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقییەکەی لاواز دەبێت و نرخێکی ئەوتۆی لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگاکان و تەنانەت لە ژیانی تاکەکەسەکانیشدا، نامێنێت.

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥-٦

تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا خۆی وەکو تێزەیەکی بێلایەن و بابەتی نیشان ئەدات، وەک چەمکێکی وەسفی نماییش دەکرێت، کاری ئەوە نییە پێمان بڵێت پێویستە دین چ ڕۆڵ و شوێنێکی لە کۆمەڵگادا هەبێت، کاری ئەوەیە وەسفێکی زانستییانەی ئەو دونیایە بکات کە مۆدێرنە دروستی دەکات، دونیایەک کە بەپێی تێزی بەعەلمانیبوونی دونیا ڕۆڵ و کاریگەریی دین تیایدا لەسەر کۆمەڵگا کەم دەبێتەوە و ئەم کەمبوونەوەیەش مەسەلەیەکی حەتمییە. ئەم دۆخە کە مۆدێرنە دروستی دەکات کۆمەڵێک هۆکاری لەپشتە، لەوانە دروستبوونی هێزی کۆمەلایەتیی تازە، گەورەبوونی شار، لەدایکبوونی بیرۆکراسیەتی نوێ، پرۆسەی بەپیشەسازیبوونی ئابووری، لەدایکبوون و بەهێزبوونی زانستە سروشتی و ئینسانییەکان، بەهێزبوونی پرۆسەی عەقلانیەت لە فۆرمی بەعەقلانیبوونی دەسەلاتی سیاسی و کۆمەڵگا خۆشیدا، هاتنەکایەی دەوڵەتی نەتەوەی مۆدێرن و دروستبوونی سیستمی دیموکراسی. لە فیکری کۆمەڵناسیدا ئەم پرۆسە گەورەیەی لەدایکبوونی هێز و کایە و شێوازی بیرکردنەوە و ئیدارەدان و حوکمڕانییە نوێیە ناوی پرۆسەی "لەدایکبوونی جیاوازی"ی لێ نراوە، بە ئینگلیزییەکەی پرۆسەی دیفرینشیەیین Differentiation process. بەپێی ئەم تێزە ئەوەی لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا ڕوو دەدات پرۆسەی دروستبوونی هێز و کایە و چالاکی و مەعریفە و دەزگای نوێ و جیاوازە، کە نە ڕەوایەتییان لە دینەوە وەر دەگرن، نە ڕۆڵێکی دینییش لە کۆمەڵگادا دەبینن، نە بەپێی لۆژیک و بەها دینییەکانیش کار دەکەن.[١]

---

١ - بڕوانە:

هەریەکێکیش لەو کایە و چالاکی و هێز و عەقڵیەتانەش لۆژیکی تایبەت بە خۆیان هەیە و هەر یەکەشیان لەو لۆژیکە دینییە دوور دەکەونەوە کە بەر لە دروستبوونی ئەوان لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریدا ئامادە بووە. پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا بەم مانایە پرۆسەی لەدایکبوونی سەرجەمی ئەو کایە و چالاکی و شێوازە مەعریفی و زانستییە نوێیانەیە کە ئاکارێکی نادینییان هەیە و هەندێکیشیان لە دژایەتیکردن و بەگژاچوونەوەی دەسەڵات و لۆژیکی دینیدا، دروست بوون. وەک وتم، کۆمەڵناسە گەورە و گرنگەکانی وەک مارکس و دۆرکهایم و ڤیبەر، پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە دین لەگەڵ بەرەوپێشەوەچوونی مۆدێرنە و لەدایکبوونی جیاوازیی زیاتر و قووڵتردا، تەواو لاواز دەبێت، ڕەنگە بەرەو ئەوە بڕاوات کە نەمێنێت.

**خاڵی هاوبەش**

بێگومان خاڵێکی هاوبەش لە نێوان "عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا" و "عەلمانیەت وەک پرۆسە"دا هەیە، واتە هەم وەسفکردنی "بێلایەن"ی دونیا لەلایەن عەلمانیەتەوە وەک پرۆسە و هەم داواکارییەکانی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا لە خاڵێکدا بەیەک دەگەن، ئەویش خاڵی پێداگرتنە لەسەر کەمبوونەوەی کاریگەریی دین لەسەر دونیای مۆدێرن. ئەگەر عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا هەڵگری پرۆژەیەکی سیاسی بێت کە باس لە پێداویستی یاساغکردنی تێکەڵکردنی دین و ژیانی

---

Martin, David (1978). A General Theory of Secularization. Oxford: Basil Blackwell .

گشتی بە یەکتری دەکات، بۆ نموونە یاساغکردنی تێکەڵکردنی دین و سیاسەت و دین و میدیا و دین و سیستمی خوێندن بەیەکتری، هتد... ئەوا عەلمانیەت وەک پرۆسە، وەک شێوازێکی تایبەتی وەسفکردنی چۆنیەتیی لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن، ئەم خواستەی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا دەسەلمێنێت. چونکە عەلمانیەت وەک پرۆسە باس لەوە دەکات کە دین لە دونیای مۆدێرندا لە ڕووی واقیعییەوە ئەو ڕۆڵەی لەسەر ژیانی گشتیی کۆمەڵگا نامێنێت و سنووری کاریگەرییەکانی کەم دەبێتەوە. ئەمەش وەک ئەوە وایە جۆرێک لە ڕەوایەتی بەو داخوازییە ببەخشێت کە عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا داوای دەکات، داخوازیی ڕێگرتن لەوەی دین بە کایەکان و بوارە جیاوازەکانی ژیانی گشتی تێکەڵ بکرێت. وەک وتم، عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا داوای ئەوە دەکات دین بۆ ژیانی تایبەت بگەڕێتەوە و لەوێدا سنووردار بێت، هەرچی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیایە بە شێوەیەک وەسفی لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن دەکات، کە ئەم خواستە بسەلەمێنێت و پاسادانی بکات. ئەم خاڵی بەیەککەیشتنەیە کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا بەهێز دەکات و بۆ ئاستی پارادایمێکی باڵادەست بەرزی دەکاتەوە.

بەکورتی، ئەوەی سەرەوە باسکردنێکی خێرای مانای عەلمانیەت بوو وەک ئایدیۆلۆژیا و وەک پرۆسە. بەڵام ئەم ڕوانینە بۆ عەلمانیەت و ئەو گریمانانەی کە لەسەری دروست بوون لە ساڵانی شەستی سەدەی بیستەمەوە دەکەونە بەر شەپۆلێکی گەورە لە ڕەخنەکردن و پیداچوونەوە. ئەگەرچی ئەم کتێبە باسکردنێکی درێژی ئەم کردەی پیاچوونەوە و

ڕەخنەکردنەیە، هەوڵ ئەدەم لە پەرەگرافی داهاتوودا چەند دەرگایەکی سەرەتایی لەسەر ئەم باسە بکەمەوە.

**ڕەخنە لە عەلمانیەت**

لە شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە، نەک تەنها عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا لەژێر خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی هەمەلایەندایە و ڕووە نادیموکراسییەکانی وەک پرۆژەیەکی ئایدیۆلۆژی، لەلایەن زیاد لە کۆمەڵناس و سیاسەتناس و فەیلەسوفێکەوە کەوتوتە بەر ڕەخنەکردنێکی زۆر، بەڵکو عەلمانیەت خۆشی وەک جۆرێکی تایبەت لە وەسفکردنی دونیا، وەک پێداگرتن لەسەر پرۆسەی بەعەلمانیبوونی بەردەوامی دونیا و کەمبوونەوەی ڕۆڵی دین لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، چەندیش پرۆسەی تازەبووەنەوە بەرەوپێشەوە بچێت، ئەوەندە دین لاوازتر و بێرۆڵتر دەبێت، تا ئەو شوێنەی دین بوونی نەمێنێت، کەوتوتە بەر ڕەخنەیەکی هەمەلایەن و فراوانەوە. دیدە باڵادەستەکەی پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا تا کۆتایی ساڵانی شەست لای زۆر کۆمەڵناس و سیاسەتناس و فەیلەسوفی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەوە باڵادەست بووە، بەڵام ئەمڕۆ بەدەگمەن نەبێت کەسێکی دیموکراس لە دونیادا نادۆزینەوە داوای ئەوە بکات دین ڕۆڵی لە ژیانی گشتیدا نەمێنێت. تەنانەت ئەو نووسەر و کۆمەڵناس و فەیلەسوفانەش کە ئەم بۆچوونەیان هەبوو، ئەمڕۆ ئەم بۆچوونەیان نەماوە، لەوانەش بۆ نموونە یورگن هابرماز، کە من دواتر بەدرێژی دێمە سەر باسکردنی بۆچوونەکانی لەسەر ڕۆڵی دین لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا.

کۆمەڵناسێکی وەک پیتەر بێرگەریش، کە لە شەستەکاندا یەکێک بووە لە داکۆکیکەرەکانی تیزەی بەعەلمانیبوونی دونیا، ئێستا باس لە پێداویستیی گۆڕانی ئەم پارادیمە دەکات و پێی وایە پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا ناتوانێت هیچی ئەوتۆمان لەسەر کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆکە و ڕۆڵ و پێگەی دین لەو کۆمەڵگایانەدا پێ بڵێت.[1] لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا بەدرێژی باسی ئەو ڕەخنانە دەکەم کە لە پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا گیراون.

**چۆن لە دین خۆی بڕوانین؟**

بێگومان زیاد لە شێوازێک لە ڕوانین بۆ دین و بۆ شێوازی مامەڵەکردن و خوێندەوەی دین هەیە. لێرەدا لەسەر ئەو هێڵی بیرکردنەوەیەی کە فەیلەسوفی هۆڵەندی مایکل لێزنبێرگ لە کتێبی "عەقڵ و دین"دا پێشنیاری دەکات، سێ شێواز لە ڕوانین بۆ دین لەیەکدی جیا دەکاتەوە کە بریتین لە ڕوانین بۆ دین وەک "باوەڕ و عەقیدە"، وەک "بەها و ئەزموونی ناوەکیی مرۆڤ" و سێهەمیش و وەک "کردە و پراکتیک"ی مێژوویی.[2]

یەکەم: بینین و مامەڵەکردنی دین وەک باوەڕ و عەقیدە. ڕوانین بۆ دین وەک جۆرێک لە باوەڕ و عەقیدە ڕوانینێکی

---

١ - بڕوانە:

: Berger, Peter (2014). The many altars of modernity. Toward a paradigm for religion in a pluralist age. De Gruyter Mouton.

2 -Leezenberg, Michiel (2007). Rede en religie: een verkenning. Amsterdam, Van Gennep. pp. 13-18.

سادە و ئاسانە. دین لێرەدا وەک هەڵگری دیدێک بۆ چۆنیەتیی ڕێکخستنی گەردوون و بوون و دونیا وێنا دەکرێت، کە دەرەنجامی ئەخلاقیی گەورەیان لێ دەکەوێتەوە. ئیتر گرنگ نییە ئەو دینە خودای تێدا بێت یان تیایدا نەبێت، یاخود زیاد لە خودایەکی تێدا بێت. دین لێرەدا باس لە شوێنی ئینسان دەکات لەناو گەردووندا، لەناو گشتێکی گەورەتردا لە خودی ئینسان خۆی، هەروەها ئەوەش نیشان ئەدات ئەم ئینسانە چۆن بەرانبەر بەو گشتە گەورەیە بجوولێتەوە، چۆن لەگەڵ ئینسانەکانی تردا هاوسایە بێت، چۆن مامەڵەی مردوەکان و ئەوانەش بکات کە هێشتا لەدایک نەبوون. بەکورتی، دین لێرەدا هێما بۆ بوونی "شتێک" دەکات گەورەتر و بەتواناتر لە ئینسان، شتێک لە ئاستێکی ئەنتۆلۆژی و موفاریقدا ئامادەیە، شتێک کە موقەدەسە. لەم ڕوانینەدا دین وەک کۆمەڵێک باوەڕ و عەقیدە دەربارەی دونیا و گەردوون و بوون دەبینرێت و مامەڵە دەکرێت، دەربارەی چۆنیەتیی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی گەردوون و ژیان. ئەوەشی ئەم بوونە ڕێک دەخات و ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبات، لە دینە جیاوازەکاندا ناوی جیاوازی هەیە. لە هەندێک دیندا ئەوەی ئەم کارە دەکات ناوی خودایە، خودایەکی تاک و تەنها، لە هەندێک دینی تردا زیاد لە خودایەکن پێکەوە، لە کاتێکدا لە هەندێ دینی تردا باس لە بوونی هێزێکی نادیار و ناونەنراو دەکرێت کە ئەم کارە جێبەجێ دەکات. لەم ڕوانینەدا بۆ دین خودا یان خوداکان یان هێزە نادیارەکان گەیەنەری پەیامێکی تایبەت و نیشاندەری شێوازێکی دیاریکراوی ئەخلاقن، داوا لە مرۆڤەکان دەکەن

بەپێی پێدراوەکانی ئەو پەیام و ئەخلاقیاتە بژین و دونیا و پەیوەندییەکانیان لەژێر سایەی ئەو پەیام و ئەخلاقیاتەدا ڕێک بخەن...[1] لەم تێڕوانینەدا زۆر جار دین "جەوهەر"ێک وەر دەگرێت کە نەگۆڕە، هەڵگری کۆمەڵێک یاسا و ڕێسا و داواکاریی ئەخلاقییە کە بۆ هەموو ئینسانێک و بۆ هەموو سەردەمێک دەخوات. گرنگترین پرسیارێک لەم تێگەیشتنەدا بۆ دین بکرێت ئەمەیە: چۆن پەیوەندیی نێوان ئەو موقەدەسە دینییە گەردوونییە نەگۆڕە و ژیانی سەرزەویی ئینسانەکان ڕێک بخرێت؟ یاخود چۆن پەیوەندیی نێوان خودا و مرۆڤ ڕێک بخرێت؟[2]

دووهەم: وێناکردنی دین وەک کۆمەڵێک بەها و ئەزموونێکی ناوەکیی ئینسان لەم ڕوانینەدا بۆ دین کەمتر پێ لەسەر بوونی خودا یان هێز و یاسای گەردوونی و هاوشێوە دادەگیرێت، کە گوایە لە ئاسمانەوە بۆ ئینسان دابەزیوە، بەڵکو زیاتر پێ لەسەر نرخ و بەها دینییەکان بۆ ئەم یان ئەو تاکەکەس و پێ لەسەر ئەزموونی تایبەت و کەسایەتیی باوەڕداران دادەگیرێت. دین لێرەدا کەمتر سەرقاڵی موناقەشە و بەرخوردی عەقڵی و سەلماندن و پاسادانە و زیاتر خەریکی گرنگیدانە بە ئەزموونی ناوەکیی ئینسانی باوەڕدار، ئەزموونێک زۆر جار زەحمەتە تەنانەت ناوی بۆ بدۆزرێتەوە و یاخود هەر لە بنەڕەتەوە زمانێکی هەبێت بتوانێت خۆی لە ڕێگایەوە بەرجەستە بکات. ئەوەی لێرەدا گرنگە بیزانین ئەوەیە کە دین لەم ڕوانینەدا بە زمانی لۆژیک و عەقڵ و

---

١ -هەمان سەرچاوی پێشوو ل ١٥

٢ -هەمان سەرچاوی پێشوو ل ١٥

ئەزموونی کردەگیی ئاشکرا و ناسراو باس لە خۆی ناکات، بەڵکو وەک جۆرێک لە پەیوەندی بە نادیارەوە خۆی بەیان دەکات کە زۆر جار وەک پەیوەندییەکی تایبەت و شەخسی دەر دەکەوێت. لەم دیدەدا ئینسان دین لە ناوەوەی خۆیدا دەژی، دین هێندەی هێزێکە بۆ بەخشینی مانا و دەلالەت بە ژیان، ئەوەندەی لە پەیوەندییەکی ماناداردایە بە ڕووداوە گرنگەکانی ژیانەوە، وەک ڕووداوی لەدایکبوون و پیربوون و نەخۆشکەوتن و مردن و ڕووداوە سەرەکی و گرنگەکانی تری ناو ژیانەوە، ئەوەندە پەیوەندیی بە شێوازی ڕێکخستنی ژیان خۆیەوە نییە، ئەوەندە پەیوەندیی بە کۆمەڵێک یاسا و داواکارییەوە نییە کە ببنە چوارچێوەی سەرەکیی هەڵسوکەوت و ڕێکخستنی ژیانی هەموو ئینسانەکان.[1] دین لێرەدا بەر لە هەموو شتێک هێما بۆ ئەزموونێکی ڕۆحانی دەکات.

سێهەم: وێناکردنی دین وەک پراکتیک و هەڵسوکەوت.

لەم ڕوانینەدا پرسیاری ڕاستەقینە دەربارەی دین ئەوە نییە ئایا خەڵک چ باوڕێکیان هەیە؟ هەڵگری کام جۆر لە عەقیدەن؟ چۆن دین لێک ئەدەنەوە؟ هەروەها ئەوەش نییە ئایا کەسەکان دین وەک ئەزموونێکی تایبەت و تاکەکەسی و ڕۆحانیی دەبینن یان وەک ئەزموونێکی کۆیی و دەستەجەمعی وێنای دەکەن؟ ئەوەی لێرەدا کەمتر گرنگە ناوەڕۆکی دین و ناوەڕۆکی ئەو باوەڕانەیە کە دینداران لە ساتێکدا هەڵیان گرتوە. بێگومان ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەو مەسەلانە گرنگ نین و پێویستیان بە لێکۆڵینەوە نییە، ئەو مەسەلانە

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٥-١٦

گرنگن و گرنگیی خۆشیان لەدەست نادەن، بەڵام لەمانە گرنگتر ئەوەیە بزانین ئایا ئیمانداران بە ناوی دینەوە چ کارێک دەکەن؟ چ جۆرە کردە و پراکتیکێک ئەنجام ئەدەن؟ بەکورتیەکەی، ئەمانە چۆن دەجووڵێنەوە و دەبنە چ جۆرە بکەرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بە ناوی دینەکەیانەوە؟

ئەوەی لەم ڕوانینەدا بە پلەی یەکەم گرنگە، خودی باوەڕەکان نییە، بەڵکو ئەو شتانەیە کە باوەڕداران بە ناوی ئەو باوەڕانەوە ئەنجامی ئەدەن. ناوەرۆکی عەقیدە و باوەڕەکان نییە، بەڵکو ئەو ئاکتە مێژووییانەیە کە بە ناوی ئەو عەقیدانەوە ئەنجام ئەدرێن. لەمەشدا تەنها پراکتیکە دینییەکانی وەکو نوێژکردن و ڕۆژوگرتن و خوێندنەوە و لەبەرکردنی تێکستە دینییەکان گرنگ نین، بەڵکو ئەو پراکتیکە کۆمەڵایەتی و سیاسییانەی تر گرنگن کە کەسانی دیندار بە ناوی دینەکەیانەوە ئەنجامی ئەدەن، لەوانە؛ بۆ نموونە کردەی هاریکاریکردنی خەڵکانی تر، یان تاوانبار و بەکافرکردنی کەسانی تر، سیاسەتکردن بە ناوی دینەوە، یان ڕێگەگرتن لە سیاسەت و حەرامکردنی بە ناوی هەمان دینەوە، هتد... بەکورتی، ئەوەی لەم ڕوانینەدا بۆ دین گرنگە، مەسەلەی دینە وەک پراکتیک، وەک کردار و جووڵە و هەڵسوکەوتی مێژووی و کۆمەڵایەتی. لەم ڕوانینەدا ئەوەی لە دیندا گرنگە گەڕان نییە بەدوای مانا و فیکر و لێکدانەوەکاندا، گرنگ نییە فلان یان فیسار تێکستی دینی، ئەم یان ئەو ئایەت چ مانایەکی هەیە، یان نیەتی، یان زیاد لە مانایەکی هەیە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە خەڵک بە ناوی ئەو تێکست و ئایەتانەوە، بە ناوی ئەو پەرەگرافە دینییانەوە، بە ناوی ئەم یان ئەو قسە و

گوفتاری کەسە دینییەکانەوە، چی دەکەن و چی ئەنجام ئەدەن و چۆن دەجوولێن. چ مێژوویەک بەرهەم دەهێنن و چ کۆمەڵگایەک دروست دەکەن و چ دەزگا و چوارچێوەیەک بۆ ژیانی پێکەوەییان دروست دکەن. بەکورتیەکەی ئەوەی لێرەدا گرنگە ڕوانینە بۆ دین وەک پراکتیک، نەک وەک فیکر، یان بیرۆکە. پراکتیکی مرۆڤە باوەڕدارەکانیش بە ناوی دینەوە هەمەجۆر و جیاواز و پلورال و ناکۆکە.

ئەوەشی خەڵک بە ناوی دینەوە دەیکەن دەشێت شتگەلێکی ئاشکرا و گشتی بێت، بەڵام دەشکرێت تایبەت و شاراوەش بێت، دەکرێت کردە و هەڵسوکەوتێکی باش و بەسوود بێت، بەڵام دەکرێت خراپ و بریندارکەر و فشارهێن بێت، دەشێت شتێک بێت پێشەکەوتنخواز و کراوە، بەڵام دەشێت کۆنەپارێز و داخراو بێت، دەشێت کردەیەکی هێمن و لەسەرخۆ و تەنانەت "ڕۆحانیی" بێت لە فۆرمی سەما و زیکر و نوێژکردن و شیعر و گۆرانیگوتندا، بەڵام دەشکرێت هێجگار خوێناوی و توندوتیژ بێت لە فۆرمی سەربڕینی ئاژەڵدا وەک قوربانی، تا بە کوشتن و سەربڕینی ئینسان دەگات.[١] خاڵێک لە پراکتیک و کردەی دینیدا دەبێت ئاشکرا بێت، ئەوەیە کە کردەیەکی بە مەبەست و غایەتگەرایە، بە هیچ شێوەیەک کردە و جووڵە و هەڵسوکەوتێکی غەریزی نییە. لە ڕاستیدا دین لەم ڕوانینەدا پەیوەندیی بە غەریزەوە نییە و دینداری بەشێک نییە لە غەریزەیەکی ئینسانی، بەڵکو هەردووکیان، هەم دین و هەم دینداری، کردە و جووڵەیەکی مانادار و غایەتگەرن و هەمیشە مەبەستێک یان چەند مەبەستێکیان لەپشتەوەیە، لەوانەش مەبەستی باش و

---

١ - بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨١

پۆزەتیڤی وەک بەدەمەوەچوون و هاریکاریکردنی مرۆڤەکانی تر، یان مەبەست و غایەتی خراپ، لە فۆرمی کۆکردنەوە و کەڵەکەکردنێکی نایاسای و نائەخلاقیی دەسەڵات و سەرمایە.

دین هاوکات شێوازێکی تایبەتی ڕێکخستنی دونیا و ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکانیشە لەگەڵ یەک و لەگەڵ نادیار و نائامادە و موفاریقدا. ئەوەی لە خوێندنەوەی کردە دینییەکاندا گرنگە بینین و لێکدانەوەی ئەو کردانە و تێگەیشتنە لە ماناکان و مەبەستەکانیان، لەوەش گرنگتر بینینی ئەم کردە دینییانەیە، بۆ نموونە لەپاڵ تێزەکانی میشێل فوکۆدا، وەک بەشێک لە پراکتیکی دەسەڵات، وەک دیوێک لە دیوەکان و ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی پەیوەندییەکانی دەسەڵات.[1]

ئەم پێداگرتنە لەسەر ڕووە کردەی و پراکتیکییەکانی دین بەرەو ئەوەمان ئەبات دین وەک دیاردەیەکی ئاڵۆز ببینین و بەئاسانی و بە شێوەیەکی حازربەدەست، واتە دوای خوێندنەوەی چەند کتێب و تێکستێکی دینی، وا نەزانین دین چییە و مرۆڤی دیندار چۆن دەجووڵێتەوە و چۆن لەناو دونیای خۆیدا چالاک دەبێت و هەڵسوکەوت دەکات. هاوکات بینینی دین وەک کردە وامان لێ دەکات مانایەک و پێناسێکی نەگۆڕ و هەمیشەیی بە دین نەبەخشین، کە پێمان وا بێت ئەو مانا و پێناسە جەوهەری دین نیشان ئەدات. بینینیی دین وەک پراکتیک وا دەکات پرسیاری سەرەکیمان لەبەردەم کردە ئینسانییەکاندا ئەوە بێت ئاخۆ کام کردە و پراکتیک دینە و کامیشیان دین نییە؟ وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارەش

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨١-٨٢

هەرگیز وەڵامێکی ئاسان نییە، چونکە بۆ نموونە سەردان لە گۆڕی سەربازی ون، یان ڕاوەستان لەبەردەم ئاڵای وڵاتدا، یان سوێندخواردن بە نیشتیمان، هەموویان کردەی لە دین نزیکن، بەڵام ئایا بەڕاستی ئەوانە کردەی دینین؟ هاوکات کردەی دینیی کردەیەک نییە خاوەنی جەوهەرێکی ئاشکرا و ناسراو و نەگۆڕ بێت، دەشێت چەندەها شتی ناکۆک بەیەکەوە بگرێتە خۆی، دەکرێت سەربڕینی مرۆڤێک وەک کردەیەکی دینی ببینرێت، بەڵام دەشێت وەک گەورەترین تاوان بەرانبەر بە مرۆڤ و بە خودا وێنا بکرێت. بۆیە ڕەنگە باشترین شتێک بکرێت کردەی دینیی پێ پێناسە بکەین ئەوە بێت کە بڵێین سەرجەمی ئەو کردانەیە کە بە ناوی دینەوە دەکرێن و ئەنجام ئەدرێن. ئەمەش مانای ئەوەیە کە مانا و قورسایی و دەلالەتەکانی کردەی دینی لەناو خودی کردەکە خۆیدا و لەناو تێکستە دینییەکانیشدا نییە، بەڵکو لەناو ئەو پەیوەندییانەدایە کە دروستی دەکەن لەگەڵ چەندان کردەی تر و لەناو ئەو ڕەوتە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ڕەمزییەدا کە تیایدا ئامادەن، هەروەها لەناو ئەو پەیوەندییانەی دەسەڵاتیشدا کە وەک چوارچێوەیەکی سەرەکیی سەرجەمی کردەکان ئامادەیە. ئەم دیدە بۆ دین لەوە ڕزگارمان دەکات بە دین ماهیەت و مانایەکی جێگیر و نەگۆڕ و هەتاهەتایی ببەخشین، جەوهەرێکی بدەینێ و کە قسەمان لە دین کرد باس لەو جەوهەرە نەگۆڕە بکەین و لەگەڵ ئەو جەوهەرەدا بکەوینە بەرخورد و ململانێ و گفتوگۆوە. دیتنی دین وەک جەوهەرێکی نەگۆڕ سادەکردنەوەیەکی ترسناک و بێمانای دین و سەرجەمی ئەو کردانەیە کە مرۆڤ بە ناوی دینەوە

ئەنجامیان ئەدات.

لە دیدی وێناکردنی دیندا وەک پراکتیک، ماناکانی دین لەناو تێکست و حیکایەتە دینییەکانەوە نایەن، بەڵکو لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیانەدا دروست و بەرجەستە دەبن کە لەئارادان. واتە ئەو مانایانەی لە ساتەوەختێکدا بە دین دەدرێت و ئەو پراکتیکانەی کە ئەو مانایانە مەیسەریان دەکات و ڕەوایەتییان پێ ئەبەخشێت، هەموویان دیاردەی مێژوویی و کاتی و تێپەڕن و بە تێپەڕینی کات و تازەبوونەوە و گۆڕانی ئەو پراکتیکانە ماناکانی دین و مانای کردە دینییەکان خۆشیان گۆڕانیان بەسەردا دێت. بینینی دین وەک کردە و پراکتیک، ئەو سوودەی تریشی هەیە کە واز لە گەڕان بەدوای مانای ئەبەدی و نەگۆڕ و هەمیشەیی بۆ دین و بۆ دیاردە دینییەکان بهێنین، واز لەوە بهێنین جەوهەرێکی نەگۆڕ بە دین ببەخشین، لەباتیی ئەمانە لەناو ئەو ساتەوەختە مێژووییە تایبەتەدا بەدوای ماناکانی دیندا بگەڕێین، کە دین لەپاڵ نادین و دژەدین و شێوەکانی تری پراکتیک و کردەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیدا ئامادەیە. ئەوەی لەم دیدەدا گرنگە ئەوەیە کە ڕاوبۆچوون و دید و تێڕوانینیەکانی دین و نادین، دین و شێوەکانی تری مەعریفە، هەموویان وەک دیاردەی بگۆڕ و ناجێگیر و نارەها وێنا بکەین و هەموویان وا ببینین وەک ئەوەی دەکرێت بە شێوەی تر و بە ناوەڕۆکی ترەوە ئامادە بن جیاواز و تەنانەت ناکۆکیش بەوەی لە ئێستادا بە ناوی دینەوە هەیە و ئامادەیە. ئەم شێوازە لە تەماشاکردن و خوێندنەوە بۆ دین ئەگەر و هەوڵی گۆڕان و باشترکردنی مانا و پێناس و

قەناعەتە دینییەکان زیاد دەکات، نەک ئەوەی بە ناوی جۆرێک لە مانا و پێناس و جەوهەری نەگۆڕ و گەردوونییەوە، کڕ بکەوین بەسەر هەندێک مانا و لێکدانەوەدا تا کۆتایی مێژوو.

ڕەهەندێکی گرنگی تری بینینی دین وەک پراکتیک و کردەی کۆمەڵایەتی، لەوەدایە کە بەردەوام دەکرێت پرسیار لەو ڕەوایەتی و شەرعیەتە بکەین کە بەو کردە و پراکتیکانە دەبەخشرێن. ئەو ڕەوایەتییانە کە سەرەتا خۆیان وەک بەڵگەنەویست و جێبەجێکردنی ئەمری ئیلاهی و ئاسمانی نیشان ئەدەن، لە بەستنەوەیاندا بە کردە و پراکتیکە کۆمەڵایەتییەکانەوە، نەک تەنها ڕووە مێژووییەکانیان دەر دەکەوێت، بەڵکو ئەوەشمان بۆ ئاشکرا دەبێت ئەو ڕەوایەتیبەخشینە چۆن لە گەمە و ستراتیژەکانی دەسەڵاتەوە ئالاوە. بۆ نموونە زانا دینییەکانی سەدەی هەژدەهەم کە چاپخانەیان بینی هاتە ناو ئیمپراتوریەتی عوسمانییەوە، سەرەتا دژی وەستان و دواتر ناچار بوون قبووڵی بکەن، بە مەرجی ئەوەی نە قورئان و نە کتێبی دینییان پێ چاپ نەکرێت، بەڵام ئەمڕۆ بە هەر هێزێکی ئیسلامی و بە هەر موسڵمانێکی سادەش بڵێیت کە نابێت قورئان و کتێبە دینییەکانی تر چاپ بکرێن، ڕەنگە فەتوای کافربوون و کوشتنت دەر بکەن. گۆڕانی پارکتیکە دینییەکان لێرەدا زۆر شتی زیاترمان لەسەر تێگەیشتنی کەسەکان بۆ دین پێ دەڵێن، تا ئەوەی بچین تێکستە دینییە کۆنەکان بخوێنینەوە و لەوانەوە مانای دین هەڵبهێنجین.

بە شێوەیەکی گشتی بینینی دین و مەعریفە وەک جۆرێک لە پراکتیک و وەک دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی

دەسەڵات هاریکارمان دەبێت هەم بکەرە دینییەکان لە پێگە مێژووییەکانی خۆیاندا ببینین و بخوێنینەوە، هەم لەو شێوازانە لە جەوهەرگەرایی و گشتگیری ڕزگارمان بێت، کە دەیانەوێت بە دین و مەسەلەی دینداری جەوهەرێکی نەگۆڕ و بانمێژوویی ببەخشن. بینینی دین وەک پراکتیک نیشانی ئەدات کە دین دیاردەیەکی جێگیر و نەگۆڕ نییە، جەوهەرێکی نییە لە هەموو کۆمەڵگا و سەردەم و ژینگە و پێگە کۆمەلایەتی و ناوەندە سیاسی و فەرهەنگییەکاندا هەمان مانا و هەمان ڕۆڵی هەبێت، بەڵکو دین بەتوندی بە پراکتیک و هەڵسوکەوتی مرۆڤەکانەوە گرێ دراوە کە هەم بە شێوەیەکی بەرفروان بە شوێن و کاتی مێژووییەوە گرێ دراون و هەم شتگەلێکی پڕ جووڵە و گۆڕان و هەڵبەز و دابەزی گەورەن. لەم دیدەدا دین ئەو شتانە نییە کە لە کتێبە کۆنەکاندا ئامادەیە، بەڵکو ئەو پراکتیکانەیە کە مرۆڤ لە ئێستا و لەمڕۆدا بەناوی دینەوە ئەنجامیان ئەدات. لە پراکتیکی هێمن و ناسک و ڕۆحانییەوە، بۆ پراکتیکی توندوتیژ و پڕ هەڕەشە و هێرش و پەلامار و کوشتن و بڕین.

لە پەیوەندیدا بە مەسەلەی پەیوەندیی نێوان دین و سیاسەت و دین و عەلمانیەتەوە، ئەوەی گرنگ و شوێنی سەرنجدان و ئاگاداربوونە ئاکار و هەڵسوکەوت و پراکتیکی سیاسیی هێزە دینییەکانە، جووڵەیانە لەناو کایەی سیاسیدا، ئامادەبوون و نەبوونەکانیانە بۆ چوونەناو بەرەی سیاسیی جیاوازەوە، توانای کاری پێکەوەیی و دانوسانە، نەک ئەوەی ئایا سەر بە چ ڕێبازێکی تیۆلۆجین و چ مەزهەبێکی دینییان هەیە و بیروباوەڕە دینییەکانیان چییە؟ چونکە هەمیشە

بۆشـایی و مەسـافەیەکی گـەورە هەیـە لەنێوان پراکتیـک و باوەڕدا. دەشـێت هێزێکی دینیی دژ بە گەندەڵی و بەفیڕۆدانی سـامانی گشـتی بێـت، یـان دژ بـە تەوریسـی سیاسـی و پەلاماردانـی نەیـارە سیاسـییەکان بێت و هەمـوو ئەمانـەش بـە نـاوی کۆمەڵێـک پرنسـیپ و خواسـتی دینییـەوە بـکات. ئـەوەی لێرەدا گرنگە پراکتیک و جووڵـەی سیاسـیی ئـەو هێزەیـە نـەک ئەوەی چۆن و بە چ شـێوەیەک و بە کام زمـان ڕەوایەتی بەو پراکتیکانـە ئـەدات و بەهانەیـان بـۆ دەهێنێتـەوە.

**کێشەی ئیسلام و ئیسلامییەکان**

لەپـاڵ ئـەو دیـد و ڕوانینـەدا کـە دیـن بـە پلـەی یەکـەم وەک پراکتیـک دەبینێت، دەکرێت بڵێیـن بەشـێکی گـەورەی کێشـەی ئەمڕۆکـەی دینـداری لـە دونیـای ئێمـەدا، کێشـەی ئـەو هێـز و لایـەن و کـەس و گروپانەیـە کـە بـە نـاوی دینـەوە ئامـادەن و بە ناوی دینەوە هەڵسوکەت و کردەی سیاسـی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگـی و دینـی نیشـان ئـەدەن. کێشـەکە کەمتر کێشـەی بوونـی کۆمەڵێک تێکسـتی دینییـە، کـە سـالانێکی درێـژ بـەر لـە ئێسـتا نووسـراون و هەڵگێـراون، بەڵکـو کێشـەی ئـەو هێزانەیـە کـە بـە نـاوی ئـەو تێکسـتانەوە چەندەهـا کـردەی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و دینـی و فەرهەنگیـی جیـاواز و ناکـۆک و هەمەجۆرە نیشـان ئەدەن. یەکێک لەو هێز و کەس و لایەنانە، هێـزە ئیسـلامییەکانی دونیـای ئێمـەن، یـان ئـەو لایەنانـەن کـە ئیسـلام بەسیاسـی دەکـەن و وەک ئایدیۆلۆژیایەکـی سیاسـیی گشـتگیر و لـە فۆرمـی سیسـتمێکی تۆتـاڵ و داخراودا بەرهەمـی دەهێنـن و کاری پـێ دەکـەن، ئیسـلام وەک سیسـتمێک کـە گوایـە

پێرفێکت و بێکێشەیە و پێویستی بە هیچ شتێکیش نییە لە دەرەوەی خۆیدا و دەشتوانێت هەموو کێشەکانی دونیای ئێمەش چارەسەر بکات.

با ئەو خاڵەش جارێکی دیکە دووبارە بکەمەوە، کە منیش وەک زۆرێک لە مرۆڤەکانی تری کۆمەڵگای ئێمە و ناوچەکە لە دەسەڵاتی هێزە ئیسلامییەکان دەترسم، بەتایبەتی ترس لە دووبارەکردنەوەی ئەزموونگەلێکی وەک ئەزموونی ئێرانی و سعودی و سوودانی و ئەفغانی و داعش و ئەوانی تر. دوای ئەوانیش دووبارەکردنەوەی ئەزموونی ئەو هێزە ئیسلامییانەی تر کە نەیانتوانیوە حوکمڕان بن، بەڵام دەسەڵاتێکی گەورەیان لە "ڕووبەری گشتی" و "ژیانی کۆمەڵایەتی"ی کۆمەڵگاکانیدا هەبووە و هەیە، لە شێوەی دەسەڵاتی هێزە سەلەفییەکان لە میسر و مەغریب و تونس و کوەیت و شوێنەکانی تردا. هێزە ئیسلامییەکانی وەک ئەل قاعیدە و جەبهەی نوسرە و ئەحراری شام و حەماس و حیزبوڵڵای لوبنانی و شەبابی سۆماڵی و بۆکۆ حەرام و لەشکری موحەمەد و زۆرانێکی تر، شتێک نییە مرۆڤ تەمەننای سەرکەوتن و دەسەڵاتدارێتییان بۆ بکات و بیەوێت لەژێر دەستیاندا بژی. لە سەرجەمی ئەم ئەزموونانەدا فۆرمێک لە دین ئامادەیە، کە هەم سنووری ئازادییە سادە و بچووکەکانی ژیانی ڕۆژانەی تاکەکەس و گروپەکان تەواو بچووک و بەرتەسک دەکاتەوە، هەم لەسەر نەفیکردنێکی تەواوی فیکرەی یەکسانیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا کار دەکات، بەتایبەتی یەکسانیی نێر و مێ، دیندار و بێدین، ئیسلام و نائیسلام، هەم لەسەر وێناکردنی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەن ماف و خاوەن لانی کەم لە

سەربەخۆیی. لە هەموو ئەو دۆخانەدا فۆرمێک لە ئیسلام و لێکدانەوەیەک بۆ دین سەروەرە، کە ناکۆکە بە پێدراوە هەرە سادەکانی مافەکانی مرۆڤ و بە پێدراوە هەرە سادەکانی وێناکردنی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەن ماف و وێناکردنی ژیانیش وەک شتێک کە نەکرێت دەستی بۆ ببرێت و وێران بکرێت. ئەزموونی پارتی نەهزە لە تونس و سەرەتاکانی دەسەلاتداریێتیی پارتی ئاکەپە لە تورکیادا، مۆدێلێکی باشتر و گونجاوتریان نیشان دا، کە تیایدا فۆرمێک لە دەسەلات و دینداریییان نیشاندا جیاواز لە هێزە ئیسلامییە سیاسییەکانی تر لە ناوچەکەدا. بەلام هەم ئەزموونی نەهزە لە تونس و هەم ئەزموونی ئاکەپە لە تورکیادا، لەبەردەم تەحەدای گەورەدان و لە دۆخێکی تەواو ناجێگیردان، بەتایبەتی ئەزموونی ئاکەپە لە تورکیادا، کە لە سەردەستی ئەردۆگاندا بەتەواوی گۆڕاوە بۆ ئەزمونێکی دەسەلاتگەری تۆقێنەر و بە لۆژیکی هێزە دیکتاتۆر و ستمەگەرەکانی ناوچەکە حوکمڕانی دەکات.

بەدەر لە گشتگیریی ئەزموونی ئیسلامی سیاسی لە ناوچەکەدا، ئەزموونێک نییە مرۆڤ چاوەڕوانیی پۆزەتیڤ و بەرهەمهێنەری لێی هەبێت، ئەم هێزانە، گەرچی بەشێکیان گۆڕانێکی گەورە بەسەر پراکتیک و هەڵسوکەوتی سیاسییاندا هاتووە و لە ئێستادا زۆر کراوەترن تا لە سەرەتاکانی دروستبوونیان. کۆمەڵی ئیسلامی نموونەی هێزێکە کە لە بیست ساڵی ڕابردوودا گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتوە و لە هێزێکی "سەلفیی جیهادی"یەوە گۆڕاوە بۆ هێزێکی ئیسلامیی میانڕەو، یان هێزێکی وەک یەکگرتووی ئیسلامیی کە بووە

بە هێزی "ئیسلامیی هەڵبژاردن". بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ئەگەری نادیموکراسییبوون و ئەگەری ڕێزنەگرتنی پلورالیزم و ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکانی مرۆڤیان لەناو خۆیاندا هەڵگرتوە. بەڵام مرۆڤ بۆ ئەوەی نەکەوێتە ناو دوژمنایەتیکردنێکی بێبنەمای هێزە ئیسلامییەکانەوە، دەبێت ئەوە بڵێت کە ئەو ژینگەیەی ئەم هێزانە لەناویدا کار دەکەن ژینگەیەکی تەواو نادیموکراسی و ستەمگەرە. بە هەموو پێوەرێک لە هەرێمی کوردستاندا پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان زۆر زۆر لە ئیسلامییەکان نادیموکراسیتر و ستەمگەرترن. لۆژیکی مۆنۆپۆڵکردنی دەسەڵات و مۆنۆپۆڵکردنی کایەی سیاسی و ئابووری و میدیا و سوپا و کۆمەڵگای مەدەنی و پەیوەندییە ناوەکی و دەرەکییەکان و تا بە هونەر و وەرزشیش دەگات لای ئەوانەوە دێت و بەسەر هێزەکانی تردا دابەش دەبێت. بە مانایەکی تر، کورتهێنانی دیموکراسییانە لە دونیای ئێمەدا تۆمەتێک نییە بدرێتە پاڵ هێزە ئیسلامییەکان بەتەنها، بەڵکو واقیعێکی بەرجەستە و ئامادەیە و دروستکەرانی ئەو واقیعەش هێزە نادینییەکانی دونیای ئێمەن، کە پارتی و یەکێتی نموونە بەهێز و حوکمڕانەکانیانن.

بەکورتیەکەی لە بیست ساڵی ڕابردوودا من بەردەوام لە ترسێک دواوم لە پەیوەندیدا بە هێزەکانی ئیسلامی سیاسییەوە لە دونیای ئێمەدا. بەشێکی زۆری ئەو ڕەخنانەش کە من لە ئیسلامی سیاسی و لەو فۆرمانەی دینداری هەمبووە و هەمە، کە لەپاڵ ئیسلامی سیاسیدا دروست دەبێت، ئەم ترسە ئاراستەی کردوە. بەڵام ئەم ترسە ترس

لە "بەسیاسیبوونی دین" نییە، ترس نییە لەوەی دین ڕۆڵی سیاسی و ناسیاسی لە ژیانی گشتیدا بگێڕێ، ترس نییە لە ئامادەگیی دین لەناو ڕووبەری گشتیدا. بەڵکو ترسێکە لەو ڕۆڵەوە هاتووە کە ئیسلامی سیاسی لە کۆمەڵگای ئێمەدا دەیگێڕێت، ترسە لەو پراکتیکانەی کە بە ناوی دینەوە پیادەی دەکەن. مەسەلەکە هەر لە بنەڕەتەوە پەیوەندیی بە بوون یان نەبوونی ڕۆڵی دینەوە نییە لە ژیانی سیاسی و گشتیدا، بەڵکو پەیوەستە بە شێوازی ئەو ڕۆڵەوە کە دین دەیگێڕێت، پەیوەستە بە چۆنیەتیی هاتنەژوورەوەی دین بۆ ناو ژیانی گشتی و شێوازی بەرخورد و کارکردنی لەناویدا. ئەوەی گرنگە لێی ئاگادار بین و ڕەخنەی بکەین، ئەوە نییە دین نابێت لە ژیانی گشتیدا ئامادە بێت بە ژیانی سیاسییشەوە، بەڵکو ئەوەیە ئایا بە ناوی دینەوە لەناو ژیانی گشتیدا چی دەکرێت و ئەنجام ئەدرێت. چ تێگەیشتنێک بۆ دین لە پشتی کردە دینی و نادینییەکانەوە ئامادەیە، ئایا ئەو ئامادەگییەی دین لە خزمەتی پلورالیزمی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئەخلاقیدایە یان دژیانە.

هیچ یەکێک لەو ترسانەش بەوە ناڕەوێتەوە داوای ئەوە بکەین دین ڕۆڵی سیاسی و ناسیاسی لە ژیانی گشتیدا نەبێت و بگەڕێتەوە بۆ ناو ڕووبەری تایبەت و ژیانی شەخسیی تاکەکەسەکان، واتە داببڕێت لەوەی ناوی ژیانی گشتییە. چونکە وەک وتم ئەم داخوازییە لە دین مێژووی هیچ کۆمەڵگایەکی مۆدێرن لە هیچ شوێنێکی دونیادا نایسەلمێنێت. لە هەموو دونیادا یەک ئەزموون بوونی نییە تیایدا دین ڕۆڵی سیاسی و کۆمەلایەتیی نەبینێت و لەناو ژیانی گشتیدا ئامادە

نەبێت. بۆیە ئەو ترسەی من باسی دەکەم بەوە نارەوێتەوە بە ئیسلامییەکان بڵێین پارتە سیاسییەکانی خۆتان دابخەن و بڕۆنەوە ماڵەوە لێی دابنیشن، لە ڕاستیدا ئەم داواکارییە هەم خورافییە، هەم نادیموکراس و هەم تەواو ترسناکیشە. ترس لە ئیسلامی سیاسیی بەوە دەرەوێتەوە هەموو هێزەکان، بە ئیسلامی و نائیسلامییەوە، باوەڕیان بە دیموکراسیەت هەبێت، هەوڵی ڕاستەقینە بدەن ببن بە هێزی دیموکراس، ئامادە بن کار بۆ دروستبوونی سیستمێکی لیبرال و پلورال بکەن کە تیایدا دین و نادین و دژەدین بەقەد یەک ماف و بەقەد یەک بەرپرسیارێتییان هەبێت. وەک لە کۆتایی ئەم کتێبەدا باسی دەکەم ڕێزی ئەو "لانی کەمی ئەخلاقیات"ە بگرن کە سیستمێکی سیاسیی کراوە و پلورال و دیمکراس پێویستی پێیەتی. واتە مەسەلەی سەرەکی ئەوە نییە ئایا هێزێک عەلمانییە یان ئیسلامی، بەڵکو ئەوەیە ئایا ئەو هێزە لیبرال و دیموکراس و قبووڵکەری جیاوزییە، ئامادەیە ڕێزی پلورالیزمی سیاسی و دینی و ئەخلاقی لەسەر بنەمای ماف و بەرپرسیارێتیی یەکسان بگرێت یان نا. ئایا ئامادەیە ئازادیی ویژدان و ئازادیی بیرکردنەوە بسەلمێنێت یان نا. دەشێت هێزی عەلمانی هێزی نادیموکراس و ستەمگەر و سوڵتانی و فاشیستی و نیمچەفاشیستی بێت، وەک چۆن دەشێت هێزی ئیسلامییش هەڵگری هەمان ئەو ئاکارانە بێت. مەسەلەکە هەر لە بنەڕەتەوە پەیوەندییشی بە مەسەلەی عەلمانیبوون و ئیسلامیبوونەوە نییە، مەسەلەکە مەسەلەی دیموکراسیەت و پلورالیزم و مافی یەکسان و بەرپرسیارێتیی یەکسانە. لەم ئاستەشدا هەم هێزی دینی دەتوانێت هێزی

دیموکـراس و لیبـرال و ڕێزگـری پلورالیـزم بێـت، هـەم هێـزی عەلمانییـش. وەک فەیلەسـوفی ئەڵمانـی، ڤایـت بـادر دەڵێـت، مەسـەلەکە بەرگریکـردن لـە دیـن یـان لـە عەلمانیـەت نییـە، بەڵکو بەرگریکردنـە لـە دیموکراسـیەتی لیبرالانـە.[1] لـە بەشـی کۆتایـی ئـەم کتێبـەدا بەدرێـژی لەسـەر بۆچوونەکانـی ڤایـت بـادەر دەوەسـتم و وردەکارییەکانی نیشـان ئەدەم. ئیسـلام یـان هـەر دینێکی دیکە، هـاوکات هـەر دیـد و ئایدیۆلۆژیایەکـی عەلمانییش، بـۆ ئـەوەی بتوانێـت دیموکـراس و پلـورال و مافپـەروەر بێـت، دەبێـت لەنـاو ڕووبـەری گشـتیدا و لـە کاری سیاسـیدا بـە نـاوی موقەدەسـەوە قسـە نـەکات، نـە موقەدەسـی ئاسـمانی و نـە موقەدەسـی سـەرزەمینی. وەک ڤایـت بـادر دەڵێـت، هەمـووان لەنـاو ڕووبـەری گشـتیدا خاونـی "ڕا"ن لەپـاڵ چەندەهـا "ڕا"ی تردا، نـەک خاوەنـی موقەدەسـێک بـن هەمـووان ناچـار بکـەن کـە گوێدێـر و تەسـلیمی ببـن. ئـەم خاڵـەش لـە کۆتایـی ئـەم کتێبـەدا بەدرێـژی بـاس دەکرێـت.

ئەگـەر دینمـان وەک کۆمەڵێـک پراکتیـک و هەڵسـوکەوت بینـی، ئـەوەدەم، وەک وتمـان، شـتێک بـە نـاوی جەوهەرێکـی نەگۆڕەوە بۆ دین بوونـی نابێت. بـەم مانایـەش نـە لـە ئیسـلام و نـە لـە هیـچ دینێکـی تردا شتێک نییـە کـە نـاوی "جەوهەرێکی نادیموکراسـی"ی نەگـۆڕ، یـان "جەوهەرێکـی دۆسـت بـە دیموکراسـی"ی نەگۆڕ بێت. واتە شـتێکی ناوەکی و نەگۆڕ لەناو دیـن خۆیـدا بوونـی نییـە دژ بـە مۆدێرنـە یـان دیموکراسـیەت یان

---

1 -Bader, Veit (2010) Secularism or Democracy: associational governance of religiou diversity. Amsterdam, Amsterdam University Press.

مافەکان بێت، شێوازە جیاوازەکانی ئامادەگیی دین لە دونیادا، بە دینێکەوە کە دژایەتیی دیموکراسیەت بکات و بە دینێکیشەوە کە بەرگریی لە دیموکراسیەت بکات، پابەستی هەڵسوکەوت و بەرخورد و ڕوانین و خەونی بکەرە دینییەکانە. بە حوکمی ئەوەی بکەرە دینییەکانیش بکەری جیاوازن، لە "مەولانای ڕومی"یەوە بۆ سەر "بن لادن"، بۆیە فۆرمی جیاوازی دین و دینداریش نمایش و پەیڕەو دەکرێن. بڕیاردانی پێشوەختیش لەسەر ئەوەی دین و مۆدێرنە، دین و دیموکراسیەت، دین و پلورالیزم بەیەکەوە ناگونجێن، بڕیارێکی ناڕاست و هەڵەیە. هەم دیدێک بۆ دین گریمان دەکات کە کورتهێن و ناڕاست و نامێژووییە، هەم ڕوانینێکی تەواو دۆگمایی و سادەشی بۆ خودی مۆدێرنە خۆشی هەیە. یەکێک لە ئەرکەکانی ئەم کتێبە نیشاندان و سەلماندنی ئەو هەڵەیەیە.

ئەوەی کە بڕیار ئەدات ئەم ئامادەگییەی دین یان ئەوی تریان لەگەڵ دیموکراسییەتدا بگونجێت یان نەگونجێت، ئەو بکەرە کۆمەڵایەتییانەن کە بە ناوی دینەوە کردەی کۆمەڵایەتیی تایبەت و خواستی کۆمەڵایەتیی تایبەت بەرجەستە دەکەن، ئەو بکەرانەن کە خەریکی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لێکدانەوەی دینن لەناو ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی دیارکراو و لەناو جۆرێکی تایبەت لە پەیوەندییەکانی دەسەڵاتدا. ئەو لێکدانەوانەش لێکدانەوەیەک نین بۆ ئەوەی "جەوهەر"ی ڕاستەقینەی دین ئاشکرا بکەن، ئەگەرچی دەیانەوێت خۆیان بەو شێوەیە نیشان بدەن، بەڵکو لێکدانەوەیەکە لەپشتیەوە هەموو ستراتیژیەتەکانی دەسەڵات و هەموو تەماحە دینی و دونیایی و کۆمەڵایەتییەکان ئامادەیە. بۆیە بۆ ئەوەی بزانین

ئایا دین و دیموکراسیەت بەیەکەوە دەگونجێن، گەڕانەوە بۆ شیکردنەوە و لێکدانەوەی تێکستە دینییە کۆنەکان کارێکی ناڕاست و هەڵەیە، یان لە باشترین دۆخدا کارێکی هێجگار لاوەکی و پەراوێزییە. ئەوەی گرنگە سەرقاڵی بین لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەو هەلومەرجەیە کە وا لە بکەرێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراو دەکات مانا و تەفسیرێکی نادیموکراسی بە دین ببەخشێت و بەدوای هەیمەنەیەکی بەموقەدەسکراودا بگەڕێت.

خاڵێکی تر کە گرنگە لێرەدا لەسەری بوەستین ئەوەیە، کە هەنگاوی یەکەمی داڕشتنەوەی دین لەپاڵ دیدگایەکی دیموکراس و پلورالدا بە هەوڵی خوێندەواران و ڕۆشنبیران دەست پێ دەکات، بەڵام تەحەدای سەرەکی لە بوون یان نەبوونی ئەو جۆرە ڕۆشنبیر و لێکدانەوانەدا نییە، بەڵکو لە گواستنەوەی ئەو شێوازە دیموکراسییانەی لێکدانەوەی دینە بۆ ناو هۆشیاری گشتیی ئینسانەکانی ناو کۆمەڵگا. وەک ئاسف بەیات دەنووسێت: "گونجان یان نەگونجانی دین، بە دینی ئیسلامیشەوە، لەگەڵ دیموکراسیەتدا، مەسەلەی مەزەندەکارییەکی فەلسەفیی ڕووت نییە، بەڵکو مەسەلەی خەباتی سیاسییە. مەسەلەکە مەسەلەی بوونی تێکستە دینییەکان نییە ئەوەندەی مەسەلەی هاوکێشەکانی هێز و دەسەڵاتە لەنێوان ئەوانەدا کە دینێکی دیموکراتییان دەوێت لەگەڵ ئەوانەدا کە بەدوای لێکدانەوەیەکی دەسەڵاتگەرانەوەی دینەوەن".[1] بەکورتی پرسیاری سەرەکی ئەوە نییە ئایا

١ - بڕوانە:
Bayat , Asef (2007). Making Islam Democratic: Social Movements

دین و دیموکراسیەت بەیەکەوە دەگونجێن یان نا، بەڵکو ئەوەیە ئایا هێزەکانی ئیسلامی سیاسی چەندە بەدوای لێکدانەوەیەکی دیموکراسییانەی دینەوەن. ئەگەر بەدوای ئەو فۆرمەش لە لێکدانەوەی دیموکراسییانەی دینەوە نین، پرسیارەکە دیسانەوە ئەوە نییە ئایا دین دژی دیموکراسیەتە یان نا، بەڵکو ئەوەیە ئایا ئەو بکەرە دینییانە کێن و لەناو چ ژینگەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مەعریفیدا دەژین و کام فۆرم لە پەیوەندییەکانی دەسەڵات لەو ژینگەیەدا ئامادەیە.

بە بۆچوونی من کێشەی هێزە ئیسلامییەکان، چ لای ئێمە و چ لە زۆر شوێنی تری ناوچەکەدا، لەوەدایە کە دەیانەوێت ئینسانی ئێمە فێری دینداریيەکی بێقووڵایی و ڕووکەش و داخراو بکەن، فۆرمێک لە نارسیزمی دینییان تێدا بچێنن کە پێیان دەڵێت دینەکەی ئەوان هەم وەڵامی هەموو کێشەکانی دونیای پێیە و هەم لە هەموو دین و نادینەکانی تری جیهان باشترە، هەم لە هەمووانیش ڕاستتر و دادپەروەرترە و ئەوانیش وەک هەڵگرانی ئەو دینە لە هەموو مرۆڤێکی تر بەرزترن. ئەم فۆرمە لە نارسیزمی دینی تەنها هەستی خۆبەگەورەزانین بە دیندارەکان نابەخشێت، بەڵکو دوژمنایەتییەکی تەواوی پلورالیزمیش لە زۆربەی فۆرمەکانیدا لەناویاندا دەچێنێت. هاوکات جۆرێک لە هیرارکیەتیش پێشنیار دەکات کە تێیدا موسڵمان لە لووتکەی هەرەمەکەدایە و هەموو ئەوانی تر لە خوارەوەی ئەو هەرەمەدا. ئەمەش تەنها بازادان نییە بەسەر

---

and the Post-Islamist Turn. Stanford, Stanford University Press. 13.

بیرۆکەی هاوڵاتیبوونی یەکسان و خاوەن مافدا، بەڵکو ڕەچەتەیەکی ترسناکیشە بۆ دروستکردنی مرۆڤی پلە یەک و پلە دوو و پلە سێ و گەشەدان بە دیدێکی ڕاسیزمی لەسەر بنەمای دین. لەم لێکدانەوە تایبەتەی دین و لەم کارپێکردنەیدا، ئەوەی غائیبە؛ مرۆڤە وەک بوونەوەرێکی موجەرد، وەک بوونەوەرێکی پلوراڵ و خاوەن ماف و یەکسان، ئەوەشی ئامادەیە مرۆڤی پۆلینکراوە لەسەر بنەمای باوەدار و بێباوەڕ، موسڵمان و مەسیحی و جولەکە، مونافیق و مولحید و زەندیق و هتد... ئەم پۆلینکردنە دینییە ڕێ لە هەموو فۆرمێک لە فۆرمەکانی پلورالیزمێکی یەکسان و خاوەن ماف دەگرێت و ڕەچەتەیەکی بەردەوامە بۆ پشێوی و پێکدادانی کۆمەڵایەتی.

**ناوچەکە و پرۆسەی بەعەلمانیبوون**

زۆر جار کە باس لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەکرێت، باس لەوە دەکرێت کە ئەم ناوچەیە دین خواردویەتی و پرۆسەی بەعەلمانیبوون لەناویدا ڕووی نەداوە، یان گەر ڕوویشی دابێت ئەوا ئەو پرۆسەیە زۆر لاواز و پەراوێزی بووە. هەر لێرەدا هێما بۆ ئەوەش دەکرێت کە پرۆسەی بەعەلمانیبوون تەنها کۆمەڵگا ئەوروپییەکانی گرتۆتەوە و تەنها ئەوان توانیویانە ببن بە کۆمەڵگای عەلمانیی ڕاستەقینە. ئەم وێنە گشتییە لە چەندان ڕووەوە هەڵەیە و هەڵەیەکی زەق و گەورەشە، هیچ لێکۆڵینەوەیەکی ورد و زانستیی ئەم کۆمەڵگایانە ئەم وێنەیە بەو ڕەهاییە ناسەلمێنێت. ئەگەرچی من لێرەدا مەودای ئەوەم نییە ئەو وێنەیە بەوردی ڕاست بکەمەوە، بەڵام هێما

بۆ دوو کتێبی گرنگ دەکەم کە ئەم کارەیان بە شێوەیەکی زانستیانە ئەنجام داوە. یەکەمیان کتێبی "لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن"ە کە نووسەرەکەی مێژوونووسی بریتانی کریستۆفەر بەیلیە.[1] دووهەمیان کتێبی " العلمانیة من منظور مختلف"ە کە پرۆفیسۆری بواری سۆسیۆلۆژیای دین عزیز العظمة نووسیویەتی.[2] کتێبی یەکەمیان نیشانی ئەدات کە لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن پرۆسەیەکی ئاڵۆزیی جیهانی بووە، نەک بەتەنها ئەورووپایی، واتە دونیای مۆدێرن سەرەتا لە ئەورووپادا دروست نەبووە و دواتر بە هەموو دونیادا بڵاو بوویێتەوە، بەڵکو لە سەدەی هەژدەهەمەوە لە زیاد لە بەشێکی دونیادا پرۆسەی جیاوازیی تازەبوونە بەتەنها و لە پەیوەندییدا لەگەڵ یەکدا، لەدایک بووە. هاوکات ئەم کتێبە نیشانی ئەدات کە دین لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا بەهێز بووە، نەک لاواز بوویێت. ئیتر لە گەشەکردنی سەردانی شوێنە دینییەکانەوە بیگرە بەهۆی دروستکردنی شەمەندەفەر و هۆکارەکانی تری پەیوەندیکردنەوە، تا گەشەکردن لە ئەرشیتێکی دینی و دروستکردنی ژمارەیەکی هێجگار گەورەتر لە کەنیسە و مزگەوت و مەعبەد، تا بە بەهێزبوونی زیاتری پەیوەندیی نێوان ئیمپریالیزم و دین و خەباتی ڕزگاریخوازانە دژ بە ئیمپریالیزم و دین.[3]

---

1 -Bayly, C.A. (2003). The Birth of the Modern World, 1780-1914. Oxford, Blackwell.

٢ -عزیز العزمة (٢٠٠٨). العلمانیة من منزور مختلف: الدین و الدونیا من منزار تاریخی.

٣ - بڕوانە:

Bayly, C.A. (2003). The Birth of the Modern World,

کتێبی دووهەمیشیان نیشانی ئەدات کە لە سەرەتای سەدی نۆزدەهەمەوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە پرۆسەیەکی مێژوویی دوورودرێژی بەعەلمانیبوونەوە دەئاڵێت و چەندەها کایە و بوار و فۆرمی نوێی ڕێکخستن و فێربوون و حوکمڕانیکردن و زمان و ئەدەبیات دێنە کایەوە کە هەموویان، نادینین. پیاوانی دین لەم پرۆسە گەورەیەی تازەبوونەوەدا لە کۆتایی سەدەکەدا بەشێکی گرنگی دەسەڵاتەکانی خۆیان دەدۆڕێنن. بۆ نموونە هاتنەکایەی سیستمی نوێی خوێندن و فێربوون لە قۆناغی سەرەتاییەوە تا قۆناغی زانکۆ بکەری نوێ دروست دەکات لە فۆرمی مامۆستا و قوتابخانە و مەنهەجی خوێندنی نوێدا کە لە دەستی پیاوانی دین و دەزگا دینییەکان دەری دەهێنێت. هاوکات سیستمی داوەری و یاساکانیش بە هەمان شێوە بکەری نوێ دەهێنێتە کایەوە لە فۆرمی داوەر و پارێزەر و یاسای نوێدا کە دینی نین و پیاوانی دین ئەو دەسەڵاتی داوەریکرنە لەدەست ئەدەن کە جاران هەیانبووە. ئابووریی ناوچەکەش تازە دەبێتەوە و هەم چینێکی کرێکاری نوێ و هەم چینێکی ناوەڕاست و هەم بۆرژوازییەکی تایبەت لەدایک دەبێت، کە زۆربەیان پارت و ڕێکخراو و ئەدەبیاتی تایبەت بە خۆیان هەیە کە هیچیان دینی نین، یان لانی کەم پیاوانی دین بەڕێوەیان نابەن و ئاراستەیان ناکەن. لەدایکبوونی ڕۆشنبیریی مۆدێرنیش بە هەمان شێوە بەشێکی زۆری ئەو مۆنۆپۆلییەی کە پیاوانی دین لەسەر کایەی ڕۆشنبیریی هەیانبووە لەناو دەبەن. گەشەی تایبەت

---

بەتایبەتی بەشی نۆهەمەی کتێبەکە بەناوی:
"Empires of religion". ل ٣٢٥-٣٦٥

بە دۆخی ژنان و هاتنەکایەی میدیا و ڕێکخراوی تایبەت بە ژنانیش دیوێکی دیکەی ئەم گۆڕانکارییانەیە. لە هەموو ئەم بوارانەدا پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا لەناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ناوچەکەدا دێتە کایەوە، کە دەسەڵاتی دین و پیاوانی دین بەسەر ئەو ڕووبەرە تازەنەدا کەم دەکاتەوە و لە هەندێک دۆخدا هەر ناشیهێڵێت.

بەڵام بێگومان سەرەڕای ئەم پرۆسە بەرفراوانەی بەعەلمانیبوونی ناوچەکە، هێشتا کێشەیەک دەمێنێتەوە کە کێشەی پێگەی دینە لەناو پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵگاکاندا. لەم ڕووەوە وەک ئەم کتێبە نیشانی ئەدا ئێمە لەبەردەم دوو پارادایمداین. یەکەمیان پارادیمی عەلمانیەت و بەعەلمانیبوونی دونیایە، کە پێیان وایە دین لە پرۆسەی تازەبوونەوە بە حەتمی لاواز دەبێت و تازەبوونەوە بە شێوەیەکی حەتمی بە لاوازبوونی دینەوە گرێ دراوە. ئەمە ئەو پارادایمەیە کە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دێت و تا کۆتایی ساڵانی شەست ئامادەیە. بەڵام پارادایمی دووهەمیان پارادایمێکی تازەیە کە ئەو حەتمەیگەرایییەی یەکەم ڕەفز دەکات و پێی وایە کە دین لەناو دونیای مۆدێرن و لەناو پرۆسەی تازەبوونەوەدا مەرج نییە لاواز ببێت و پەراوێز بکەوێت. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا ئەم مەسەلانە بەدووروودرێژی باس دەکرێن. لە پەیوەندیدا بەو ناوچەیەی ئێمەوە دەکرێت پێ لەسەر ئەو ڕاستییە دابگرین کە لە سەرێکەوە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا بەخەستی لەئارادا بووە و دەسەڵاتی دین و پیاوانی دینیی لەسەر هەندێک ڕووبەری تایبەتیی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی لاواز کردوە، بەڵام لە هەندێک ئاست و ڕووبەری

تردا پێگەی دینی بەهێز کردوە. بۆ نموونە لە خەباتی دژی کۆلۆنیالی و ئیمپرالیدا.

**ئەم کتێبە چی دەوێت؟**

بەر لە هەموو شتێک مەبەست لە نووسینی ئەم کتێبە پڕوپاگەندەکردن نییە بۆ دین دژ بە عەلمانیەت، یاخود موجامەلەکردنی ئیسلامی سیاسی بێت بەرانبەر بە هێزەکانی دیکە، یان هەر شتێکی تر کە ئاو بە ئاشی هێزە ئایینییەکان و بە ئاشی تێڕوانینی دینی بۆ دونیادا، بکات. وەک کەمەکێک لەمەوبەر هێمام پێ کرد بۆچوونی من لەسەر نادیموکراسیبوونی بەشی هەرەزۆری هێزە دینییەکان و نادیموکراسیبوونی لێکدانەوەیان بۆ خودی دین خۆشی بۆ خوێنەری نووسینەکانی من ئاشکرایە. هاوکات ڕای من لەسەر ناوەڕۆک و فۆرمەکانی دین ئاشکرایە، کە لە کوردستاندا زیاد لە هێزێک بەرهەمیان دەهێنن و بڵاویان دەکەنەوە، چەندان فۆرم کە پڕن لە هاتوهاوار و قیڕەقیڕ و نەڕاندنێکی زۆر، پڕن لە ڕق و بوغز و توندوتیژیی ڕەمزیی هەمەجۆر، پڕن لە ڕۆحی تەکفیرکردن و تۆڵەسەندنەوە لە ئینسان و سووکایەتیکردن بە ژیان. بەڵام ئەم ڕەخنانە لە دین مانای ئەوە نییە کە عەلمانیەت چارەسەر و ڕێگای گەیشتن بە بەهەشتە. لەم ڕووەوە ڕای من لەسەر ئەو عەلمانیەتە دۆگمایی و سادەگۆ و گشتگیر و بێفیکرەش ئاشکرایە کە بە ڕیتۆریکی کۆمەڵناسەکانی سەدەی نۆزدەهەم بیر دەکەنەوە و هەموو ئەو دۆگمایانە دووبارە دەکەنەوە کە نزیکەی یەک سەدەیە ڕەخنە دەکرێن. ئەوەی من لەم کتێبەدا دەمەوێت ئەنجامی بدەم، بەرگریکردنە

لەو تێزە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەلسەفییانەی کە نایەوێت دیوارێک لەنێوان دین و دیموکراسیەت و دین و تازەبوونەوەی عەقڵانی و دین و کرانەوەی کۆمەڵایەتیدا دروست بکەن. هەروەها بەگژاچوونەوەی ئەو تێزە سادە و ناڕاستانەشە کە عەلمانیەت وەک فریادڕەسێکی مێژوویی نمایش دەکەن. ئەم کتێبە دەیەوێت نیشانی بدات کە دەشێت سیستمێکی سیاسیی دیموکراس و کراوە و پلورال دروست ببێت، بەبێ ئەوەی دین ناچار بکرێت پاشەکشە بکات بۆ سنوورەکانی ژیانی تایبەت و داببڕێت لە ژیانی گشتی، دەشێت دیموکراسیەت هەبێت و یەکێک لە دروستکەران و بەشداریکەرەکانی، هێزە سیاسییە دینییەکان بن. مەرج نییە بۆ ئەوەی دیموکراسیەت دروست و سەقامگیر بکرێت هەموو ڕۆڵێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گشتی لە دین بسێندرێتەوە. واتە مەسەلەکە لە بنەڕەتەوە مەسەلەی بەرگریکردن و نەکردن لە دین نییە، هەروەها بەرگریکردن یان نەکردن لە ئیسلامی سیاسیی نییە، بەڵکو مەسەلەی چۆنیەتیی گەیشتنە بە سیستمێکی دیموکراسیی دەستوریی کراوە و پلورال، کە توانای قبووڵکردنی فۆرمە جیاوازەکانی دین و نادینی بەیەکەوە هەبێت، هەم هێزی خۆبەئیسلامیزان و هەم هێزی خۆبەعەلمانیزان لە دروستکردنیدا بەشدار بن، بەبێ دووبارەکردنەوەی دۆگما دینییەکان و دۆگماکانی تێزەی "بەعەلمانیبوونی" دونیا بەیەکەوە، بەبێ دووبارەکردنەوەیەکی بێتامی پێدراوە دۆگماییەکانی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا و دووبارەکردنەوەی پێناسە ترسناکەکانی ئیسلام وەک سیستمێکی تۆتاڵ و کشتگیر، کە گوایە پێویستی بە دەرەوەی خۆی و بە دیموکراسییەت نییە. واتە ئەوەی من دەمەوێت

ئەنجامی بدەم، بیرکردنەوەیە لە دیموکراسیەت لە دەرەوەی ئەو پەیوەندییە حەتمییانەدا کە تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" و ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت، بۆ پەیوەندیی نێوان دین و مۆدێرنە و دین و سیاسەت گریمانیان دەکات. هەروەها لە دەرەوەی ئەو دۆگما ترسناکانەی ئیسلامی سیاسیشدا کە پێیان وایە ئیسلام سەرەتا و کۆتایی هەموو شتێکە و وەڵامی هەموو کێشە و گرفتێکی دونیای ئەمڕۆی پێیە و پێویستی بە هیچ شتێک نییە لە دەرەوەی ئیسلامەوە هاتبێت، بە دیموکراسیەت و مافەکانی مرۆڤ و بیرکردنەوەی زانستییەوە. لە دروستکردنی ئەم پێگە تیوری و میتۆدی و سیاسییەشدا پشتئەستوورم بەو کەلەپوورە درێژەی ڕەخنەکردنی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و ڕەخنەکردنی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا، کە لە کۆتاییی شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە بەشێکی گرنگە لە زانستی کۆمەڵناسی و ئینسانناسی و لە بیست ساڵی ڕابردووشدا بەشێکی گرنگە لەفەلسەفەی سیاسیدا.

ناوەندی ڕۆشنبیریی ئێمە و مەسەلەی عەلمانیەت لە بواری قسەکردن لەسەر ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرن و لە سەر مەسەلەی عەلمانیەت، ڕۆشنبیریی ئێمە پڕیەتی لەو "لەتەفەیلەسوف" و "نیمچەڕۆشنبیر"ە پێغەمبەرئاسا و "تویکڵەزانا"یانەی، کە بێ هیچ سڵەمینەوەیەکی مەعریفی و ئەخلاقی لەسەر ئەم مەسەلە گرنگە قسە دەکەن و هەموو ئەو خورافەت و دۆگما سادانە هەزاربارە دەکەنەوە کە تەمەنیان نزیکەی دوو سەدەیە. جۆرێک لەڕۆشنبیرمان هەیە

ماندوو نابن لە دووبارەکردنەوەی سەرجەمی ئەو گشتگیرییە سادە و ترسناکانەی هەر قوتابییەکی زانکۆیەکی ئاست مامناوەندییش لەوانەی یەکەمی خوێندندا فێر دەکرێت چۆن وازیان لێ بهێنێت. لەمانەش بترازێت لە ناوەندی سیاسیی دونیای ئێمەدا کۆمەڵێک سیاسیی نەخوێندەوار و لەشکرێک ئەکتیڤیستی دۆگمایی دینی و نادینی هەن، کە لە ئاستی فیکری و تیوریدا لە دۆخێکی تەواو وێراندان و ئەمانیش هەمان ئەو دۆگما و خورافاتانە دووبارە دەکەنەوە کە باسمان کردن. کێشەکە لەوەدایە لەپاڵ هەژاری و داماوییەکی تیوری و فیکریی سەرتاسەریدا، ئەم ڕۆشنبیر و سیاسی و ئەکتیڤیستانە لە کوردستاندا سەنگەرگیرییەکی گەورەیان لەنێوان دین و عەلمانیەتدا دروست کردوە و بەبەردەوامییش دروستی دەکەن، کە تیایدا لۆژیکی دروستکردنی دوژمن بالادەستە. بێگومان لەمەشدا بەشێکی گەورەی ئەم دوژمنکارییە بەر ڕۆشنبیر و خوێندەوارە ئیسلامییەکان دەکەوێت کە نزیکەی یەک سەدەی تەواوە قسە بە عەلمانیەت دەڵێن و وەک شەیتان نمایشی دەکەن.

ئەم لۆژیکە دوالیستی و دوژمناکارانە وای کردوە بڕێکی زۆر لە کەسایەتیی و هێزە دینییەکان عەلمانیەت بە کوفر و بێدینی و بێئەخلاقی یەکسان بکەن و بە ناوی موقەدەسی دینییەوە لەناو دەرکەوتە جیاوازەکانی ژیانی گشتیدا ئامادە بن و فەتوای سڕینەوە و لەناوبردنی عەلمانیەت و عەلمانییەکان بدەن، هاوکات خەریکی ئەوە بن کۆمەڵگا بگۆڕن بۆ ڕووبەرێکی داگیرکراو بە دینێکی نادیموکراسیی

پڕ لە هەڕەشە و ڕق و توندوتیژی ڕەمزی و مادی. بە دیوی ئەودیویشدا ژمارەیەکی بەرچاو لە عەلمانییەکان دین بە خورافەت و گەمژەیی و نەزای ناو دەبەن و مرۆڤی دینی وەک مرۆڤێکی کەم و نوقسان و کەمنرخ تەماشا دەکەن. سەری زمان و بنی زمانیان دووبارەکردنەوەیەکی بێتامی ئەو دۆگمایەیە کە دەیەوێت دین بگەڕێنێتەوە بۆ ناو سنوورەکانی ژیانی شەخسی و نەهێڵێت هیچ ڕۆڵێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە ژیانی گشتیدا ببینێت.

ئەم دوو بەرەیە هەردووکیان هەڵە و ترسناکن، هەردووکیان جگە لەوەی لەسەر هەژارییەکی فیکری و تیوریی گەورە دەژین، هاوکات تەواو نادیموکراسن و لەسەر نەفیکردنی یەکتری و سڕینەوەی پلورالیزم لە فۆرمە جیاوازەکانیدا دەژین. ئەم دوو هێزە سەرەڕای کێشانی ئەو هەموو شیر و تیرە تیوری و ناتیورییەکان لە یەکتری، هەردووکیان لەو خاڵەدا هاوبەشن کە هێزی نادیموکراس و دەسەڵاتگەر و دژەپلورالیزمن. ئەم کتێبە دەخوازێت ئەو دۆخە دووجەمسەرە پەرگیر و ترسناک و بێفیکرە جێ بهێڵێت و پەنجەرەیەک بە ڕووی دیالۆگ و یەکدیقبوڵکردن و پلورالیزمدا بکاتەوە.

وەک لە کۆتایی ئەم کتێبەدا دەر دەکەوێت، بەتایبەتی لەگەڵ ..ید و بۆچوونەکانی یورگن هابرماز و ڤایت بادەردا، خاڵێک کە ئەم دوو نووسەرە جەغتی لێ دەکەن کاری پێکەوەی و هاریکاریی دینی و عەلمانییەکانە بەیەکەوە بۆ تێپەاندنی ئەو ..وخی دابڕانەی کە دروست بووە. نەک هەر ئەمە، بەڵکو هەردوولا پێ لەسەر پرۆسەی فێربوون و پیاچوونەوەی

بەردەوام دادەگرن. هەردوو بەرە پێویستیان بە هاریکاریی یەکتر هەیە بۆ ئەوەی بتوانن زەمینەیەکی هاوبەش دروست بکەن کە تیایدا ئەو لۆژیکە دوالیستی و یەکتری نەفیکردنە شوێنی خۆی بدات بە کاری پێکەوەی و گوێگرتن لە یەکتری. ئامانجی سەرەکیی ئەم کتێبە گەیشتنە بە دۆخێکی لەو بابەتە.

# سەرچاوەکان

Bader, Veit (2010) Secularism or Democracy: associational governance of religiou diversity. Amsterdam, Amsterdam University Press

Bayat , Asef (2007). Making Islam Democratic: Social Movements and the PostIslamist Turn. Stanford, Stanford University Press.

Bayly, C.A. (2003). The Birth of the Modern World, 1780-1914. Oxford, Blackwell.

Berger, Peter (2014). The many altars of modernity. Toward a paradigm for religion in a pluralist age. De Gruyter Mouton

Leezenberg, Michiel (2007). Rede en religie: een verkenning. Amsterdam, Van Gennep.

Martin, David (1978). A General Theory of

Secularization. Oxford: Basil Blackwell.

Van der Veer, Peter (1995). The secular production of religion. Etnofoor, Jaarg. 8, Nr. 2

عزيز العظمة(٢٠٠٨). العلمانية من منظور مختلف: الدين و الدونيا من منظار تاريخي. مركز دراسات الوحدة العربية.

## دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (١)
## سەدەی نۆزدەهەم: سەدەیەکی عەلمانی؟

**سەرەتا**

یەکێک لەو باوەڕە بەهێزانەی کە بەشی هەرەزۆری کۆمەڵناس و ئینسانناس و سیاسەتناس و فەیلەسوفانی سەدەی نۆزدەهەم هەڵگری بوون، ئەو باوەڕەیە کە پێی وایە دین لە دونیای مۆدێرندا نەک تەنها لە پاشەکشێیەکی بەردەوام و لاوازبوونێکی هەمەلایەندایە، بەڵکو ڕۆژگارێکی کەمیشی لەبەردەمدا ماوە و مردن و کۆتاییهاتنی بەتەواوی نزیکە. نووسەرانی ئەو بوارە فیکرییە جیاوازانە لەوە ئەدوان کە دین ئەو پێگە سەرەکی و سێنترالییەی دۆڕاندوە کە لەناو کولتوور و عەقڵیەتی کۆمەڵگاکانی بەر لەسەدەی نۆزدەهەمدا هەیبووە. ڕۆڵی دین لە پێکهاتەی کولتوور و لە دهستنیشانکردنی بەها ئەخلاقییەکان و لە بواری سیاسەتدا کۆتایی پێ هاتووە و لە ئاستی زانستی و مەعریفیشدا بەتەواوی مایەپووچ بووە. پرۆسەی گۆڕان و تازەبوونەوەی دونیا شەپازلەیەکی گەورەی لە ڕوخساری دین داوەوە و دەریکردۆتە دەرەوەی مێژووی تازەی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان.

چیرۆکی ئەم وێناکردنە تایبەتە بۆ ڕۆڵی لاواز و پەراوێزی دین لە ژیانی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و مەعریفیی دونیای مۆدێرندا، لە هیگڵەوە دەست پێ دەکات. ئەگەر ڕەخنەکردنی دین بەشێک بێت لە مێژووی مرۆڤایەتی و لە مێژووی دین خۆی، ئەوا سەدەی نۆزدەهەم سەدەی ڕەخنەکردنێکی هەمەلایەنە و بەردەوام و سیستماتیکی دینە. بەر لە سەدەی نۆزدەهەم سەدەیەک لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نادۆزینەوە بە ڕادەی سەدەی نۆزدەهەم دینی ڕەخنە کردبێت و چاوەڕوانی کۆتاییهاتنی ڕۆڵ و کاریگەرییەکانی بێت لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگا و مێژوو.

## هیگڵ و دین

لای هیگل (١٧٧٠-١٨٣١) دین لە دونیای مۆدێرندا لەلایەن عەقڵەوە بەتەواوی تێپەڕێندراوە و ئەو دونیا سادە و پڕ وەهم و خەیالاتەی دین سەردەمانێکی درێژ دروست و وێنای دەکات، لەلایەن توانا گەورەکانی عەقڵەوە بۆ پێوان و بۆ لێکدانەوە و تێبینیکردنی بێهەڵەی وردەوە جێی گیراوەتەوە. دین شێوازی تەعبیرکردنی ڕۆحی ڕەهایە لە خۆی، بەر لەوەی ئەم ڕۆحە لە فەلسەفەدا تەعبیر لە خۆی بکات و لە فەلسەفەدا خۆی نمایش بکات. بەم مانایە دین قۆناغێکی تێپەڕە لە گەشەکردنی عەقڵ و هۆشیاریی مرۆڤدا، سەردەمەکێکە کەوتۆتە دوامانەوە. لای هیگڵ ئەگەرچی دین و عەقڵ هەردووکیان یەک بابەت و یەک حەقیقەتیان هەیە، کە بریتییە لە گەڕان بەدوای ڕاستیی ڕەهادا، بەڵام شێواز و میتۆد و جۆری کارکردن و شێوازی گەڕان و بیکردنەوەیان

جیاوازە. دین پشتی بە ئیحساسات و خەیالات بەستوە، بەلام فەلسەفە پشت بە بیرکردنەوە و چەمک دەبەستێت.[1] لای هیگل دین خۆشی مێژوویەکی هەیە کە تیایدا لە دینی سەرەتایی و سادە و غەیبانییەوە گەشە دەکات بۆ دینێک کە برێکی زۆر لە عەقلانیەتی تێدایە، ئەم گەشەکردنەی دینیش لە مەسیحیەتدا بە بەرزترین و بالاترین قۆناغی خۆی دەگات.[2] لە ڕاستیدا هیگل لە گەشەکردنی دین خۆیدا سێ جۆر لە دین یان سێ قۆناغی تایبەتی گەشەکردنی دین لە یەکتری جیا دەکاتەوە و لە هەریەکێک لەو قۆناغانەدا باس لە ئاستێکی تایبەتی هۆشیاری و ئاستێکی تایبەتی ڕوانینی مرۆڤ بۆ دونیا و دیاردەکان دەکات. لە هەر قۆناغێکدا دین بابەتێکی تایبەتی هەیە، یان ڕوانینێکی تایبەتی بۆ خودا یان "هەقیقەتی ڕەها" هەیە. ئەو سێ شێوازەش لە دین بریتین لە دینی سروشتی، دینیی ئیستاتیکی و دینی وەحی. دینی سروشتی، خودا لە خودی خۆیدا ناناسێت و ناپەرستێت، وەک خودێک وێنای ناکات، بەڵکو لە فۆرمی بابەتێکی سروشتیدا دەیبینێت، وەک ڕووناکی، یان وەک درەختێکی موقەدەس و خاوەن ڕۆح، یان وەک ئاژەڵێک. لە دینی ئیستاتیکی یان هونەریدا، بۆ نموونە لای یۆنانییە کۆنەکان، خوداکان وەک پەیکەر و وەک بەرهەمی کارە هونەرییەکانی مرۆڤ دەر دەکەون. لێرەدا تێگەیشتن لە خودا خۆی لە سروشت جیا دەکاتەوە و فۆرمێکی ئینسانی وەر دەگرێت لە فۆرمی پەیکەردا. بەلام

1 -Labuschagne, Bart, Timo Slootweg en Rico Sneller (2014). Hegels godsdienstfilosofie en de monotheïstische religies: een acyuele confrontatie. Antwerpen-Apeldorn, Garant. P. 30

٢ -هەمان سەرچاوی پێشوو ل ٣٠

مەسیحیەت خودا لە ڕێگای وەحییەوە وەک ڕۆحێکی ڕەها نیشان ئەدات، بەڵام هاوکات لە فۆرمی ئینسانێکیشدا، لە فۆرمی مەسحیدا وەک ئینسان، دەینێرێتە سەر زەوی و ناو مرۆڤەکانی ترەوە. قسەکانی خودا دەبن بە گۆشت و ئێسقان و خوێن و وێنەی مرۆڤێکیان پێ دەبەخشرێت. بەم جۆرە مەسیحیەت خودا و مرۆڤ بە شێوەیەکی هێجگار بەهێز و پتەو بەیەکەوە گرێ ئەدات و سروشتی خودا وەک سروشتی مرۆڤ نماییش دەکات. بەم جۆرە مەسیحیەت بەسەر کێشەی مرۆڤدا وەک بوونەوەرێکی ناکۆتا، کە تەمەنێکی کەمی هەیە و دەمرێت، زاڵ دەبێت و ڕەهەندێکی ئەبەدی و هەمیشەیی لە فۆرمی خودادا پێ دەبەخشێت. وەک چۆن مەسیح وەک کوڕی خودا، وەک ئینسانێکی کۆنکریت، بەسەر مردندا زاڵ دەبێت و لە دوای مردنەکەی زیندوو دەبێتەوە و بەرەو ئاسمان دەڕوات، مرۆڤەکانی تریش بە هەمان ڕێگادا دەڕۆن و لەم ڕێگایەوە بەسەر کێشە و تەحەدای مردندا زاڵ دەبن.[1] مێژووی مرۆڤیش مێژووی ڕامالینی یەک بەدوای یەکی هەموو ئەو بەرگرییانەیە کە وا دەکەن مرۆڤ، بەتایبەتی هۆشیاریی مرۆڤ، ئازاد بێت و ئازادانە لە پەیوەندەییەکی دژ بە نامۆبووندا بێت لەگەڵ خۆیدا. دەوڵەت و هونەر و دین و فەلسەفە بەرجەستەبوونی ئەم ئازادییەن و فەلسەفەش قۆناغی دوای دینە و لەو پێشکەوتووتر و کامڵترە. بەکورتی، دین لای دین پابەستە بە فینۆمینۆلۆژیای ڕۆحەوە، واتە پابەستە بە شێوازەکانی دەرکەوتنی ڕۆحەوە لەناو مێژوودا، پابەستە بەو ئەزموونانەوە کە هۆشیاری تیایاندا خۆی

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٥-٣٦

ئەدۆزێتـەوە و پەیوەندیی بە خـودی خۆیـەوە و بـە جیهانـەوە دەکات. هۆشـیاری لـە فەلسـەفەدا بەتـەواوی شوناسـی خـۆی ئەدۆزێتەوە و خۆی وەک هۆشیارییەکی ڕاستەقینە بەرجەستە دەکات، بـەڵام لـە دینـدا ئـەو کارەی بـۆ ناکرێـت. لـە دینـدا هۆشـیاری هێشـتا نامۆیـە بـە خـۆی و بـە شوناسـی خـۆی وەک هۆشـیارییەکی ڕەهـا. بـە مانایـەکی دیکـە هۆشیاری لـە گەشـەی خۆیـدا بـەر لـەوەی بـە مەعریفـە و زانینـی ڕەهـا بـگات، بـە قۆناغـی دینـدا تێدەپەڕێت و دیـن هەنگاوێـک یـان قۆناغێکـە لـەم گەشـەکردنەی عەقـڵ و مەعریفـەدا.[1]

سـەرەڕای ئـەو دیـدە بـۆ دیـن وەک قۆناغێکـی تێپـەڕ لـە مێـژووی بەرجەسـتەبوونی هۆشـیاریی لـە مێـژوودا، هیـگڵ گرنگییەکـی تایبەتـی بـە ڕەهەنـدی ئەخلاقییانـەی دیـن ئـەدات و پێـی وایـە دەکرێـت دیـن لـە ئاسـتی ئەخلاقیـدا هاریـکاری ئینسـان بێـت و گەرمییـەک بـە ژیانـی ببەخشـێت، بـەڵام پێشـی وایـە مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی مرۆڤێکـی بـاش و چاکـەکار بێـت و بـۆ ئـەوەی بـە شـێوەیەکی ئەخلاقییانـە هەڵسـوکەوت بـکات، مـەرج نییـە پێویسـتی بـە دیـن بێـت. بـەم مانایـە ئەگەرچـی هیـگڵ ڕووبەڕێک بۆ ئامادەگیی ئەخلاقییانـەی دیـن لـە دونیـای مۆدێرنـدا دەهێڵێتـەوە، بـەڵام بەرگرییەکـی تـەواو لـەوە دەکات کـە مـەرج نییـە ئەخـلاق لـەم دونیـا تازەیـەدا تەنهـا لەسـەر دیـن دروسـت بکرێت، ئەخـلاق دەشـێت جیهانبینیـی نادینـی و دونیایی بنەماکانـی بێـت و ئـەو جیهانبینیانەش ئاراسـتەی بکەن. لەمەشـدا هیـگڵ مێـژوو بـە شـێوەیەک وێنـا دەکات کـە بەسـەر چەنـد قۆنـاغ و سـەردەمێکی جیاوازدا دابەشـی دەکات و لـەم قۆناغکارییەشـدا

1 -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل31- 32

دین لە سەردەمە دێرینەکاندا بنەمای بیرکردنەوە و ئەخلاق بووە و لە سەردەمی مۆدێرندا ئەو ڕۆڵەی نامێنێت، یان تەواو لاوازدەبێت. لەم ڕوانینەدا هیگل مێژوو وەک هێڵێکێکی ڕاست وێنا دەکات کە هەمیشە بەرەو پێشەوە دەڕوات و خاڵە تازەکانی سەر ئەو هێڵە لە خاڵە کۆنەکانی عەقڵانیتر و پێشکەوتوتر و باشتر و ئازاددترن. خودی مێژوو خۆشی سەحنەی بەرجەستەبوونی ئازادییە لە فۆرمی جیاوازدا، لە فۆرمی دەوڵەتەوە بیگرە بۆ فۆرمی هونەر و دین و فەلسەفە و فیکری زانستی. بەکورتیەکەی دین شێوازی بیرکردنەوە و ڕوانین و ئەخلاقیاتێکی تایبەتە، کە سەر بە قۆناغێکی مێژووی مرۆڤایەتییە کە تێپەڕیوە، لەناو دینەکانیشدا دینە خۆرهەڵاتییەکان وەک دینێکی تێپەڕیوتر و خراپ و پڕ لە نوقسانی دەبینێت، بە بەراورد بە دینە خۆرئاواییەکان، بەتایبەتی بە مەسیحیەت. دید و ڕوانینی هیگل بۆ ئیسلام تەواو دید و ڕوانینێکی نێگەتیڤە.[1] لە دیدی هیگلدا تەنها لە مەسیحیەتدا خودا بەتەواوی بەرجەستە و کامڵ بووە، بە شێوەیەکی پێرفێکتیش گریمان کراوە. لە مەسیحیەتدا پەیوەندییەکی بەرجەستە و ڕاستەقینە لەنێوان خودا و ئینساندا دروست بووە، لە نێوان موقەدەس و ناموقەدەسدا، خودا خۆی دابەزیوە بۆ سەر زەوی و بۆ ناو مرۆڤەکان. بووە بە بەشێک لە مرۆڤایەتی لە فۆرمی مەسیح خۆیدا، وەک مرۆڤ و وەک فەرزەندەی خودا. ئەمەش ئەو هەڵە

---

١-بۆ مەسەلەی دین لای هیگل بەگشتی و بۆ مەسەلەی پەیوەندیی نێوان هیگل و ئیسلام بەتایبەتی بڕوانە:

Jean-Joseph Goux, "Untimely Islam: September 11th and the Philosophies of History," SubStance 115 (2008): 56.

بە هۆشیاریی مرۆڤ دەبەخشێت کە بەردەوام هەوڵی ئەوە بدات مردنی خۆی بە نەمریی خوداوە گرێ بدات و بەمەش بەسەر تەحەدای مردن و لەناوچووندا سەر بکەوێت. بە بەراورد بە مەسیحیەت، هیگل پێی وایە سەرجەمی دینەکانی تر، لەوانەش ئیسلام، کەم دەهێنن و پڕن لە نوقسانیی گەورە. بەلای هیگڵەوە مرۆڤ لە ئیسلامدا لەبەردەم خودایەکدایە کە ناتوانێت پەیوەندیی پێوە بکات و لەگەڵیدا بێت، تاکە شتێک ئینسان بیکات ئەوەیە تەسلیمی بێت و گوێڕایەڵی بێت. یان باوەڕدار بێت و ئامادە بێت لەپێناوی ئەو باوەڕەدا خۆی بەکوشت بدات. لە ئیسلامدا وەک مەسیحیەت پەیوەندییەکی مانادار لەنێوان مرۆڤ و خوداوەنددا بوونی نییە، هەروەها لە ئیسلامدا مرۆڤایەتی ناتوانێت بەرز ببێتەوە و لەگەڵ خودادا پێکەوەبێت.[1]

بەکورتی، دین لەم دیدە هیگڵیەدا سەر بە قۆناغی منداڵیی عەقڵ و منداڵیی تێگەیشتنی مرۆڤە، ساتەوەختێکە تیایدا هۆشیاری هێشتا بەباشی خۆی ناناسێت، مەسافەیەک لەنێوان هۆشیاری و خۆناسینی هۆشیارییدا بۆ خود خۆی، بوونی هەیە. لای هیگڵ هۆشیاریی تەنها لە فەلسەفە و زانستدا بەتەواوی بە خۆی هۆشیار و لە خۆی بەئاگا دەبێت، تەنها لەمانەدا جەوهەری خۆی دەناسێت و لەگەڵ خۆیدا تەبا دەبێت، هەموو فۆرمەکانی نامۆبوونی خۆی لە خۆی دەسڕێتەوە و خۆی لەبەردەمی خۆیدا وەک ڕاستییەکی ڕەها دەر دەکەوێت. ئەوەی لە دیندا بەرجەستەیە وێناکردن و تەسەورێکە،

1 - Bhatawadekar, Sa (2014). Islam in Hegel's Triadic Philosophy of Religion.Journal of World History, Vol. 25, No. 2/3, p. 397/398

بەلام ئەوەی لە فەلسەفەدا بەرجەستە دەبێت هەقیقەتە.[1] بە مانایەکی دیکە دین ناتوانێت هەقیقەتی دونیامان پێ بلێت و دیاردەکانمان بە شێوەیەی عەقلانی بۆ لێک بداتەوە، دین دەتوانێت تەنها کۆمەڵێک وێنە و تەسەوری گریمانکراومان بداتێ، هەرچی زانست و فەلسەفە و شێوازی بیرکردنەوەی مۆدێرنە دەتوانن هەقیقەتی شتەکان و دیاردەکان و دونیامان بدەنێ.

لە سەرێکی دیکەوە هیگل پێ لەسەر ڕووەکارە توندوتیژ و شەڕانی و چەپێنەرەکانی دین دادەگرێت و پێی وایە مێژووی دین بەشێکی گرنگی مێژووی پێکدادانە توندوتیژەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگاکانە لەگەڵ یەکدا. جگە لە جەنگیش، دین مرۆڤایەتی تووشی چەندەها وەهم و خورافەتی گەورە کردوە و عەقڵ لەمرۆدا خەریکی پاککردنەوەی خۆی و پاککردنەوەی خەیاڵی مرۆڤایەتییە لەو وەهم و خورافەتانە و دەیەوێت کۆتایی بە سەرجەمی ئەو ناڕێکی و ئەفسانەسازییانە بهێنێت کە لە بیرکردنەوەی مرۆڤدا دروست بوون. لای هیگل عەقڵ پرنسیپێکی گشتییە و پێویستیی بە دین نییە بۆ خۆناسین، لە ڕووی ڕیزبەندییشەوە هەم لە سەرووی دین و هەم لە سەرووی شێوازەکانی تری ڕوانین و بیرکردنەوەیە. لەناو دینەکانیشدا مەسیحیەت بە تاقە دینێکی عەقلانی دەزانێت و ئیسلامی وەک دینێکی بەربەری و ناماقوول و بێڕۆحانیەت وێنا دەکرد.[2]

---

١ - بڕوانە:

L. DE VOS(1984). Hegels begrip van de religie. Tijdschrift voor Filosofie, 46ste Jaarg., Nr. 2 (JUNI 1984), p 333

2 -Walter Jaeschke (1992)."Philosophical Theology and

بەم جۆرە هیگل عەقڵ دەکاتە سەرداری ئینسان و ئامرازی سەرەکیی تێگەیشتنی مرۆڤ لە خۆی و لە سروشت و لە مێژوو. ئەوەی گرنگە لێرەدا هێمایەکی خێرای پێ بکەین، ئەوەیە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا هیگل لەم ڕوانینەدا بۆ دین فەیلەسوفێکی تەنها نییە، بەڵکو درێژە بەو هێڵەی ناو بیرکردنەوە ئەدات کە لە ڕۆشنگەرییەوە دێت و دین وەک دیاردەیەکی تێپەڕ و لێوانلێو لە هەڵەی فیکری و مەعریفی دەبینێت. ئەگەرچی بەشی زۆری ڕۆشنگەرەکان کەسانی بێدین و دژەدین نەبوون و نین، بەلام لەناو ڕۆشنگەریی خۆیدا هێڵێکی دژەدین هەیە، کە ڕەنگە سپینۆزا لە هەرە ناوە دیارەکانیان بێت. بەلام باسکردنی ئەم هێڵە لە ڕۆشنگەرییەوە بۆ سەر هیگل دەکەوێتە دەرەوەی مەبەستی ئەم کتێبەوە.

**فیورباخ و دین**

لە دوای هیگڵەوە، فەیلەسوفێکی ئەڵمانیی تر، بە ناوی لودڤیک فیورباخەوە (١٨٠٤-١٨٧٢)، درێژە بەم هێڵە فیکرییە ئەدات. فیورباخ خۆی بەگەنجی پیاوێکی ئیماندار بوو، بڕوا و عەقیدە دینییەکانیشی بەرەو خوێندنی خوداناسیی دەبات. بەلام دواتر دەبێت بە پرۆفیسۆری فەلسەفە و مێژوو و لە قۆناغێکدا تەواو بێباوەڕ دەبێت و ژیانی ئەکادیمی و ڕۆشنبیریی خۆی بۆ ڕەخنەکردنی دین بە گشتی و بۆ ڕەخنەکردنی مەسیحیەت بەتایبەتی، تەرخان دەکات. فیورباخ ئەو کەسەیە کە بێئیمانیی

---

Philosophy of Religion," New Perspectives on Hegel's Philosophy of Religion, ed. David Kolb (Albany: State University of New York Press, 1992), pp. 1–18

دەباتە ناو بواری خوداناسیی خۆیەوە. بەڵام فیورباخ ڕەخنەی ئەوە لە بێباوەڕەکان دەگرێت کە بە هەڵە لە دین تێگیشتوون، ئەوان بۆ ئەوەی پێگەی مرۆڤ بەرز بکەنەوە و مرۆڤ بکەنە سەرچاوەی ڕوودانی دیاردەکان، دێن لە پێگەی خودا و لە پێگەی دین کەم دەکەنەوە، لە کاتێکدا ئەوەی دەبێت ئەوان بیکەن و ئەنجامی بدەن ئەوەیە لەوە بکۆڵنەوە ئایا مرۆڤ بۆ باوەڕی بە خودایە، ئایا خودا بەڕاستی چییە و کێیە؟ وەڵامی فیورباخ بەو پرسیارە ئەوەیە کە خودا بەرهەمی نامۆبوونی مرۆڤە لە خودی خۆی. بەم مانایە دین دیاردەیەکی سایکۆلۆژییە و پابەستی سایکۆلۆژیای مرۆڤی نامۆبووە، کە پەیوەندیی بە پێداویستیی مرۆڤەوە هەیە بە پشت و پەنایەکی بەهێز، بە توانای سنووردارییی مرۆڤ و بە نهێنییەکانی مردن و فەوتان و لەناوچوونەوە.

فیورباخ لە ساڵی ١٨٣٠دا کتێبێک بە ناوی "هەندێک بۆچوون دەربارەی مردن و نەمریی" بڵاو دەکاتەوە، کە ڕەخنەیەکی توندە لە دین، فیورباخ کتێبەکە بە ناوی خۆیەوە بڵاو ناکاتەوە، بەڵام دواتر ئاشکرا دەبێت کە ئەو نووسەرەکەیەتی و بەم بۆنەیەوە لە زانکۆ دەر دەکرێت. بەڵام ئەو لە دوای دەرکردنەکەشیەوە لە کارەکانی خۆیدا بەردەوام دەبێت و لە ساڵی ١٨٤١دا گرنگترین کتێبی خۆی دەنووسێت بە ناوی "جەوهەری مەسیحیەت"ەوە. فیورباخ پێی وایە بیرۆکەی زیندوبوونەوەی مرۆڤ لەدوای مردن بیرۆکەیەکی نوێیە و لە دینە دێرینەکانی سەردەمی یۆنانی کۆن و سەردەمی ڕۆمانییەکاندا بوونی نەبووە. مەسەلەی پێداگرتنیش لەسەر زیندووبوونەوەی دوای مردن، پەیوەندیی بە ئەنانیەتی مرۆڤ

و حەزی بێپایانی بۆ مانەوە و نەمردنەوە هەیە. فیورباخ دین وەک ڕەنگدانەوە و بەرجەستەکەری هیوا و و ئارەزووەکانی مرۆڤ دەبینێت، نەک شتێک خودا لە ئاسمانەوە ناردبێتی. ئینسان دین دروست دەکات بۆ ئەوەی بەسەر ترس و وەسوەسەکانیدا زاڵ ببێت، بۆ ئەوەی بەسەر ترس و تۆقین لە مردندا سەر بکەوێت. مرۆڤ لە دیندا دونیایەک دروست دەکات لەودیوی دونیای ئێستاوە و پێی وایە لەو دونیایەدا زیندوو دەبێتەوە و بەسەر مردندا زاڵ دەبێت و هەرگیز کۆتایی بە ژیانیشی نایەت. فیورباخ پێی وایە ئەوەی ئەو دونیا نادیارەی دروست کردوە کە گوایە مرۆڤ دوای مردنی بۆی دەگەڕێتەوە، بە حەز و ئارەزوو و ترس و ئومێدەکانی مرۆڤ خۆیەتی، ترس لە مردن بیرۆکەی نەمریی دروست کردوە و ترس لە کەوتن و نەخۆشی و لاوازیی بیرۆکەی خودایەکی دروست کردوە کە بەهێز و هاوڕێ و هاودەمی مرۆڤە. بەم مانایە دین وێنەیەکی هەڵە و لنگەوقوچی دونیا دروست دەکات، ترس و هیوا سەرزەمینی و ئینسانییەکان فڕێ ئەداتە ئاسمانەوە و لەوێدا دونیایەک بۆ سەردەمی دوای مردن دروست دەکات. بەم مانایە ئینسان کە باوەڕی بە خودا هەیە تەنها پەیوەندیی بەوەوە نییە کە بوونەوەرێکە خاوەنی خەیاڵ و هەست و نەستە، بەڵکو پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە بوونەوەرێکە بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێت. خوداش ئەو بوونەوەرە هەمەتوانا و گەورەیەیە کە دەتوانێت ئەوپەڕی بەختەوەری بە مرۆڤ ببەخشێت. مرۆڤ باوەڕی بە ژیانێکی ئەبەدی هەیە، چونکە خۆی حەز بە بوونی ژیانێکی ئەبەدی دەکات، باوەڕی بە خودایەکی بەهێز هەیە، چونکە خۆی حەز

دەکات بوونەوەرێکی بەهێز بێت، باوەڕیشی بە ژیانێکی تەواو کامڵ و پڕچێژ و بێهەڵە هەیە، چونکە خۆی حەز بە بوونی ژیانێکی لەو بابەتە دەکات. بەم مانایە دین پیاوانی دین یان دەسەڵاتداران دروستیان نەکردوە، بەڵکو حەز و شەوقی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە بەختەوەری دروستی کردوە. ئەوەی جەوهەر و دینامیکیەتی دین دەستنیشان دەکات ئەم حەز و خواستە دەروونییانەی مرۆڤە، ئەم پاڵنەرە گەورەیەی مرۆڤە بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری. بەلام کێشەکە لەوەدایە مرۆڤ لە شوێنێکدا بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێت کە دەستی پێی ناگات: لە ئاسماندا. مرۆڤ ناتوانێت لە ئاسماندا بژی، کەچی بەختەوەرییە هەرە سەرەکی و گەورەکانی هەڵگرتوە بۆ ئەوێ.

فیورباخ هیگڵییەکی چەپگەر بوو، لە سیاسەتدا لیبرال و لە فیکردا ماتریالی و لە ڕووی دینییەوە بێئیمان بوو. هاوکات خوداناسێکی بێئیمانە و باوەڕێکی گەورەی بە توانا و دەسەڵاتەکانی عەقڵ هەیە. یەکێک لە کارە گرنگەکانی ئەوەیە کە بێئیمانی ڕادەکێشێتە ناو کایەی خوداناسیی خۆیەوە. لای فیورباخ دین دیاردەیەکی سایکۆلۆژیی دەروونییە، دیناسی خۆیشی جۆرێکە لە نەخۆشیی دەروونی.[1] بەشێکی گرنگی کارەکانی ئەم فەیلەسوفە تەرخانە بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی مەسیحیەت وەک دین، بەلام لەپاڵ ئەو ڕۆحیەتە زانستییە گەشبینەدا کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا دروست دەبێت، ڕۆحیەتێک پێی وایە زانست دەتوانێت چارەسەری

1 -Besten, den Leen (2011). Illusie of verlichting. Kritiek op en betekenis van religie. Vught, Skandalon. p.47

هەموو کێشەکانی کۆمەڵگا و مرۆڤ بکات و دەتوانێت شوێنی دین و خورافەت بگرێتەوە. فیورباخ ڕای وا بوو دین بریتییە لەدروستکردنی وێنەیەک بۆ ئاسمان لەسەر بنەمای ئەو وێنانەی ئینسان بۆ زەوی دروستیان دەکات. ئینسان لەسەر مۆدێلی وێنەکانی خۆی وێنەی ئەو خودایانە دەکێشێت کە دەیانپەرستێت. یۆنانییەکان بەدوای بەختەوەرییەکدا دەگەڕان لەسەر زەوی، بۆیە خواکانیان هێنایە سەر شاخی ئەلب لەناو یۆنان خۆیدا. جولەکەکان بەدوای دەسەلاتدا دەگەڕان، بۆیە خودایەکیان دروست کرد کە هەموو دەسەلاتێکی هەیە، مەسیحییەکان بەدوای فریادڕەسێکدا دەگەڕان کە مرۆڤ لە ڕەنج و تەقاللا پڕووکێنەرەکانی سەر زەوی ڕزگار بکات، بۆیە وێنەی خودایەکیان دروست کرد کە ڕزگارکەر و فریادڕەسە. بەم مانایە خودا ئەو وێنەیەیە کە مرۆڤ بۆ خۆی دەکێشێت، لە کاتێکدا وەک بوونەوەرێکی هەمەتوانا و بەختەوەر لە خۆی ڕادەمێنێت. بۆیە جیاکردنەوەی خودا لە مرۆڤ وەهمێکی گەورەیە و ئیرادەی خودا و ئیرادەی مرۆڤ هەمان شتن.[1]

بەکورتیەکەی خودا شتێکی ئاسمانی و موفاریق نییە، بەڵکو ناوەوەی مرۆڤە لە دۆخی دەرکەوتن و بەرجەستەبوونیدا لە دیندا. لە ڕاستییشدا دین هیچ شتێکمان لەسەر خودا پێ ناڵێت، بەڵکو هەموو شتێکمان لەسەر مرۆڤ پێ ئەڵێت، باسی ئاسمانمان بۆ ناکات، بەڵکو باسی سەرزەوی و ناو جیهانمان بۆ دەکات. باسی بەهەشت و جەهەنەم و پاداشت و سزامان بۆ ناکات، بەڵکو باسی حەز و خواست و ترسە

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٨

سادە و قووڵەکانی مرۆڤمان بۆ دەکات. بەڵام مرۆڤ چونکە خۆی ئەم شتانە نازانێت، چونکە خۆی و ناوەوەی خۆی ناناسێت، بۆیە دین مانای نامۆبوونی مرۆڤە لە خودی خۆی، بەرهەمی خۆنەناسین و بەخۆئاشنانەبوونی مرۆڤە. تا ئەو شوێنەیش کە خود و مرۆڤ وەک دوو بوونەوەری جیاواز ببینێت ئەم نامۆبوونە بەردەوام دەبێت. بەڵام لای فیورباخ زانست و عەقڵ و بیرکردنەوەی لۆژیکی دەتوانێت مرۆڤ لەم نامۆبوونە رزگار بکات و راستییەکانی بۆ شی بکاتەوە.

هاوکات مرۆڤ ئەو بەها و نرخانەی کە خۆی بە گرنگیان دەزانێت و پێی وایە پێویستە بپارێزرێن، بەرزیان دەکاتەوە بۆ ئاسمان و بە بوونی خوداوەندێکەوە لە ئاسمان، گرێیان ئەدات. فیورباخ پێی وایە ئینسان خوداکان لەسەر وێنەی کەسایەتیی ئینسانێکی ئەخلاقیی بێهەڵە و کامڵ دروست دەکات و بەرزیان دەکاتەوە بۆ ئاسمان. لەم رێگەیەوە خودا دەبێت بە هەڵگر و بەرجەستەکەری هەموو ئەو نرخ و بەها گرنگ و جوانانەی ئینسان خۆی حەز دەکات هەڵگریان بێت و لە رێگای خوداشەوە هێز و بوونێکی دەرەدونیایی، واتە موفاریق، بە بەهاکان دەبەخشێت. لەم رووەوە فیورباخ دەنووسێت: "مرۆڤ باوەڕوی بە بوونی خودا هەیە، نە لەبەر ئەوەی تەنها خاوەنی خەیاڵ و خاوەنی ئیمانە، بەڵکو لەبەر ئەوەی هێزێکی ناوەکیی تێدایە پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەوەی بەختەوەر بێت. مرۆڤ باوەڕی بە بوونەوەرێکی بەختەوەر هەیە، نەک تەنها لەبەر ئەوەی هەمیشە وێناکردنێکی بۆ بەختەوەری هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی دەیەوێت خۆشی

بەختەوەر بێت. مرۆڤ باوەڕی بە بوونی بوونەوەرێکی بێهەڵە و پێرفێکت هەیە، چونکە حەز دەکات و دەیەوێت خۆشی بێهەڵە و پێرفێکت بێت. مرۆڤ باوەڕی بە بوونەوەرێک هەیە کە هەرگیز نامرێت، چونکە خۆی حەزی لەوەیە کە نەمرێت".[1]

بە کورتی دین لای فیورباخ ئامرازێکە مرۆڤ لە ڕێگایەوە بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێت، بەڵام بەختەوەرییەک لەسەر زەوی نا، بەڵکو لە جێگایەکی تر، جێگایەکی هەڵە و خورافی، لە ئاسمان. خودا خۆیشی لە ئاسماندا نییە، بەڵکو لەناو غەم و پەژارە و چاوەڕوانییەکانی مرۆڤ خۆیدایە، لە ڕاستیدا دین خۆیشی هیچ شتێک دەربارەی خودا ناڵێت، بەڵکو شتێکە پەیوەستە بە مرۆڤ و خولیا و حەز و ترس و گومانەکانیەوە. فیورباخ پێی وایە ئینسان ئەو ڕاستییە لەبیر دەکات کە ئەوە خۆیەتی خوداکانی دروست کردوە، نەک ئەوەی خوداکان ئەویان دروست کردبێت. فیورباخ لە ئاستی مەعریفیدا ئەو هێڵە لە بیرکردنەوە بەهێز دەکات کە دین بە خورافەت و بە وەهم یەکسان دەکاتکە دواتر زانست کۆتاییان پێ دەهێنێت و دەسەڵاتی دین بەتەواوی کەم دەکاتەوە گەر لەناویشی نەبات.[2]

فیورباخ باوەڕی وا بوو کە بیرکردنەوەی زانستی و فەلسەفە دەتوانن شوێنی دین بگرنەوە و کۆتایی بە نامۆبوونی مرۆڤ بهێنن، ئەرکی خۆشی وەک فەیلەسوفێک لەوەدا دەبینیی کە ئەم شتانە بۆ مرۆڤایەتی ڕوون بکاتەوە

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٧.

٢ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٧-٤٨

و بەشدار بێت لە کۆتاییهێنان بەو نامۆبوونە دوورودرێژەی مرۆڤـەوە.

## نیتشە و دین

هـەر لـە سـەدەی نۆزدەهەمـدا فەیلەسـوفێکی ئەڵمانیـی تـر، فریدریـک نیتشـە (١٨٤٤-١٩٠٠)، لەسـەر هەمـان هێڵـی بیرکردنـەوی فیورباخ لـە دیـن بـەردەوام دەبێـت و بوونـی خـودا وەک گواسـتنەوەی وێنـە و خـەون و خواسـتەکانی ئینسـان بـۆ ئاسـمان وێنـا دەکات، دیـن وەک بەئاسـمانیکردنی هەندێـک بەهـا و نـرخ و پێداویسـتیی ئینسـانی دەبینێت، کـە هەموویـان لەسـەر زەمیـن و لەنـاو ژیـان و پەیوەندییەکانـی دەسـەڵاتدا دروسـت دەبن. مـرۆڤ لـە دینـدا خواسـت و نیـاز و حەزەکانی بۆ دەرەوەی خۆی و بۆ دونیایەکی دەرەسروشـتی دەگوازێتـەوە، ئـەو دونیایـەش وەک هەقیقـەت و وەک دونیایەکی هەمیشـەی و ناکۆتـا مامەڵـە دەکات. لای نیتشـە ڕەخنـە لـە دین شـێوازێکی توندتـر و ڕاسـتەوخۆتر و فراوانتـر دەگرێتـە خـۆی و کەمکردنـەوەی نرخـی دینیـش بـە ئاسـتێکی هێجگار گـەورە دەگات. دیـن لای ئـەم فەیلەسـوفە هێمایـە بـۆ ژیانێکـی بێمانـا و نـزم، ژیانێـک بێڕیسـک و بێئیـرادە، دۆخـی کوشـتنی ژیـان و بەتاڵکردنـەوەی لـە چێژەکان. پێشـی وایـە لـە ئێسـتادا سـەردەمی هاتنەکایـەی بێخوداییەکـی ڕەهـا و بێمـەرج و عەقڵانـی هاتۆتـە کایـەوە کـە هەمـوو درۆکانـی دیـن ئاشـکرا دەکات و هەمـوو خورافـەت و ئەفسـانەکانی بەتـاڵ دەکاتـەوە. چونکـە دیـن لەسـەر نکوڵیکـردن لـە مرۆڤبوون دروسـت بـووە، بۆیـە شـتێکی بێـزراو

و قابیلی قبوولکردن نییە.[1] نیتشە پێشی وایە مرۆڤ پێویستی بە خودایە وەک درۆیەک کە لە درۆی قەدەر و چارەنووس دەچێت.[2] ئەوەی ئەو وەک فەیلەسوفێک دەیەوێت ئەنجامی بدات، ئەوەیە ئەم ڕاستییە تاڵانە بە مرۆڤ بڵێت بەبێ ئەوەی وتنییان چێژ و مانا و ڕیسک و عەشق لە ژیاندا کەم بکاتەوە، یان وا لە مرۆڤ بکات بەدوای جیهانێکی تردا بگەڕێت و بەرەو شوێنێکی دیکە ڕابکات. نیتشە پێی وا بوو سەردەمی بێخوداییەکی عەقڵانی هاتۆتە کایەوە، کە مرۆڤ چیدی پێویستی بە درۆی دین و بە وێنەی خودایەک نییە کە بەهانایەوە بێت. بیرکردنەوە لە خودا و باوڕبوون پێی، لەسەر بنەمای بیرنەکردنەوە لە مرۆڤ و باوەڕنەبوون بە مرۆڤ دروست بووە. بە باوەڕی نیتشە لە کوێ دین هەبوو لەوێ ژیانی لێ نییە، ئامادەگیی دین مانای وێرانبوون و داخزانی تەواوەتیی ژیان.

شتێک کە فیکری نیتشەی پێ دەناسرێتەوە بانگەشەی "مردنی خودا"یە. نیتشە لەسەر زمانی زەردەشتەوە بە مرۆڤی ناو دونیای مۆدێرن دەڵێ کە خودا مردوە، خودا چیتر لەگەڵ ئینسان و لەگەڵ کۆمەڵگاکاندا نییە، ئینسان بە تەنها و بە ڕووتی و بەبێ دەستێوەردانی ئاسمان مێژووی خۆی دەژی، بەتەنها دەرگیریی دونیا و پەیوەندییەکانە و جگە لە خۆیشی کەسێکی تر نییە بە هانایەوە بگات. مردنی خودا لای نیتشە مردنێکی حەرفی و فیزیایی نییە، بەڵکو ڕووداوێکی کولتووری و شارستانییە و پابەستە بە لەدایکبوونی فەرهەنگ و دونیایەکی تەواو نوێ و

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٢.

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٢.

جیاوازەوە لەو دونیایەی دین یان مەسیحیەت لەناویدا باڵادەست بووە. یەکەمین جار کە نیتشە باس لە مردنی خودا دەکات لە پەرەگرافی ۲۵ کتێبی "زانستی شادومان"دا باسی دەکات:

"ئایا تۆ لەو دێوانەیەت نەبیست، کە بە ڕۆژی ڕووناک بە چرایەکەوە، بە بازاڕدا ڕۆیشت و بە بەردەوامی لەبەرخۆیەوە دەگریا و دەیوت: من بۆ خودا دەگەڕێم، من بۆ خودا دەگەڕێم... بەدەم گریانەوە دەیوت: خودا لە کوێیە؟

من دەبێت بە ئێوە بڵێم، ئێمە خودامان کوشت، من و تۆ خودامان کوشت. ئێمە هەموومان بکوژی ئەوین... خودا مردوە، خوداوەند مردوە و ئێمە ئەومان کوشت."

ڕەنگە لە مێژووی فەلسەفەدا هیچ پەرەگرافێک بە ڕادەی ئەم پەرەگرافەی نیتشە بەناوبانگ نەبێت و زۆر جار فیکری نیتشە خۆشی هەر بەم پەرگرافەدا دەناسرێتەوە، لە کاتێکدا بانگەشەی مردنی خودا لە سەدەی نۆزدەهەمدا لەناو بیرکردنەوە و لەسەر زاری زۆرێک لە ئەندامانی نوخبە خوێندەوارەکەی ئەو کاتەی ئەوروپادا بوو، بەڵام کەس نەیوێراوە بەو ڕاستەوخۆیی و ئاشکرایی و بێترسییەی نیتشەوە باسی بکات. هۆکاری ئەم مردنەش گەشەکردنی زانستە سروشتییەکان و ڕۆشنگەربوون و کۆتاییهاتنی بیرکردنەوەی میتافیزیکی و خورافییە. باڵادەستبوونی ئەو ڕوانینە زانستییە کە نیشانی ئەدات لە پشتی ئەم دونیا بەرچاو و بەرجەستەیەوە، لە پشتی بوونی تەجریبی دیاردەکانەوە شتێکی دیکە بوونی نییە، نە خودایەک، نە بەهەشت و جەهەنەمێک، نە لێپرسینەوە و دادگایەکی گەردوونیی گەورە. خودا لای نیتشە ئەو بوونەوەرە

دروستکراوەیە کە ڕەوایەتیی بە لاوازی و ترسنۆکیی ڕۆحی و عەقڵیی مرۆڤ دەبەخشێت و وای لێ دەکات بە ئیرادەیەکی ئیفلیجەوە بەناو ژیان و پەیوەندییەکاندا تێپەڕێت. خودا بە پیرۆز و موقەدەسکردنی ئیرادەی لاوازە لەناو مرۆڤدا، ئیرادەیەک کە نەیەوێت و نەخوازێت ڕیسک بکات و ئازادانە بژیی. خودا تەعبیرە لە هەموو ئەو شتانەی کە دژ بە ژیانن، کۆکردنەوەی هەموو خواست و ویست و کردەیەکی دژ بە ژیان و دژ بە سەربەخۆیی مرۆڤە لە خاڵێکدا. بە باوەڕی نیتشە خەڵەتاندنی مرۆڤ بە دین، بەوەی کە دونیایەک لە پشتی دونیای ئێستاوە و ژیانێک لەدوای ئەم ژیانەوە هەیە، تاوانێکی گەورەیە بەرانبەر بە مرۆڤایەتی. ئەو قیامەتەش کە دین باسی دەکات هەوڵدانێکە بۆ لەبیربردنەوەی ژیان و لغاوکردنی مرۆڤ لەم جیهانەدا، کە نیتشە وەک تاقە جیهان وێنای دەکردن و دەیناساند.

لای نیتشە مردنی خودا مانای مردنی زۆر شتە، یەکێک لەوانە مردنی دینە، مانای نەمانی گرنگیی دینە وەک بەها و نرخ و وەک سیستمێکی ئەخلاقییش. مانای نەمانی شتێکە لە دەرەوەی مرۆڤدا کە بتوانێت بە مرۆڤ بەها و نرخ و مانا ببەخشێت و پێی بڵێت باش و خراپ کامەیە، پێی بڵێت چۆن بژی، ڕاستی و ناڕاستی چین و کامەن. کۆتاییهاتنی هەموو سێنتەرێکە لە دەرەوەی مرۆڤ خۆیدا بتوانێت ئاراستەیەک بە مرۆڤ ببەخشێت و پەنجە بۆ ئاسۆیەک ڕابکێشێت. مردنی خودا تەنها مردنێکی تیۆلۆژیی نییە، واتە مردنێک نییە تەنها لەناو دین خۆیدا ڕوو بدات، بەڵکو کێشەیەکە تووشی بەها هەرە سەرەکی و بنەڕەتییەکان و تووشی فەرهەنگ و تووشی

هەقیقەت و مەعریفە و عەقڵ و پێناسەکانی خراپەکاری و چاکەکارییش دەبێت. قەیرانێکە ڕووی لە گشتێتیی ژیانی مۆدێرن و پێگەی ئینسانی مۆدێرنە لەناو دونیادا. نیتشە ئەم جارِی مردنی خودایە دەخاتە سەر دەمی کەسێکی شێت، بەڵام کردەی کوشتنی خودا دەداتە پاڵ لەدایکبوونی زانست و مەعریفەی مۆدێرن. لەدوای مردنی خوداوە شتێکی جێگیر و نەجووڵاو و نەخلیسکاو نامێنێتەوە، هەموو بەها و نرخەکان لەوە دەکەون وەک بەها و نرخێکی چەسپاو بمێننەوە و یەک بەدوای یەکدا هەڵدەوەشێنەوە و ویران دەبن. مرۆڤ پێویستە خۆی بەهاکانی خۆی بەرهەم بهێنێت و ژیان خۆی بکاتە کانگای مانا و نرخ و بەهای تازە. نیتشە ئەم دۆخە دڵتەنگکەر و پڕ پەژارەیە ناو دەنێ نیهلیزم، واتە عەدەمیەت. بەڵام عەدەمیەتێک کە تیایدا مرۆڤ دەتوانێت ئازاد بێت و لەژێر فشار و جەبری ئەو بەها ئەخلاقییە خنکێنەرانە ڕزگاری ببێت کە دین دروستی کردن و بەسەر مرۆڤدا سەپاندوونی. بەها و نرخێک کە ئیشی سەرەکییان ئەوەیە ژیان هەژار و کەمنرخ بکەن و بوون بەتاڵ بکەنەوە و پێی بڵێن کە ژیان جگە لە بەدبەختی و قەدەر و ئازار و زەحمەتچەشتن شتکی دیکە نییە.[1] نیهلیزم وەک دۆخێک مرۆڤ تیایدا لەوە بەئاگا بێت کە هیچ نرخ و بەهایەک ئەبەدی و ناکۆتا نییە، هیچ هەقیقەتێکیش نەمر نییە، هیچ باوەڕێکیش جێگیر و نەگۆڕ و هەتاهەتایی نییە. ئەگەرچی هەریەکێک لەم ڕاستییانە ڕاستییەکی ئازاربەخشە و

---

1 -Williams, R. Robert (2012). Tragedy, Recognition, and the Death of God. Studies in Hegel and Nietzsche. Oxford University Press. P. 263-264

مرۆڤ لە دوودڵی و گومان و نادڵنیاییەکی ئازاراویدا جێ دەهێڵێت، بەڵام ئەمە ئەو دۆخە تازەیەیە کە دروست بووە و ڕێگایەکی پێ نییە بۆ گەڕانەوە بۆ دواوە. نیهلیزم مرۆڤ مەحکوم دەکات سەری بۆ خوارەوە دابگرێت و سەیری جیهان و ناوەوەی خۆی بکات، واز لە سەیرکردنی ئاسمان بهێنێت و لەناو تاریکییە ناوەکییەکانی خۆی و تاریکییەکانی جیهاندا بەدوای دروستکردنی بەها و مانای نوێوە بێت. ئەمەش کۆتایی مێژوویەک و سەرەتای مێژوویەکی نوێیە، داپچڕانێکی گەورەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

دەرەنجامە سەرەکییەکەی ئەم مردنەش ئەوەیە کە ئینسان لەناو جیهان و مێژوودا بە تەنهایە، کەسی تری لەگەڵدا نییە، نە خودا و نە هیچ بوونەوەرێکی باڵای تر، تەنها خۆی و ئیرادە و ویست و خواستەکانی خۆی لەگەڵە و بەس. ئەوەیشی ئەرکی ئەوە وەک فەیلەسوفێک ئاگادارکردنەوەی مرۆڤە لەم ڕاستییە تۆقێنەرە، ڕاستیی ئەوەی خودا مردوە و ئینسان بە تاقی تەنها لەناو جیهاندا ماوەتەوە، هێزێکی ئاسمانی نییە بیپارێزێت یان ڕێگای نیشان بدات یان پێی بڵێ چاکە و خراپە کامەیە. ئەوەی مرۆڤ هەیەتی و لەگەڵیدایە، جگە لە هێزی ئیرادەی خۆی، ئینسانەکانی تری ناو جیهانە. مرۆڤ لەناو جیهانێکی نیهلیستیی عەدەمیدا فڕێ دراوە و ئەوە ئەرکی خۆیەتی بەسەر ئەو عەدەمیەتەدا زاڵ ببێت. دین ئامرازێکی سەرەکییە بۆ ڕاکردنی مرۆڤ لە جیهان، بۆ ڕاکردنی لە خۆی وەک مرۆڤ، مرۆڤی ناو ئەم دونیا بێدین و بێخودایە، دەبێت فێری ئەوە ببێت کۆتایی بە هەردوو ڕاکردنەکە بهێنێت: هەم ڕاکردن لە جیهان و هەم ڕاکردن لە

خـودی خـۆی.

نیتشـه تەنهـا ڕەخنـه لـه خورافیبـوون و ناڕاسـتیی ڕوانینـی دینـی ناگرێـت، بەڵکـو ڕەخنەیەکـی زۆر تونـد لـەو ڕۆڵـەش دەگرێـت کـه دیـن بـه درێژاییـی مێـژوو لـه ژیانـی ئینسـاندا بینیویەتـی، واتـه ڕەخنـەی نیتشـه تەنهـا لـه ناوەرۆکـی دیـن نییـه، بەڵکـو لـەو ڕۆڵ و وەزیفەیەشـه کـه لـه مێـژووی مرۆڤایەتیـدا بینیویەتـی. لـەم ئاسـتەدا نیتشـه دیـن بـه گشـتی و مەسـیحیەت بەتایبەتـی بـه جۆرێـک لـه ئەخلاقیاتـەوه گـرێ ئـەدات کـه بـه "ئەخلاقیاتـی کۆیلـه" نـاوی دەبـات. نیتشـه پێـی وایـه ئـەوەی دینـەکان بەرگریـی لـێ دەکـەن عەقڵ و ئەخـلاق و هەڵوێسـتی کۆیلەکانـه، ئەخلاقیاتـی ئینسـانه تەسـلیمبوو و بێئیرادەکانـه، ئەخلاقیاتـی ئەوانەیـه کـه ترسـنۆکن و ناوێـرن و توانـای ئەوەیـان نییـه ژیـان وەک موغامەرەیەکـی گـەورەی پـڕ مەترسـی و چاوقایمـی و سـەرچڵی وێنـا بکـەن. لەباتیی ئیرادەی دەسـەڵات، ئیرادەی ئازارچەشـتن و تەسلیمبوون بەهێز دەکات. ئازارچەشـتن وەک پاداشـتێک بـه هەسـتکردن بـه گونـاه، کـه دیـن بەقووڵـی لەنـاو مرۆڤـدا دەیچێنێـت. دیـن هەڵگـری ئەخلاقیاتـی ترسـێکی سـەرتاسـەرییه، تـرس لـه خـودا، لـه ژیـان، لـه لـەش، لـه سـێکس، لـه عەشـق. نیتشـه لـه شـوێنهاوەرەوه ئـەو بیرۆکەیـه قـەرز دەکات کـه پێـی وایـه بەهێزتریـن پاڵنـەر لـه سروشـتی مرۆڤدا ئیرادەی دەسـەڵاته، گەڕانـه بـەدوای دەسـەڵات و هێزدا، خواسـتی بەهێزبوون و دەسـەڵاتهەبوونه، هەم بۆ کۆنترۆڵکردنی خـود خـۆی و هـەم بۆ کۆنترۆڵکردنـی ئەوانـی تریش. لـه دیدی نیتشـەدا مەسـیحیەت لـه ڕووی مێژووییيـەوه ڕەنگدانـەوه و دەربـڕی ئـەم ئیـراده و خواسـتی دەسـەڵاتەیه، بـەڵام کێشـەکه

لەوەدایە مەسیحیەکان لەوەدا سەر نەکەوتن کە دەسەلات بگرنە دەست و ململانێکەیان دۆڕاندا و پێگە ئینسانی و کۆمەلایەتییەکەیان بۆ پێگەی کۆیلە دابەزی. ئەمەش وای کرد گەشە بە جۆرێک لە ئەخلاقیات و سیستمی بەها بدەن کە نیتشە ناوی "ئەخلاقی کۆیلە"ی لێ دەنێت. ڕەگەزی سەرەکیی ناو ئەم ئەخلاقی کۆیلەبوونەش بریتییە لە ڕق یان بوغز، ڕق لەوانەی کە دەسەلاتیان هەیە و بەهێزن و نمایشکردنیان وەک مرۆڤی هەلە و کەمنرخ و بێڕەوشت، بەلام نمایشکردنی خود خۆی وەک بوونەوەرێکی ڕاستەقینەی خاوەن ویژدان، کە لە ڕووی ئەخلاقییەوە بەرزتر و بەنرخترە لەوانی تر.[1] بەم مانایە مرۆڤی دینی ئەو مرۆڤەیە کە ململانێکانی دەسەلاتی دۆڕاندوە و لە پێگەی دۆڕاندنەوە سەرزەنشت و ڕەخنەی براوەکان دەکات. دین ئەو دونیا ڕەمزی و فیکرییەیە کە ئەم سەرزەنشتەی تیادا ئەنجام ئەدرێت، ئەو درۆ گەورەیەیە کە مرۆڤ هەلدەخلەتێنێت و وای لێ دەکات بچووک و کۆیلە بێت، نەوێرێت بژی و خۆی بەهاکانی خۆی دابهێنێت. دین لەم دیدە نیتشەییەدا بەرهەمی تۆلەکردنەوەی دۆڕاو و کۆیلەکانە لە مرۆڤە بەهێز و ڕیسککەر و چاوقایمەکان، ئەوانەی دەوێرن موغامەرە بکەن و داهێنەر بن. دین تەعبیرە لە ئەخلاقیاتی گاگەل و گەمژەکان، مرۆڤە نزم و سەتحییەکان، دژ بە ڕۆحە سەرکەش و ڕەخنەیی و سەربەخۆکان. هەموو ئەمانە وا دەکەن کە ژێرخانی سەرەکی و کۆلەکە بنەڕەتییەکانی دین

---

١ - بڕوانە:
Nietzsche, Friedrich (1967). *On The Genealogy of Morals*. New York: Vintage Books.

ڕق بێت، ڕق لە کەسانی بێباوەڕ و سەربەخۆ. ئەوانەی کە گوایە لە قیامەت و ژیانی دوای مردندا لەلایەن خوداوە سزا ئەدرێن و پارچەپارچە و هەلاهەلا دەکرێن و بۆ هەتاهەتایی لەناو ئاگری جەهەنەمدا دەسووتێنرێن. هەرچی پیاوانی دینە، ئیتر لە قەشە سادەکانەوە بیگرە بۆ ئەوانی تریان کە پێگە دینییەکەیان بەرزترە، کەسانێکی نەخۆش و پڕ ڕق و بوغزی هەمەلایەنن، درۆزن و نەزان و ژەهراوی و سەدان ڕوون، جنسێکی توفەیلین کە لەسەر پەژارە و ترس و لاوازیی کەسانی تر دەژین.

لە بەرانبەر ئەم جۆرە ئینسانە دینییەدا نیتشە بانگەشەی لەدایکبوونی ئینسانێکی تازە دەکات، کە لاوازی و بێئیرادەییەکانی ئینسانی دینی لەناو خۆیدا کۆتایی پێ هێنابێت و بووبێت بە کەسێکی داهێنەر، کەسێک بەتەنها و بەبێ خودا دروستکەر و ئەندازیاری ژیانی خۆی بێت و خۆی هێڵە گشتی و تایبەتەکانی ئەو ژیانە دابڕێژێت و دایان بهێنێت و ڕێکیان بخات و ئاراستەیان بکات. لای نیتشە ئەم بوونەوەرە تازەیە، ئەم مرۆڤە نوێیەی ناو دونیای مۆدێرن، کەسێکە بەبێ خودا، بەبێ دین، بەبێ دڵنیایی، لەوە بەئاگایە لەدوای مردنی خوداوە تەنهایە و ئەوەی ماوەتەوە تەنها خۆی و ئیرادەی ژیانە لەناو خۆیدا. لای ئەم فەیلەسوفە "مرۆڤی باڵا" شوێنی مرۆڤی دینی دەگرێتەوە، ئەم مرۆڤە باڵایە کە لای نیتشە دواهەمین مرۆڤە، کەسێکە لە مەسیحیەت ڕزگاری بووە، لەدەست ئەخلاق و دەزگا و پیاوانی دین ڕزگاری بووە، کەسێکە دینی بەجێ هێشتوە و ماڵئاوایی لە خودا کردوە و بەپێی ئیرادەی ژیان و خواستی بەهێزبوون و دەسەڵات

و خواستەکانی غەریزە و جەستە دەژی و دەجوولێت. لە ڕاستیدا وێنەی ئینسانی بێخودا یەکێکە لە وێنە هەرە سەرەکییەکانی ناو فیکری نیتشە، گەرچی ئەم وێنەیە تەنها لە کتێبی "زەردەشت وەها دووا"دا بەتەواوی بەرجەستە بووە. ئینسانی بێخودا، وەک ئینسانێکی تەنها، کە خۆی سەرداری ژیان و ئەخلاق و بیرکردنەوەی خۆیەتی. کەسێک کە خۆی هەقیقەتەکانی خۆی دادەهێنێت و لە پیاوانی دین و شوانەکانی ناو کۆمەڵگاوە وەریان ناگرێت. دەزگا دینییەکان پێی ناڵێن چی بکات و چۆن بژی، خۆی خۆی دادەهێنێت و خۆی دەبێتە نووسەری ژیانی خۆی. کتێبی "زەردەشت وەها دووا"ی نیتشە کتێبێکە دژ بە دین بەگشتی و دژ بە مەسیحیەت بەتایبەتی. نیتشە ڕقێکی گەورەشی بەرانبەر بە دینی جولەکە هەبوو، ئەم ڕقەش لەوێوە سەرچاوەی گرتبوو کە دینی جولەکە هۆکاری لەدایکبوون و دروستبوونی مەسیحیەتە، بەبێ ئایینی جولەکە نەدەکرا مەسیحیەت لەدایک ببێت و بەهاکانی مەسیحیەت، کە نیتشە زۆر دژیان بوو، بە دونیایدا بڵاو ببێتەوە. بۆیە مرۆڤی باڵا، مرۆڤی نادینی، مرۆڤی سەردەمە تازەکان، مرۆڤێکە هەڵگری ئەو ڕق و بوغز و ترسە دینییە نییە. مرۆڤێک نییە خودا یەک جار دروستی کردبێت و فڕێی دابێتە جیهانەوە و دواتر لە قیامەتدا لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات. مرۆڤی باڵا مرۆڤێکە خۆی خۆی دروست دەکات و هەرگیز دەست لەو دروستکردنەش هەڵناگرێت، هەرگیز لە حاڵێکدا ڕاناوەستێت، بەردەوام لە دۆخی بوون بە شتێکی نوێ و تازەدایە، لەوە ناترسێت سەیری گومان و تەنهایی و دوودڵییەکانی خۆی بکات، هەمیشە لە دۆخی جەنگێکی

بەردەوامدایە لەگەڵ هەموو ئەو بیر و بۆچوونانەی باس لە نەمری و ژیانی جاویدانە دەکەن، چ لەسەر زەوی و چ لە ئاسماندا. لە سودفە و ڕێکەوت و ئازارە کوتوپڕەکانی ناو ژیان ناترسێت و لە نرخیان کەم ناکاتەوە، لەبەردەم ڕەهەندە توند و ناجێگیر و فەوزەوییەکانی ژیاندا ناچەمێتەوە. مرۆڤی باڵا، مرۆڤی دوای کۆتاییهاتنی دین و مردنی خودایە.

**مارکس و دین**

هیگڵ و فیورباخ و نیتشە تاقە سێ فەیەلەسوفی سەدەی نۆزدەهەم نین کە نەک تەنها ڕەخنەیەکی توند و فرەلایەن لە دین دەگرن و وەک جۆرێک لە خورافەت و وەهم نیشانی ئەدەن، بەڵکو هاوکات پێ لەسەر ئەوەش دادەگرن کە دین کۆتایی پێ دێت و دەبێت بە بەشێک لە ڕابردووی مرۆڤایەتی. لەم ئاستەدا و لای ئەم نووسەرانە سەدەی نۆزدەهەم سەدەی دڵنیابوونە لە کۆتاییهاتنی دین و شوێنگرتنەوەی بە سەرکەوتنەکانی زانست و فەلسەفە و عەقڵ. بێگومان ئەمانە وەک سێ کەسایەتیی دژەدینیی سەدەی نۆزدەهەم بەتەنها نین، بەڵکو چەندان کەسایەتیی خاوەن کاریگەریی گەورەی تر لەو سەدەیەدا هەن، کە بەرگری لە هەمان دیدی دژەدین دەکەن و ئەمانیش پێیان وایە سەردەمی دین لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کۆتایی پێ هاتوە، یان سەردەمێکە بوونی نامێنێت و بەسەر دەچێت. لەوانەش کارل مارکس (١٨٠٨-١٨٨٣) و ئۆگست کۆمت (١٧٩٨-١٨٥٧) و ئەمیلی دورکهایم و ماکس ڤێبەر و سیگمۆند فرۆید. لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا بە درێژایی باس لە بۆچوونەکانی ئەمیلی دورکهایم و ماکس ڤێبەر دەکەین. لێرەدا دەمەوێت زۆر بەکورتی لەسەر دیدی مارکس و

ئۆگست کۆمت بۆ دین بوەستم.

مارکس لەسەر هەمان ئەو هێڵەی فیورباخ پێشنیاری دەکات و لە هەمان دیدگاوە لە دین دەڕوانێت. لە سەرێکەوە دین وەک هۆشیارییەکی هەڵە، وەک وەهم و خورافەت، وەک ئایدیۆلۆژیا و بەشێک لە سەرخانی کۆمەڵگا وێنا دەکات، بەڵام لەوەدا لە فیورباخ جیاوازە، کە زۆر زیاتر بە دین ڕەهەندێکی سایکۆلۆژیی گرنگ دەبەخشێت و وەک دیاردەیەکی سایکۆلۆژیی مامەڵەی دەکات، بەتایبەتی وەک جۆرێک لە دڵدانەوەی دەرونیی ناڕاست و وەک هەوڵێکی سایکۆلۆژیی بۆ تەحەمولکردنی نوقسانییە گەورەکانی ژیان لەناو سیستمە چینایەتییە چەوسێنەرەکاندا. مارکس، وەک فیورباخ، پێی وایە ئەوەی دینی دروست کردوە مرۆڤ خۆیەتی و هیچ پەیوەندییەکی بە بوونی خودایەکەوە لە ئاسمان نییە. لە ڕاستیدا هاوکێشەکە لای مارکسیش تەواو پێچەوانەی لێکدانەوە دینییەکەیە بۆ بوونی خودا و پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و خودا. لەلای مارکس؛ ئەوە خودا نییە کە مرۆڤی دروست کردوە، بەڵکو ئەوە خەیاڵ و حەز و ویست و ئارەزووەکانی مرۆڤە خودای دروست کردوە.[1] مرۆڤ لەسەر وێنەی خواستراو و تەمەنناکراوی خۆی وێنەیەک بۆ خودا دروست دەکات. مرۆڤ حەزی بەوەیە بوونەوەرێکی بەهێز و هەمەتوانا بێت، بۆیە لەسەر بنەمای ئەو حەزە وێنەیەک بۆ خودا دروست دەکات وەک بوونەوەرێکی بەهێز و هەمەتوانا.

1 Besten, den Leen (2011). Illusie of verlichting. Kritiek op en betekenis van religie.

بڕوانە ل ٥٢، ٥٣، ٥٤

مرۆڤ لە دیندا وێنەی خودا وەک مرۆڤێکی پێرفێکت و بەهێز و بێهەڵە لەناو خەیاڵ و سایکۆلۆژیای خۆیدا دروست دەکات و بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاسمان. خودا ئەو وێنە بەئایدیالکراو و خواستراوەیە کە مرۆڤ بۆ دڵدانەوەی خۆی و وەک ئامرازی گەڕان بەدوای سوکناییەکی دەروونیدا، دروستی دەکات. بەم مانایە وێنەی خودا هەمان وێنەی ئینسانە، بەڵام ئینسانێکی پێرفێکت، کە بەرز کراوەتەوە بۆ ئاسمان، دین خۆیشی دروستکەری دونیایەکی خەیاڵییە، کە مرۆڤ بۆ دڵدانەوەی خۆی و بۆ تەسکینیدان بە ئازار و پەژارە سەرزەمینییەکانی دروستی کردوە. لە دیدی مارکسیشدا دین یەکێک لە سەرچاوە سەرەکییەکانی نامۆبوونی مرۆڤە لە خودی خۆی و وێنەیەکی ژێرەوژوور و پێچەوانە بۆ دونیا دەکێشێت. مرۆڤ لە دیندا واقیعێکی فانتازی، بەهەشتێک، لە ئاسماندا دروست دەکات، کە تیایدا لەپاڵ خودایەکی پێرفێکتدا وەدیهاتنی هەموو ئەو چاوەڕوانی و حەز و خەونانەی تێدایە کە لەسەر زەوی نەهاتوونەتە دی و وێران کراون. بۆ گەیشتنیش بەم بەهەشتە ئەوەی لەسەر مرۆڤە ئەنجامی بدات، دانبەخۆداگرتن و تەحەمولکردنی بێبەشی و نایەکسانی و زوڵموزۆرەکانی ئەم دونیا کاتی و کورتتەمەنەیە. ئەم دانبەخۆداگرتنە ڕەچەتەیەکە بۆ خۆئامادەکردن و گەیشتن بەو دونیایەی تر، کە دونیایەکی ئەبەدیی پڕ چێژ و حەزی وەدیهێنراو و بەزم و سەفای ژیانێکی جاویدانە و هەتاهەتاییە. لەم ئاستەدا مارکس و فیورباخ هەمان وێنەیان بۆ دین هەیە و هەردووکیان وەک جۆرێک لە هۆشیاریی هەڵە و ناڕاست دەیبینن.

خاڵی ناکۆکی نێوان مارکس و فیورباخ لەوەدایە کە مارکس پێی وا بوو ڕەخنەی فیورباخ لە دین تەنها لە ئاستی ڕەخنەکردنی دیندا ماوەتەوە، تەنها ڕەخنەیەکی تیوری و فەلسەفییە لە دین خۆی، وەک شێوازێک لە جیهانبینی، لە کاتێکدا ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێت ڕەخنەکردنی ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەیە کە وا دەکات مرۆڤ بەبەردەوامی پێویستی بە دین هەبێت.[1] دینێک کە دڵی مرۆڤ بداتەوە و مژدەی ژیانێکی باشتر بە مرۆڤ ببەخشێت، وای لێ بکات بتوانێت تەحەمولی نەهامەتییەکانی ژیانی سەر زەوی و ناو مێژوو بکات. بەکورتییەکەی دین وەک تلیاکێک کە مرۆڤ بێهۆش و بێئاگا بکات و وای لێ بکات بتوانێت ئازارەکانی ژیانی سەرزەمینی لەیاد بکات بۆ ئەوەی بتوانێت درێژە بە ژیانی ڕۆژانەی بدات، بۆ ئەوەی هیوایەکی هەبێت، هیوای ئەوەی لە ئاسماندا ژیانێکی پڕ چێژ و نەمریی هەتاهەتایی بژی. بەم مانایە دین لای مارکس وەڵامێکی هەڵەیە بە پرسیارێکی ڕاست. پرسیارە ڕاستەکە ئەوەیە ئێمە بۆ هێندە بەدبەخت و چەوساوە و بێبەشین؟ ئەم هەموو پەژارەیە چییە لە ژیانماندا دروست بووە؟ وەڵامە هەڵەکە ئەوەیە ئەمە قەدەرێکی خوداییە، شتێکە لە دەستی مرۆڤ خۆیدا نییە، بەڵام قەدەر و پەژارەیەکی کورتە و لەودیویەوە بەختەوەرییەکی ئەبەدی لە ئاسماندا چاوەڕوانمانە. ئەم خاڵەیە وا دەکات مارکس باوەڕی وا بێت هەموو ڕەخنەکردنێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی دونیا بە ڕەخنەکردنی دین دەست پێ بکات. ئەرکی ئەم ڕەخنەیە

---

١ - بڕوانە:

Kern, W. (1974). Het humanistisch atheïsme. In: Rahner, K. e.a. Is er nog vraag naar God. Over het functieverlies van de godsdienst. Hilversum: Gooi en Sticht. P. 9-57.

ئەوەیە بە مرۆڤ بڵێت چاوەڕوانی دونیایەکی وەهمی لە ئاسماندا مەکە، خەریکی باشترکردن و جوانکردنی ئەو دونیایە بە کە تیایدا دەژیت. بەلام ئەم ڕەخنەیە دەبێت ڕەخنەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسیی بێت، نەک تەنها ڕەخنەیەکی تیوریی دین نەبێت وەک جۆرێک لە خەیاڵ و بیرکردنەوەی هەڵە و ناڕاست. لە ڕاستیدا مارکس باوەڕی وایە کە ڕەخنەکردنی دین وەک دین کارە سەرەکی و گرنگەکە نییە، ململانێکەش هەر لە بنەڕەتەوە لەگەڵ دین خۆیدا نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەو هەلومەرجە مێژووییەدایە کە وا لە مرۆڤ دەکات پێویستی بە دین بێت. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە ئایا چ هەلومەرجێکی کۆمەلایەتی و سیاسی و مێژوویی لە پشتی گەڕاندنەوەی بەردەوامی مرۆڤەوەیە بۆ دین. چونکە وەک مارکس دەنووسێت: "دین ئاه و نزوولەی بوونەوەرێکی زوڵملێکراوە لە دونیایەکی دوژمنکارانەدا، دڵی دونیایەکی بێدڵ و ڕۆحی دونیایەکی بێڕۆحیشە."هەر دوای ئەو دێڕانەش دەنووسێت: "لەباربردنی بەختەوەریی دینی وەک بەختەوەرییەکی خەیاڵی، بنەمای گەیشتنی مرۆڤە بە بەختەوەریی ڕاستەقینە. داواکردن لە خەڵک بۆ ئەوەی واز لەو وەهم و خەیالاتەی خۆیان لەسەر هەلومەرجی ژیانی خۆیان بهێنن، مانای ئەوەیە واز لە هەلومەرجێک بهێنن کە پێویستی بە وەهم و خەیاڵەت هەیە بۆ مانەوەی. لەبەر ئەوە ڕەخنەکردنی دین لە جەوهەری خۆیدا ڕەخنەگرتنە لەو دەربەندی فرمێسکە کە دین پرشنگەکانیەتی".[١] لە هەموو ئەم تێکساتانەدا مارکس ماهیەتی دین و ڕۆڵەکانی

١ - بڕوانە:
Marx, K. 1976. Itroduction to A Contribution to the Critique of Hegel's Philosophy of Right. V.3. New York, Collected Work. .

زۆر بەتوندی بە ڕەگوڕیشە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو دونیایەوە گرێ ئەدات کە تیایدا دروست بووە، بەو ساتەوەختە مێژووییە تایبەتەوە گرێ ئەدات کە دین تیایدا ئامادەیە. ئەو ساتە مێژووی و ئەو دونیایانەش لە دیدی مارکسدا سات و دونیای چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی و چینایەتی و بێبەشکردنێکی گەورە و بەردەوامی ئینسانە لە بەختەوەری، دونیایەکە بە هۆی جیاوازیی چینایەتی و چەوساندنەوەی بەردەوامەوە بووە بە دونیای بەرهەمهێنانی پەژارەی بەردەوام. وێناکردنی دین وەک "دڵی دونیایەکی بێدڵ"ڕەخنەکردنی دین لە ڕەخنەی تێکست و کەلەپوورە دینییەکانەوە دەگوازێتەوە بۆ ڕەخنەکردنی ئەو دونیا بێدڵەی پێویستی بە دینە بۆ مانەوەی، دونیایەک دڵی نییە و بەزەیی و دادپەروەری و هاودەردی و هاریکاریی تێدا نەماوە. بە گۆڕین و دەسکاریکردنی ئەو دۆخە کۆمەڵایەتی و نائینسانییە پڕ چەوساندنەوە و بێبەشکردنەی کە ئامادەیە، ئەو ژێرخانە کۆمەڵایەتییەش دەگۆڕێت کە دین تیایدا چالاکانە ئامادەیە و مرۆڤ وەک پەناگایەکی سایکۆلۆژی و وەک جۆرێک لە هۆشیاریی هەڵە بۆی دەگەڕێتەوە. لێرەوە مرۆڤی دینی لای مارکس مرۆڤێکی زوڵملێکراو و چەوساوەیە، بەڵام ڕەگوڕیشە دونیاییەکانی چەوسانەوە و بەدبەختییەکانی خۆی ناناسێت. لەباتیی ئەوەش لەسەر زەوی بە گژ زوڵم و چەوساندنەوەدا بچێتەوە و ژیانی خۆی بگۆڕێت و دونیایەکی باشتر دروست بکات، لە دیندا دونیایەکی وەهمیی بێکێشە و پێرفێکت دروست دەکات و بەختەوەربوونی خۆی بۆ ئەو دونیایە هەڵدەگرێت. لەباتیی ئەوەی بەسەر لاوازییەکانی خۆیدا سەر بکەوێت، خودایەکی هەمەتوانا لە ئاسماندا دروست دەکات و تۆڵەی

نەهامەتی و ناهەقییەکانی سەر زەوی بەو دەبەخشێت. دین لەم ڕوانینەدا هەم ئایدیۆلۆژیایەکە کە ڕەوایەتی بەو دۆخە پڕ پەژارە و چەوساندنەوەیە دەبەخشێت، هەم یۆتۆپیایەکیشە بەوەی دونیایەکی خەیاڵی دروست دەکات کە مرۆڤی دینی پێی وایە ڕۆژێک لەبەردەمی خوداکەیدا بۆی دەگەڕێتەوە تیایدا قووڵترین شێوەکانی بەختەوەری و کامڵبوونی ئینسانییانە دەژی.[1] بەڵام مرۆڤی دینی هەرگیز تاکەکەسێکی دابڕاو و ئەبستراکت نییە، جەوهەرێکی مێژوویی نەگۆڕ نییە، بەڵکو بوونەوەرێکی کۆنکریتە، سەر بەم یان بەو چین و گروپ و پێگەی کۆمەڵایەتیی تایبەتە. تاکەکەسی دینی و نادینی بوونەوەرێکی بایۆلۆژی نییە، بەڵکو ڕووداوێکی مێژووییە. بوونی کەوتۆتە ناو مێژووەوە و هۆشیارییشی بەرهەمی ئەو مێژووەیە. وەک وتم لای مارکس مرۆڤ مانای جیهانی مرۆڤ، جیهانی مرۆڤیش ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتەیە کە تیایدا دەژی. ئەوەی دین دروست دەکات ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتەیە کە دین وەزیفەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژیی دیاریکراوی تێدا دەبینێت و بەشێکە لەو پێکهاتە ئایدیۆلۆژییەی لەو کۆمەڵگا و دەوڵەتەدا ئامادەیە.

خاڵێکی گرنگی دیکە لە پەیوەندیدا بە دینەوە وێناکردنی مارکسە بۆ مرۆڤ خۆی کە وێناکردنێکی جیاواز لەوەی لای فیورباخ لە ئارادایە. لەلای مارکس؛ مرۆڤ دیاردەیەکی بایۆلۆژی نییە، بوونێکی بانمێژوویی و ئەبستراکتیشی نییە، بوونەوەرێکیش نییە کورت بکرێتەوە بۆ خاوەنی عەقڵ و هەستکردن بە شێوەیەکی ئەبستراکت، بەڵکو بوونەوەرێکی

1 -Besten, den Leen (2011). Illusie of verlichting. Kritiek op en betekenis van religie ٥٤ ل

مێژوویی و کۆمەڵایەتییە و هەمیشەش لە فۆرمی مرۆڤێکی کۆنکریتدا ئامادەیە. ئینسان لای مارکس بوونەوەرێکی ئەبستراکت نییە، بەڵکو هەمیشە ئەندامی ئەم یان ئەو چینی کۆمەڵایەتییە و لەناو ئەم یان ئەو فۆرمی دابەشکردنی کار و شێوازی بەرهەمهێنان و سەرخانی فیکری و ئایدیۆلۆژیدا ئامادەیە. لەم خاڵەشدا ڕەخنەی ئەو لە فیورباخ ئەوە بوو کە گرنگی بە ڕەهەندە کۆمەڵایەتی و مێژووییە کۆنکریتییەکانی مرۆڤبوون نادات و بەڕەهایی تەماشای دەکات. بەم مانایە مرۆڤ لای مارکس بیرۆکەیەکی بانمێژوویی و ئەبستراکت و ڕەها نییە، بەڵکو بوونەوەرێکی کۆنکریتیی ناو دونیایەکی کۆنکریتە، مرۆڤ بریتییە لە جیهانی مرۆڤ، ئەم جیهانەش بریتییە لەو دونیا کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی و ڕەمزییەی مرۆڤ لەگەڵ ئەوانی تردا و پێکەوە لەناویدا لەدایک دەبێت و پەروەردە دەکرێت و دەژی و دەمرێت. ئەمەش مانای ئەوەی مرۆڤ بەرهەمی پراکتیکە کۆمەڵایەتییەکانە و هەر ئەو پراکتیکە کۆمەڵایەتییانەش دەتوانن دونیایەک بگۆڕن و تازە بکەنەوە، ئەگەر مرۆڤ پێویستی بە دین بێت، ئەم پێداویستییە پەیوەندیی نییە بە خواستێکی غەریزییی مرۆڤەوە، یان بە جەوهەرێکی گریمانکراوەوە بۆ مرۆڤ، یان بە گریمانکردنی وێنەیەکی گشتیی مرۆڤەوە، یان بە بایۆلۆژیای مرۆڤەوە، بەڵکو پەیوەستە بەو دونیا کۆمەڵایەتییەوە کە تیایدا لەدایک دەبێت و دەژی و گەورە دەبێت و دەمرێت.[1]

مارکس، وەک نیتشە، بوونی دین بە چینە هەژار و

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٢-٥٣

نەدارەکانەوە گرێ دەدات و پێی وایە دین دێت بۆ ئەوەی ژیانی پڕ بێبەشی و پڕ چەوساندنەوە و ئازاراویی ئەم ئینسانانە مانادار بکات و بەهەشتێکی ئاسمانییان بۆ دروست بکات وەک پاداشتێک بەو ژیانە وێرانەی ئەمڕۆ و لێرەدا هەیانە.

بەکورتی، دین لای مارکسیش بریتییە لە ڕستێک وەهم و خورافەت و چاوەڕوانی، کە مژدەی گەیشتن بە بەهەشتێکی ئاسمانی ئەدات و وەک پاداشتێک بەو ژیانە جەهەنەمییەی لەسەر زەویدا بۆ هەژاران و نەداران ساز و دروست کراوە، پێشنیاری دەکات. بەم مانایە مارکس دین بە دونیای دەروونیی ئەو مرۆڤانەوە گرێ ئەدات کە لە کۆمەڵگای چینایەتی و کۆمەڵگای چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتیدا لە ڕیزی خوارەوەی کۆمەڵگادان و پێویستیان بە شتێک هەیە وایان لێ بکات بتوانن بەرگەی ئازار و چارەڕەشییەکانی ئەو دونیا چینایەتییە نایەکسان و نادادپەروەرە بگرن. لەم ڕووەوە دین بەشێکە لە ئایدیۆلۆژیای باڵادەست و فۆرمێکە لە فۆرمە زۆرەکانی هۆشیارییەکی هەڵە لە کۆمەڵگای چینایەتیدا، بەڵام هاوکات مژدەیەکە بە ئایندەیەکی جیاواز و باشتر لەوەی کە هەیە، بە یۆتۆپیایەک لە قیامەتدا کە کۆتایی بە هەموو نەهەماتییەکانی مرۆڤ دەهێنێت. بەمەش دین مژدەی بەختەوەرییەکی وەهمی و خورافی بە مرۆڤ دەبەخشێت و وای لێ دەکات لە ڕێگای چاوەڕوانکردنی ئەم بەختەوەرەییە ئاسمانییەوە ئازارەکانی سەر زەوی لەبیر بکات، یان لانی کەم، وایان لێ بکات کە تەحەمول بکرێن و وەک دۆخێکی کاتی و تێپەڕ سەیر بکرێن. بەم مانایە دین ڕۆڵی دەرمانێک دەبینێت کە ئازارەکان سڕ دەکات، یان لانی کەم کەم و هێوریان دەکاتەوە،

لە کاتێکدا ئەرکی مرۆڤ و هۆشیاریی ڕاستەقینە و شۆڕشگێڕ ئەوە نییە، ئازارەکان هێمن بکەنەوە، بەڵکو ئەوەیە سەرجەمی نەخۆشییەکە، بە ئازارەکانیەوە، بنبڕ بکەن و کۆتاییی پێ بهێنن. بۆ ئەمەش ئەوە بەس نییە دژ بە دین بنووسرێت و پڕوپاگەندەی دژەدینی بکرێت و دین وەک خورافەت و وەهم و گەمژەیی بناسێنرێت، لە ڕاستیدا ئەم جۆرە کارکردنە ناچێتە سەر مەسەلە ڕاستەقینەکان و سەر سەرچاوەی کارەساتەکان. مارکس بەئاشکرا باس لەوە دەکات داواکردن لە مرۆڤ کە واز لە بەختەوەریی وەهمی و بیرکردنەوەی خورافی سەبارەت بە دۆخی ژیان و بوونی خۆی بهێنێت، مانای ئەوەیە ئەو دۆخە بگۆڕێت و کۆتاییی پێ بهێنێت. دونیایەک دروست بکات پێویستی بەو وەهم و خورافەتە نەبێت. بەم مانایە مارکس دژ بە دین نەبوو وەک دین، وردتر بدوێم مارکس کەسێک نەبوو پڕوپاگەندە بۆ نادین و بێخودایی بکات، ئەسڵەن ئەمە مەسەلەی سەرەکیی نەبووە لای ئەو، مارکس دەیویست کۆتایی بەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتییە بهێنێت کە پێویستی بە دینە بۆ مانەوەی خۆی و مانەوەی بوونەوەرە دینییەکان لەو دۆخە مێژووییەدا کە سەروەر کراوە.

مارکس لە کۆمەڵگای ئاییندەدا، لە کۆمەڵگای نەمانی جیاوازییە مادییەکان و نەمانی چینەکان و نەمانی موڵکیەتی تایبەتدا، لە کۆمەڵگای دروستبوونی یەکسانیی تەواو لەنێوان ئینسانەکاندا، واتە لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا، هیچ شوێنێک بۆ دین ناهێڵێتەوە. هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە ئەو زەمینە کۆمەڵایەتییە نایەکسان و پڕ چەوساندنەوەیەی پێویستی

بە دینە بۆ بەخشینی ڕەوایەتیی بە خۆی و بۆ بەخشینی سوکنایییەکی ناوەکی بە مرۆڤەکان، بوونی نامێنێت. ئینسان کە بەهەشتی لەسەر زەوی دروست کرد، ئیتر پێویستی بە بوونی بەهەشت لە ئاسماندا نامێنێتەوە. مرۆڤ کە لە هەموو شێوەکانی نامۆبوون ڕزگاری بوو، لە نامۆبوونی دینییش ڕزگاری دەبێت. کە کۆمەڵگا لە ڕەگوڕیشەوە گۆڕا و سەرلەنوێ بە شێوەیەک دروست کرایەوە کە ئیهانەکردن بە مرۆڤ و چەوساندنەوە و هەڵخەڵەتاندنی تیادا نەمایەوە، ئەودەم شوێنێکیش بۆ دین نامێنێتەوە. لەمەشدا مارکس لە فیورباخ جیاواز بوو، مارکس چارەسەری وەهم و خورافەتی دینیی بە گەشەی هۆشیاریی تاکەکەسەوە گرێ نەئەدا، بەڵکو دەیبەستەوە بە گۆڕان و سەرلەنوێ داڕشتنەوەی کۆمەڵگاوە. لەم ڕووەوە مارکس وەک چۆن باوەڕی وا بوو سەرمایەداری بەحەتمیماڵئاواییی لە مێژوو دەکات و کۆمەڵگای کۆمۆنیستی شوێنی دەگرێتەوە، بە هەمان شێوە باوەڕی وا بوو دینیش ماڵئاوایی لە مێژوو دەکات و سەری ئینسانەکان بەجێ دەهێڵێت و وەک هەڵم لە ئاسماندا ون دەبێت. شوێنی دین لە سەرێکەوە بە زانست و لە سەرێکی دیکەوە بە داهێنانی ئینسانی دەگیرێتەوە، بەڵام لەمانە گرنگتر کۆمەڵگایەک دێتە کایەوە کە پێویستی بە دین نییە بۆ داپۆشینی نوقسانی و عەیبوعارەکانی.

## ئۆگست کۆمت و دین

لە هەمان دیدگای ڕەخنەیییەوە بۆ دین، کۆمەڵناسی

فەرەنسی: ئۆگست کۆمت (١٧٩٨-١٨٥٧)، بەر لە هەموو ئەوانەی لەم بەشەدا باسمان کردن، باس لە دین دەکات و پێگەکەشی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەستنیشان دەکات. کۆمت دین دەخاتە ڕابردووی کۆمەڵگاکان و دەیبەستێتەوە بە ئاستێکی سەرەتایی و دواکەوتووی گەشەکردنی عەقڵی و مەعریفیی ئینسانەوە. ئەو چەندەها جار دژایەتیی خۆی بۆ بیرکردنەوەی ناعەقڵانی و خوداناسی و میتافیزیک دەر بڕیوە و باسی لەوە کردوە کە هەموو چالاکی و بیرکردنەوەکانی مرۆڤ پێویستە بنەما و بناغەیەکی زانستیی هەبێت، بە خودی سیاسەت خۆشیەوە. کۆمت باوەڕێکی گەورەی بە مەسەلەی "پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی" هەبوو، ئەو باوەڕەی کە مێژوو بەسەر قۆناغی جیاوازدا دابەش دەکات و قۆناغە تازەکان بە پێشکەوتووتر و کامڵتر دەزانێت لە قۆناغە کۆنەکان و وێناکردنێک بۆ مێژوو پێشنیار دەکات کە تیایدا مێژوو وەک هێڵێکی ڕاست دەر دەکەوێت، کە خاڵەکانی کۆتایی ئەو هێڵە لە خاڵەکانی سەرەتای هێڵەکە پێشکەوتووتر و بەرزترن. ئۆگست کۆمت مێژووی عەقڵ بەسەر سێ قۆناغی گەورەدا دابەش دەکات و پێی وایە کە لە قۆناغە تازەکانی ئەم مێژووەدا، کە سەدەی نۆزدەهەم سەرەتاکەیەتی، مرۆڤ پێویستی بە دین نامێنێت. ئەو سێ قۆناغانەش کە ئۆگست کۆمت باسیان دەکات "قۆناغی خوداناسی" و "قۆناغی میتافیزیک" و "قۆناغی زانست"ە. مێژووی مرۆڤایەتی لای ئەم نووسەرە مێژووی تێپەڕینە لە قۆناغی خوداناسییەوە بە تێپەڕین بە قۆناغی

میتافیزیکدا بۆ قۆناغی زانست.[1]

بە بۆچوونی ئۆگست کۆمت لە قۆناغی یەکەمدا، کە قۆناغی خوداناسییە، دین بالادەستە و لێکدانەوەی دیاردەکانی دونیاش دەدرێتە پاڵ ویست و ئیرادەی هێزێکی ئاسمانی. لەم قۆناغەدا چارەنووسی مرۆڤ و دیاردەکانی ناو دونیا لە دەستی خودادا دادەنرێت و خودا وەک هۆکار و شیکەرەوەی نهێنیی دیاردەکان وێنا دەکرێت. ئەوەی هۆکاری سەرەتایی و ڕوودانی شتەکانە، یان خودایە یان هێزێکی ئاسمانیی ترە، هێزێکی دەرەسروشتیی کە دیاردەکانی ناو سروشت لێک ئەداتەوە. قۆناغی دین یان خوداناسی، قۆناغی سەرەتای گەشەکردنی عەقڵی مرۆڤایەتییە و سەرەتای سەرەتاکانە، دین سەرچاوەی کۆمەڵێک گریمانەیە کە تەواو فانتازی و خەیاڵییە و پەیوەندییان بە ڕاستییەوە نییە. ئەم قۆناغە قۆناغی سەرەتاکانی بیرکردنەوە و منداڵیی عەقڵە لای مرۆڤ و ئەوەی کە حوکمڕانە خەیاڵ و فانتازیایە. لەم قۆناغەدا مرۆڤ چەندەها جۆر لە دین بەرهەم دەهێنێت، لە دینی فرەخوداییەوە بۆ دینی تاکخودا. لەم قۆناغەدا پیاوانی دین کۆمەڵگا بەڕێوە دەبەن و ئەوانن عەقڵی مرۆڤ ئاراستە دەکەن. سەرەتا و کۆتاییی ژیانی ئەخلاقیی بەدەوری ڕزگاربوون لە قیامەتدا دەسووڕێتەوە. بە بۆچوونی کۆمت ئەم قۆناغە لە دەوروبەری ساڵی ١٤٠٠ کۆتایی پێ دێت.

---

١ - بڕوانە:
Stanford Encyclopedia of Philosophy. August Comte. https://plato.stanford.edu/entries/comte/#CouPosFriMil

ئیتر ئەم قۆناغە گەشە دەکات و مرۆڤایەتی دەچێتە قۆناغی دووهەمەوە، قۆناغی میتافیزیک، کە وەک قۆناغی گەنجی وایە و مرۆڤایەتی قۆناغی منداڵی تێدەپەڕێنێت، بەڵام هێشتا کامڵ نەبووە و پێنەگەیشتوە. ئەمەش قۆناغی ڕێنیسانسە، بە تێپەڕین بە ناو سەردەمی ڕۆشنگەریدا و گەیشتن بە ئایدیالیزمی ئەڵمانیی. لەم قۆناغەدا، کە ئۆگست کۆمت بە قۆناغی فەلسەفەش ناوی دەبات، زمانە دینییەکەی قۆناغی یەکەم گەشە دەکات و دەگۆڕێت بۆ زمانێکی تیوریی ئاڵۆز و لەباتیی باسکردن لە خودا، باس لە ڕۆڵی ڕۆح و عەقڵ و ئیلهام دەکرێت، ئەمانەش وەک کۆمەڵێک چەمکی موجەڕەد و ئەبستراکت بۆ لێکدانەوەی دیاردەکان بەکار دەهێنرێن. لەم قۆناغەدا گەردوون وەک ماشێنێکی گەورە وێنا دەکرێت کە هێزی نادیار بەڕێوەی دەبەن.

لە قۆناغی سێهەمدا، کە بە بۆچوونی کۆمت دواهەمین قۆناغی مێژووی مرۆڤە، مرۆڤ بەتەواوی کامڵ دەبێت و پێدەگات، لۆژیکی زانستی باڵادەست دەبێت و زانست دەبێتە بنەمای تێگەیشتن لە ئینسان و کۆمەڵگا و جیهان، تەکنۆلۆژیا و شۆڕشی پیشەسازی ژینگەی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەگۆڕن و دونیایەکی تەواو نوێ دروست دەکەن. ئەم قۆناغە تازەیە کۆتایی بە دوو قۆناغەکەی تر دەهێنێت و مرۆڤایەتی وەک گشتێک دەچێتە ناو سەردەمی زانست و عەقڵ و تەکنۆلۆژیاوە. جیهان لەم قۆناغەدا دەبێتە موڵکی مرۆڤ خۆی و لە خودا دەسێندرێتەوە. کۆمت ئەم قۆناغە بە بە قۆناغی پۆزەتیڤیزم ناو دەبات، واتە قۆناغی لەدایکبوونی ئەو شێوازە لە مەعریفە

و زانیاری، کە دیاردەکان بە شێوەیەکی زانستی و تەجریبی شی دەکاتەوە و دوور دەکەوێتەوە لە دید و ڕوانینی دینی و میتافیزیکی. لەم قۆناغەدا نەک تەنها زانست و مەعریفەی زانستی گەشە دەکات، بەڵکو گواستنەوەی دەرەنجام و دۆزینەوەکانی ئەو زانستانە بۆ ناو ژیان و بۆ پەیوەندیی ئینسان بە خۆی و بە سروشتەوە دەبێت بە بەشێک لە ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگاکان. هاوکات مرۆڤ چیدی بەدوای بوونی هۆکارێکدا ناگەڕێت کە هەموو دیاردەکان لێک بداتەوە، بەڵکو خەریکی دۆزینەوەی یاسا کۆنکریتییەکانی هەر دیاردەیەک لە دیاردەکانە بەتەنها، واتە مرۆڤ پێ دەنێتە ناو جۆرێک لە ڕێژەگەراییەوە کە وەک ئاکاری مەعریفەی زانستی وێنا دەکرێت.[1] لەم قۆناغەدا زانست ڕاستییە تەجریبییەکان بۆ هەمووان ئاشکرا دەکات و مرۆڤ فێر دەکات لەگەڵ ئەو ڕاستییانەدا بژی. دەسپێکی زانسیش دۆخێک دروست دەکات مرۆڤ واز لە خورافەت و بۆچوونە ناڕاستەکانی بهێنێت و کۆتایی بە فاناتیزم و پەرگیری بێت.

بەکورتی، قۆناغی دین لە فیکری ئەم کۆمەڵناسەدا قۆناغێکە لە ڕابردووی مرۆڤایەتیدا جێگیرە و ئینسانی ئەمڕۆ لە قۆناغی زانستدا دەژی، کە تیایدا لۆژیکی زانست شوێنی دین و شوێنی خورافەتی میتافیزیکیشی گرتوتەوە. ئەوەی شوێنی سەرنجدانە ئەوەیە ئۆگست کۆمت لەباتی دینی تەقلیدییەکان "دینێکی نوێ" دادەهێنێت و ناویشی دەنێت "دینی مرۆڤایەتی" ئەم دینە تازەیە بریتییە لە "زانستی کۆمەڵناسی" خۆی، کە

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو

ئۆگست کۆمت هەندێک جار ناوی "فیزیای کۆمەڵایەتی" ناو دەنێت. لەم دینە نوێیەدا کۆمەڵناسەکان دەچنە شوێنی پیاوە ئایینییەکان و ئۆگست کۆمت خۆیشی وەک سەرۆکی هەموو پیاوە دینییەکان، واتە وەک پاپا یان خەلیفەی ئەم دینە تازەیە، دەناسێنێت و بەرزترین دەسەڵاتی ئەم دینە تازەیە بە خۆی دەبەخشێت.[1]

**سەدەی پێشبینییە گەورەکان**

سەدەی نۆزدەهەم سەدەی کۆمەڵێک پێشبینیکردنی گەورەیە، بەڵام دووان لەو پێشبینیانە لە هەموویان بەربڵاوتر و لە راستیشدا لە هەمووان زیاتر ناڕاست دەر چوون. یەکەمیان پێشبینییەکانی مارکس بوو سەبارەت بە بەرپابوونی شۆڕشی کۆمۆنیستی لە هەموو شوێنێکی دونیادا لەژێر سەرکردایەتیی شۆڕشگێترین چینێک مرۆڤایەتی بەرهەمی هێنابێت، چینی کرێکاران و لەوێشەوە کۆتاییهاتن بە سەرمایەداری وەک سیستمێکی پڕ لە قەیران و نایەکسانی. دووهەمیان پێشبینیی نیتشە بوو بەوەی کە خودا مردوە و مەعبد و پرسگاکانی سەدەی بیستەم و سەدەکانی دواتر مەعبەد و پەرستگای بەتاڵ دەبن. لەباتیی ئینسانی دینی، ئینسانێکی دیکە دروست دەبێت کە خۆی لە شوێنی خودادایە. سەدەی بیستەم هەردوو پێشبینییەکەی بەتاڵ کردوە و ڕێک پێچەوانەکەیانی

---

١ - بڕوانە:
Besten, den Leen (2011). Illusie of verlichting. Kritiek op en betekenis van religie. Vught, Skandalon. p.36-42.

نیشـان داین.

مارکسـییە نادۆگمایـی و کـراوەکان هـەر زوو هەسـتیان بـەوە کـرد کـە پرۆلیتاریـا ئـەو هێـزە شۆڕشـگێڕە نییـە کـە مارکسـیزم چاوەڕوانـی دەکات. مارکـس و ئەنگلـس خۆیـان سـەرەتاکانی بەئەرسـتۆکراتبوونی چینـی پرۆلیتاریـای وڵاتـە پێشـکەوتووەکانیان بینـی و تێبینـی کـرد، بـەڵام پێیـان وا بـوو ئەم دۆخـە هـەم کاتییە و هـەم بۆ بەشـێکی کەمـی پرۆلیتاریـای وڵاتـە پیشەسـازییە گـەورەکان، ڕاسـتە. بـەڵام لینیـن هـەر زوو هەسـتی کـرد ئـەوەی مارکـس و ئەنگلس وەک دۆخێکی کاتـی بینییـان، دۆخێکـی کاتـی نییـە و لـە بنەڕەتـدا نوقسـانەییەکی گـەورە و هەمەلایەنـە، هـەم لـە هۆشـیاریی سیاسـیی پرۆلیتاریادا بوونـی هەیـە و هـەم لـە ئامادەگیی ئـەم چینـەدا بۆ ئەنجامدانـی کـردەی شۆڕشـگێڕی. لای لینیـن پرۆلیتاریـا ناتوانێـت بـە تواناکانـی خـۆی ببێتـە چینێکـی هۆشـیار و شۆڕشـگێڕ، بەڵکـو پێویسـتی بە هێزێک هەیـە لـە دەرەوەی خۆیدا هـەم هۆشـیاریی شۆڕشـگێڕانەی پێ ببەخشـێت، هەم بەرەو کردەی شۆڕشـگێڕی ڕێنمایـی بـکات و بیجووڵێنێـت. ئـەو هێـزە دەرەکییـەش پارتـی پێشـڕەوی لینینییـە. بـەڵام لـەدوای لینیـن خۆیـەوە بەشـێکی زۆری مارکسـییەکانی دوای جەنگـی جیهانیـی دووهـەم، هەمـوو خەونێکیـان سـەبارەت بـە شۆڕشـگێڕبوونی پۆرلیتاریـا وەک خودێکـی شۆڕشـگێڕ لەدەسـت دا. بەرچاوتریـن نموونـەی ئـەم مارکسـییانە تیـۆدۆر ئەدۆرنـۆ و ماکـس هۆرکهایمـەری سـەر بـە قوتابخانـەی فرانکفۆرتـن. ئـەم دوو نووسـەرە لـە کۆتاییـی کتێبـی: "*دیالێکتیکی ڕۆشنکەری*"دا بـە خوێنـەران دەڵێن: ئـەوان

ئەم کتێبەیان نووسیوە و پەیامەکەی دەخەنە ناو بوتڵێکەوە و بوتڵەکەش تووڕ ئەدەنە ناو دەریاوە. ئەمەش وەک هێمایەکی ڕاستەوخۆی ئەو دوو نووسەرە بۆ ئەو ڕاستییەی کە لە دونیای دوای جەنگی جهیانیی دووهەمدا بکەرێکی کۆمەلایەتیی شۆڕشگێڕ نەماوە ئەوان بتوانن پەیامەکەیانی ڕووبەڕوو بکەنەوە.

لە هەمان کاتدا چەمکی "هۆشیاریی ساختە" بوو بە یەکێک لە چەمک و تێزە سەرەکییەکانی ناو مارکسیزم، ڕۆزا لۆکسمبۆرگ (١٨٧١-١٩١٩) ژنە مارکسیستی ئەڵمانی کە هێزە ڕاستڕەوەکان لە ئەڵمانیادا کوشتیان، یەکێک بوو لەو مارکسییانەی کە زوو بۆی دەر کەوت شۆڕشی پرۆلیتاری و گۆڕانی شۆڕشگێڕانە لەناو کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا بەڕێوە نییە، بەڵکو دونیای داگیرکراو لەلایەن ئیمپریالیزمەوە ئەو جێگەیەیە کە هێزی شۆڕشگێڕ دروست دەکات، لۆکسمبۆرگ ئەم هێزە شۆڕشگێڕە ناو دەنێت "پرۆلیتارییەکی دەرەکی،" کە دواتر مارکسییەکانی تر گەشەی پێ ئەدەن و ناوی "جیهانی سێ" لێ دەنێن.

### دەرەنجام

بەکورتی سەدەی نۆزدەهەم سەدەی دروستبوون و گەشەکردنی ئەو ڕوانینانەیە کە پێیان وایە مرۆڤایەتی لە ساتەوەختێکی مێژوویی نوێدا دەژی، کە تیایدا زانست و عەقڵ و فەلسەفە جێی دین دەگرنەوە و مرۆڤ خۆی لە سەرجەمی ئەو خورافەت و چەپاندن و بەڵێن و چاوەڕوانییە وەهمییانە

ڕزگار دەکات کە لە مێژوودا بوونیان هەبووە. سەدەی نۆزدەهەم لە دیدی ئەم نووسەرانەدا سەدەی دروستبوونی زانستە بەگشتی و سەدەی لەدایکبوونی زانستی کۆمەڵناسییە بەتایبەتی، کە تیایدا ڕاڤەکردنی چۆنیەتیی لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن و چییەتیی ئەو کێشانەیە کە ئەو دونیایە هەیەتی، دەبێتە بابەتی سەرەکی. لە ساڵانی دواتری سەدەکەدا بەشی هەرەزۆری ڕوانینی ئەو فەیلەسوفانەی باسمان کردن بۆ دین دەگوازرێنەوە بۆ ناو زانستی کۆمەڵناسی و لقە زانستێکی سەربەخۆش دروست دەبێت بە ناوی "کۆمەڵناسیی دین"ەوە. تێزەی سەرەکیی ناو ئەم بەشەی کۆمەڵناسییش دەبێتە گەشەدان بە دیدی ئەم فەیلەسوفانە کە تێزەی لاوازبوونی دینە لەناو دونیای مۆدێرندا. لە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا بە درێژیی دەگەڕێینەوە سەر ئەم تێزەیە، بەڵام با جارێ لە فەسڵی داهاتوودا لەسەر لەدایکبوونی زانستی کۆمەڵناسی بوەستین کە دەبێتە شوێنی لەدایکبوونی پارادایمی "بەعەلمانیبوونی دونیا".

ئەوەی دەمەوێت لێرەدا وەک خاڵێکی گرنگ ئاماژەیەکی خێرای پێ بکەم، ئەوەیە کە مەبەستی ئەم بەشە ئەوە نەبووە و نییە دید و بۆچوونی ئەو فەیلەسوف و نووسەرانە لەسەر دین هەڵسەنگێنێت و بەرگری لەم یان لەو دیدیان بکات. مەسەلەکە ئەوە نییە، بۆ نموونە بزانین، ئایا دیدی مارکس بۆ دین ڕاستە یان ناڕاست، کورت دەهێنێت و سادەیە یاخود زانستی و هەمەلایەنە، ئایا ڕەخنەی نیتشە لە دین ڕەخنەیەکی ڕاستە یان گریمانێکی ناڕاست و نامێژوویی نمایش دەکات.

وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە مەبەستی ئەم بەشە و ئەم کتێبە نییە. مەبەستی ئەم بەشە نیشاندانی ئەو خاڵە هاوبەشەیە کە لەنێوان ئەو نووسەرە جیاوازانەدا ئامادەیە، ئەو خاڵی پێداگرتنە لەسەر ئەوەی کە سەردەم و ڕۆژگاری دین کۆتایی پێ هاتوە و دونیای مۆدێرن دونیایەکی بێدین دەبێت، یان دونیایەک دەبێت دین لە پەراوێزدا دادەنێت. ئەم دونیایە شوێنی دین بە مەعریفە و زانستی نوێ پڕ دەکاتەوە و مرۆڤی ئەم کۆمەڵگایانە لە دیندا بەدوای هەقیقەت و بەدوای هاریکاری و بەدوای کردەی سیاسیدا ناگەڕێن.

# سەرچاوەکان

Bhatawadekar, Sa (2014). Islam in Hegel's Triadic Philosophy of Religion.Journal of World History, Vol. 25, No. 2/3, pp. 397–424

Besten, den Leen (2011). Illusie of verlichting. Kritiek op en betekenis van religie. Vught, Skandalon.

De Vos, L. (1984). Hgel Begrie van de Religie. Tijdschrift voor Filosofie, 46ste Jaarg., Nr. 2.

Goux، Jean-Joseph (2008). "Untimely Islam: September 11th and the Philosophies of History," SubStance 115.

Jaeschke, Walter (1992)."Philosophical Theology and Philosophy of Religion". New Perspectives on Hegel's Philosophy of Religion, ed. David Kolb (Albany: State University of New York Press, pp. 1–18.

Kern, W. (1974). Het humanistisch atheîsme. In: Rahner, K. e.a. Is er nog vraag naar God. Over het functieverlies van de godsdienst. Hilversum: Gooi en Sticht. 9-57.

Labuschagne, Bart, Timo Slootweg en Rico Sneller (2014). Hegels godsdienstfilosofie en de monotheïstische religies: een acyuele confrontatie. Antwerpen-Apeldorn, Garant

Marx, K. 1976. Itroduction to A Contribution to the Critique of Hegel's Philosophy of Right. V.3. New York, Collected Work

Nietzsche, Friedrich (1967). On The Genealogy of Morals. New York: Vintage Books.

Robert, Williams, R. (2012). Tragedy, Recognition, and the Death of God. Studies in Hegel and Nietzsche. Oxford University Press.

# دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (٢)
# لەدایکبوونی زانستی کۆمەڵناسی

**سەرەتا**

لەدایکبوونـی کۆمەڵناسـی وەک زانسـتێکی سـەربەخۆ، پەیوەندییەکـی گـەورەی بـە مەسـەلەی دروسـتبوونی دونیـای مۆدێرن و بـە گۆڕانـە گەورەکانی پەیوەست بەم لەدایکبوونەوە هەیـە، زانسـتی کۆمەڵناسـی یەکێکە لـەو زانسـتە سـەرەکییانەی کـە مەسـەلەی تیوریزەکردنـی دیاردەکانـی نـاو ئـەو دونیـا مۆدێرنـە دەگرێتـە ئەسـتۆی خـۆی و ئـەو وێنـە گشـتییانە دەکێشـێت کـە بەسـەریەکەوە دیمەنـی ئـەم دونیـا مۆدێرنەمـان نیشـان ئـەدەن. مێـژووی لەدایکبوونـی ڕاسـتەقینەی دونیـا مۆدێرنیش دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی شۆڕشـی فەرەنسـی لـە کۆتاییەکانـی سـەدەی هەژدەهـەم و شۆڕشـی پیشەسـازیی لـە هەمـان سـەدەدا. لـە کتێبێکی گرنـگ و بەناوبانگدا مێژوونووسـی بەریتانـی: کریسـتۆفەر بەیلی، لەدایکبوونی ئـەم دونیایـە دەخاتـە نێوان سـاڵانی ١٧٨٠-١٩١٤ەوە. لـە دیدی ئـەم مێژوونووسـەی دونیـای مۆدێرنـدا لەنێـوان ئـەو سـاڵانەدا کۆمەڵـگای مۆدێـرن وەک دیاردەیەکـی جیهانـی دێتـە کایـەوە، نـەک تەنهـا لـە

خۆرئاوادا، بەڵکو لە بەشێکی گەورەی کۆمەڵگاکانی دونیادا.[1] ئەو گۆڕانانەی لەو ماوەیەدا دێنە کایەوە بە ڕادەیەک گەورە و قووڵ و هەمەلایەنن، کە پێویستییەکی زۆریان بە لێکۆڵینەوە و ڕاڤەکردن هەیە. لە نموونەی ئەو گۆڕانانەش: لەدایکبوونی دەوڵەتی مۆدێرن لە شێوەی دەوڵەتی نەتەوەدا، دروستبوونی شاری گەورە، فراوانبوونی خوێندەواری، گەشەکردنی زانستی و تەکنۆلۆژی، گەشەکرنی چاپەمەنی و هاتنەکایەی شێوازی نوێی هونەر و ئەدەبیات، گەورەبوونی دیاردەی کۆچکردن، گەورەبوونی ڕۆڵی ئامێر، دروستبوونی چینی کۆمەلایەتی نوێ، فراوانبوونی بیرۆکراسیەت، دروستبوونی تاکەکەس و تاکگەرایی، سەرهەڵدانی ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی وەک سۆسیالیزم و لیبرالیزم، هاتنەکایەی ناسیۆنالیزم وەک بزووتنەوەیەکی جەماوەریی گەورە، هاتنەکایەی ئابووریی نوێ، فۆرم و ڕۆڵی نوێ بۆ دین هتد... زانستی کۆمەڵناسی بۆ لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی دیاردەکانی ناو ئەم دونیایە نوێی و ئاڵۆزە دروست و لەدایک دەبێت. لەناویشیاندا لێکدانەوەی پێگەی دین و مەسەلەی گۆڕانی تێگەیشتن بۆ دین و بۆ ئەو ڕۆلانەی کە لە ژیانی کۆمەلایەتیدا دەیگێڕێت، چونکە یەک لە بیرۆکە هەرە سەرەکییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بیرۆکەی لەدایکبوونی سەدەی عەقڵە، کە ڕۆڵی دین پەراوێز دەخات و لە مەسەلە سەرەکییەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و مەعریفی دووری دەخاتەوە.[2]

١ - بڕوانە:
Bayly, C. A. (2004). The birth of Modern World, 1780-1914: Global connections and comparisions. Wiley-Balckwell Publishing.

٢ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٢٥-٣٢٦

**لە ئایدیالەوە بۆ واقیع**

لەگەڵ ئەم لەدایکبوونەشدا وەرچەرخانێک لە فیکری تیوری و زانستیدا دەبینین. لە سەردەمی ئەفلاتون و ئەرستووە ئەو دونیایەی فەیلەسوفان و خوێندەواران پێوەی سەرقاڵ بوون، دونیایەکی ئایدیالی بوو، کە خەونی پێوە دەبینرا و بیر لە دروستکردنەوەی دەکرایەوە، لە کاتێکدا زانستی کۆمەڵناسی سەرقاڵبوونی فیکرە بە ناسین و شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی ئەو دونیایەی ئامادەیە و دروست بووە. ئەم گواستنەوە لە ئایدیالەوە بۆ واقیع ئەو ڕوانینە بنەڕەتییەیە کە لەپشتی لەدایکبوونی زانستی کۆمەڵناسی و زانستە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکانی تریشەوەیە.[1] لە سەرێکی دیکەوە لەدایکبوونی زانستی کۆمەڵناسی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە پرسیارکردنەوە هەیە سەبارەت بە ئێستا و ئایندە و چارەنووسی ئایینەوە، شوێن و پێگەی دین لەناو ئەم دونیا تازەیەدا چییە و چۆنە، چارەنووسی دەزگا دینییەکان بەرەو کوێ دەڕوات، پەیوەندیی دین چی دەبێت لەگەڵ ئەو بوار و کایە تازانەدا کە دێنە کایەوە؟ هتد... زۆربەی کۆمەڵناسەکانی سەدەی نۆزدەهەم لەو باوەڕەدا بوون کە گۆڕانی گەورە بەسەر شوێن و پێگە و ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا هاتووە، شێوازی نوێی پەیوەندی و جۆری تازەی دونیابینی دروست بوون کە دینی نین و هەندێک جاریش دژ بە دینن.

---

١ - بڕوانە:
MACIONIS, J, PLUMMER, K (1997), *Sociology a global introduction,* Prentice Hall Europe

بەسەریەکیشەوە دۆخێکی تازە دروست بووە تەواو جیاواز لەو دۆخەی دین لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا ئامادە بووە. لەم ئاستەدا ئەو پرسیارانەی ئەم زانستە تازەیە سەبارەت بە دین دەیانکات پرسیارگەلێکی لەم بابەتەن: ئایا دین بەشێکە و بەشێک دەبێت لە پرۆسە تازەکانی دروستبوونی ئەم دونیا تازەیە، یاخود کەنارگیر دەبێت و دەکەوێتە پەراوێزەوە، گەر بەتەواویش لەناو نەچێت؟ ئایا دین لەناو ژیانی گشتییدا دەمێنێتەوە و ڕۆڵی ئەو هێزە دەبینێت کە کەرتە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان بەیەکەوە گرێ بدات، یاخود پاشەکشە دەکات و دەکشێتەوە بۆ ناو سنوورەکانی ژیانی تایبەتی تاکەکەسەکان؟ پەیوەندیی نێوان دین و سیاسەت، دین و دەوڵەت، دین و ئەم دونیا مۆدێرنە چی لێ دێت؟

لە بەشی پێشووی ئەم کتێبەدا باسم لە دیدی بڕێک لە فەیلەسوفانی سەدەی نۆزدەهەم سەبارەت بە شوێن و پێگە و ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگا مۆدێرن و تازەکاندا، کرد. لەوە دوام کە ڕوانینی باڵادەست لای ئەوان ئەوەیە کە سەردەم و ڕۆژگاری دین بەسەر چووە و دەسەڵاتی عەقڵ و زانستی نوێ، دەسەڵاتی فیکر و فەلسەفەی مۆدێرن، لەدایکبوونی بوار و دەزگای نادینیی مۆدێرن، دینی بەتەواوی لاواز کردوە و تا دێتیش لاوازتری دەکات و ڕووبەرێکی ئەوتۆ بۆ کاریگەرییەکانی ناهێڵێتەوە. ئەوەشم نیشان دا کە بەشی زۆری ئەو نوخبە فیکرییەی سەدەی نۆزدەهەم باوەڕیان وا بوو کە دین ئایندەی نابێت و لە سەردەمی مردن و کۆتاییهاتنی خۆی نزیک بۆتەوە. ئەگەر سەدەی نۆزدەهەم دوو پێشبینیی گەورەی کردبێت و دوو چاوەڕوانیی بنەڕەتیی

بەرهەم هێنابێت، ئەوا یەکێکیان پێشبینیکردنی کۆتاییی دین و ڕۆڵی دینە لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگیدا و جێگرتنەوەیەتی بە زانست و ئایدیۆلۆژیا تازەکان. پێشبینیی دووهەمیان پێشبینیی کۆتاییهاتنی ناسیۆنالیزم و دەوڵەتی نەتەوە بوو کە گوایە گەشەی کاپیتالیزم کۆتاییان پێ دێنێت. زانستی کۆمەڵناسی پێشبینیی یەکەمیان زۆر بەجدی وەر دەگرێت و دەیکاتە یەکێک لەو ئاسۆ تیۆرییە سەرەکییانەی کە دونیابینیی کۆمەڵناسە سەرەکییەکانی ئەو سەدەیە ئاراستە دەکات.

### لەدایکبوونی تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا"

لەگەڵ لەدایکبوونی کۆمەڵناسیدا وەک زانست، تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا"ش لەدایک دەبێت. ئەم تێزە هەم وەک تێزەیەکی سەرەکیی بۆ لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی چییەتیی مۆدێرنە خۆی و هەم وەک تێزەیەک بۆ لێکدانەوەی شوێن و پێگە و ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا، بەکار دەهێنرێت. واتە لە سەرێکەوە هەوڵ ئەدات پێمان بڵێت دونیای مۆدێرن چ جۆرە دونیایەکە، پرۆسە سەرەکییەکانی چین، جیاوازییەکانی لەگەڵ کۆمەڵگا سونەتییەکاندا چییە. لە سەرێکی دیکەشەوە باس لە پێگە و ڕۆڵی دین لەناو ئەو دونیایەدا دەکات و ئەو گۆڕانکارییانە باس دەکات کە بەسەر دیندا ڕوو ئەدەن، دین وەک شێوازێک لە ڕوانین و تەفسیرکردنی دونیا و وەک دەزگا و وەک بکەری کۆمەلایەتیی تایبەت، وەک سروت و زمان و پراکتیکی دینی، وەک فۆرمی موقەدەس. لە ڕاستیدا تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا لەناو زانستی کۆمەڵناسیدا دەبێت بە

تێزەی سەرەکیی ئەو دوو لێکدانەوەیە و بەرزیشی دەکاتەوە بۆ ئاستی بوونی بە پارادایمێکی مەعریفی. خودی تێزەکەش وەک تێزێکی زانستی نماییش دەکرێت کە باس لە "یاسا"کانی تازەبوونەوەی دونیا دەکات. ئەگەر فەیلەسوفانی وەک هیگڵ و ئۆگست کۆمت و فیورباخ و نیتشە و مارکس لە ئاستی فەلسەفیدا باسیان لە لەدایکبوونی سەردەمی عەقڵ و سەردەمی زانست و سەردەمی فەلسەفە کردبێت و لاوازبوونی دینیان دابێتە پاڵ ئەو گۆڕانکارییانەی لە ئاستی عەقڵی و ویژدانی و مەعریفیدا دروست بوون، لە ئاستی دووریشدا چاوەڕوانیی ئەوەیان کردبێت زانست شوێنی دین بگرێتەوە، ئەوا کۆمەڵناسەکان سەرقاڵی ئەوە بوون ئەو دیاردە و پرۆسە و گۆڕانکارییە دەزگایی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییانە بخوێننەوە کە شوناسی دونیای مۆدێرن دەستنیشان دەکەن و لە دونیای کلاسیک و سوونەتیی جیا دەکەنەوە. ئەم لاوازبوونەی دین و گەڕاندنەوەی بۆ ناو سنوورەکانی ژیانی تایبەت بە پرۆسەی بیرۆکراتیزەکردنی کۆمەڵگا، bureaucratization و پرۆسەی بەشاربوونی دونیا، urbanization و پرۆسەی بەعقەڵانیبوونەوە، rationalization، ببەستنەوە. هاوکات کاریگەریی ئەو گۆڕانکارییانە لەسەر مەسەلەی لاوازبوونی ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا و پاشکەکشەکردنی بۆ ناو سنوورەکانی ژیانی تایبەتی ڕاڤە بکەن. لە سەدەی نۆزدەهەمەوە زانستی کۆمەڵناسیی هەوڵێکی بەردەوام ئەدات چەمک و زاراوە بۆ پرۆسە تازەکان بدۆزێتەوە و شوێنیان لە گشتێتیی ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەستنیشان بکات، وەک چۆن هەوڵی ئەوەش ئەدات ئاکارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەم

قۆناغـە نوێیـەی گەشـەکردنی مرۆڤایەتـی بـە ئـاکاری سـەردەم و قۆناغەکانی بـەر لـە مۆدێرنـە بـەراورد بکات و لـە ڕێگای ئـەم بەراوردکردنـەوە دەرکەوتـە نوێکانـی ئـەو دونیـا تازەیە باشـتر و ئاشـکراتر بناسـێنێت. بـەم مانایـە یەکێـک لـە کارە سـەرەکییەکانی زانسـتی کۆمەڵناسـی، بەراوردکرنـی سـەردەمی مۆدێرن بـوو بـە سـەردەمی بـەر لـە مۆدێرن و بەراوردکردنـی کۆمەڵگا تـازەکان بـوو بـە کۆمەڵـگا تەقلـدی و کلاسـیکییەکان، بـە مەبەسـتی تێگەیشـتن لـە ئاکارە تازەکانـی ئـەو دونیایـەی دروسـت دەبوو. لـەم بەراوردەشـدا سـەردەمی بـەر لـە مۆدێرن و کۆمەڵگاکانـی ئـەو قۆناغـە، وەک سـەردەم و کۆمەڵگایـەک دەر دەکەوتـن کـە گوایـە "کەمجووڵـە" و "نەگـۆڕ" و "جێگیـر" و "بێتازەبوونـەوە" بـوون و دیـن پێـدراو و هێـزی کۆمەڵایەتیـی ژمـارە یەکـی نـاوی بـووە و لـە هەمـوو شـوێن و خانەیەکـی کۆمەڵایەتیـدا ئامـادە بـووە و هۆشـیاریی مرۆڤیشـی بەتـەواوی دەستنیشـان کـردوە. لـە بەرمبـەر ئـەم وێنەیـەدا بـۆ کۆمەڵـگا سـونەتی و تەقلیدییـەکان کۆمەڵناسـەکان وێنەیەکـی تـەواو جیـاواز بـۆ کۆمەڵگا مۆدێرنـەکان دەکێشـن و لـە زۆر ڕووەوە ئـەم وێنەیـە وەک دژەدیـوی کۆمەڵـگا تاقلیدییـەکان و وەک شـتێک تـەواو ناکـۆک بـە وێنـە تەقلیـدی و کلاسـیکییەکانی کۆمەڵگا، نماییشـی دەکەن. لـە پەیوەندیدا بـە دینـەوە کۆمەڵناسـەکان لـە دایکبوونـی کۆمەڵگا مۆدێرنـەکان بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ بـە لاوازبوونـی تـەواوی ڕۆڵـی دینـەوە لـەو کۆمەڵگایانـەدا دەبەسـتنەوە و ئـەم لاوازبوونـەش لـە ئاسـتی فیکریـدا بـە بەهێزبـوون و بڵاوبوونـەوەی عەقڵانیەتـەوە گـرێ دەدەن.[1] لاوازبوونـی ڕۆڵـی

---

١ - بڕوانە:

دین هەم لە گشتێتیی ژیانی کۆمەڵایەتیدا و هەم لەناو یەکە بە یەکەی کایە نوێکانی وەک کایەی زانست و سیاسەت و ئابووری و ئەخلاق و ئەوانی تردا گریمان دەکەن. لەنێوان پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵگا، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەڵێن مۆدێرنیزەیشن و پەراوێزکەوتنی دیندا پەیوەندییەکی بەهێز و حەتمی گریمان دەکەن. لە ڕاستیدا ئەو لاوازبوونە وەک یاسا و مەسەلەیەکی حەتمی پێشنیار دەکەن. بەم جۆرە یەکێک لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی زانستی کۆمەڵناسی دەبێتە وێناکردنی کۆمەڵگای مۆدێرن وەک کۆمەڵگایەک دین تیایدا قورسایی و ڕۆڵی خۆی لەدەست داوە و لەبەردەم پرۆسە گەورەکانی تازەبوونەوەی جیهاندا ناچار بە پاشەکشە کراوە بۆ ناو "ڕووبەری تایبەت"ی ژیانی تاکەکەسی و ڕۆڵ و قورساییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی ئەوتۆی لە "ژیانی گشتی"دا نەماوە. ئەم پرۆسانەش ناو دەنرێن پرۆسەی "بەعەلمانیبوونی دونیا".[١]

کۆمەڵناسی خۆیشی، وەک زانستێکی نوێ و سەربەخۆ، خۆی بە یەکێک لە بەرهەمەکانی ئەم پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیایە دەزانێت، خۆی بە منداڵێکی مەعریفیی ئەو کۆمەڵگایە دەزانێت کە دین تیایدا ئەو هێزەی نەماوە کە لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا هەیبووە. لەم کۆمەڵگا تازانەدا عەقل بەتەواوی ئازاد بووە و دەتوانێت بە جیاواز لە دین و سەربەخۆ لە

---

Weber, M. (1975). Een keuze uit het werk van Max Weber. Deventer, Van Loughum Slaterus

١ - بڕوانە:

Berger, Peter L.(1999). The Desecularization of the World. Washington DC: Ethics and Public Policy Center. P. 2.

جیهانبینیی دینی، کار بکات و کۆمەڵگا و دیاردە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان لە دەرەوەی گریمانە دینییەکاندا لێک بداتەوە. زانستی کۆمەڵناسی خۆی وەک زانستی لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لە ئینسان لەناو کۆمەڵگا نوێکاندا وێنا دەکات، وەک زانستی تێگەیشتن لە ئینسان لەناو دونیا و کۆمەڵگایەکدا دابڕاو لە دین، وەک شێوازی بیرکردنەوەیەکی زانستی بەبێ دین یان ناکۆک بە دین، وەک ئاکاری کۆمەڵایەتیی نوێ و دابڕاو لە دین، وەک دەزگای گەورە و بەهێز بەبێ دین، بەکورتی کۆمەڵناسی خۆی وەک زانستێک وێنا دەکات کە خەریکی قسەکردن و ڕاڤەکردنی کۆمەڵگایە بەبێ خودا، یان بە خودایەکی دوورەپەرێزەوە کە لە مەسافەیەکی دوورەوە لە ئینسان و کۆمەڵگاکان دەڕوانێت و دەست ناخاتە ناو کاری سەربەخۆ و ناو ئازادییەکانی عەقڵی زانستییەوە. بڕێکی هێجگار گەورە لە پۆزەتیڤیزمی سەدەی نۆزدەهەم لەناو ئەم وێناکردنەی کۆمەڵناسیدا بۆ خۆی ئامادەیە و بەم مانایە ڕەگوڕیشە سەرەکییەکانی بەشێکی گرنگی ئەم زانستە و بەشێکی سەرەکی لە تێزەکانی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم. زانستی کۆمەڵناسی لە دروستکردنی ئەم وێنەیەدا بۆ خۆی و بۆ کۆمەڵگاکان، واتە لە بەرزکردنەوەی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا بۆ ئاستی "پارادایم" ڕاستەوخۆ گرێ دراوە بە نووسین و ڕوانینەکانی سێ کۆمەڵناسەوە. سێ کۆمەڵناسی گەورە ڕۆڵێکی هێجگار گەورە و سەرەکی دەبینن لە کێشانی ئەو وێنانەدا و لە سەرخستنی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا، کە بریتین لە ئەمیلی دورکهایمی فەرەنسی (١٨٥٨-١٩١٧) و ماکس ڤێبەری ئەڵمانی (١٨٦٤-

١٩٢٠) و بریان ویلسۆنی ئینگلیزی (١٩٢٦-٢٠٠٤). بەر لەوەی لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا بێمە سەر باسکردنی دیدی ئەم سێ کۆمەڵناسە بۆ شوێن و جێی دین لە دونیای مۆدێرندا، دەمەوێت لێرەدا بەکورتی ماناکانی دەستەواژەی "پارادیم" زۆر بەسادەیی بۆ خوێنەران ڕوون بکەمەوە، تا ئاشکرا بێت مەبەستمان چیە کاتێک دەڵێین "تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا بەرز بۆتەوە بۆ ئاستی پارادایم".

پارادایم بە مانا گشتییەکەی بە کۆمەڵێک تیورە و مۆدێلی بیرکردنەوە دەڵێن، کە بەسەریەکەوە بوون بە چوارچێوە و بونیادی بیرکردنەوە لە ساتەوەختێکی مێژووییدا، ئەوەی پێی دەگوترێت واقیع و ئەوەی وەک واقیع پێناسە دەکرێت، لەناو ئەم چوارچێوەیەدا وەسف دەکرێت و ڕاڤە دەکرێت. پارادایم باس لە دروستبوونی مۆدێلێک یان شێوازێکی تایبەت لە بیرکردنەوە و پراکتیکی زانستی دەکات کە توانیویەتی باڵادەست ببێت و چەمک و دید و بۆچوونەکانی خۆی وەک بەڵگەنەویست لێ بکات و دۆخێک دروست بکات تیایدا هیچ یەکێکیان قابیلی گومانلێکردن نەبن. چەمکی پارادایم وەک چوارچێوە و مۆدێلی باڵادەستی بیرکردنەوە لە ساڵانی شەستەوە گرێ دراوە بە کارەکانی زانا و فەیەلسوفی ئەمەریکی تۆماس کونەوە (١٩٢٢-١٩٩٦). ئەم پیاوە پێی وایە گەشەی مەعریفە سەبارەت بە دونیا و کۆمەڵگا و دیاردەکان لەناو پارادایمەکاندا ڕوو دەدات. بەڵام پارادایمەکان قابیلی گۆڕان و تازەبوونەوەن، دەشێت پارادایمێک بێت و بڵادەست ببێت، بەڵام دوای ماوەیەک شوێنی بە پارادایمێکی دیکە

بگیرێتەوە.[1] بە بۆچوونی تۆماس کون؛ لە کاتی پیادەکردنی میتۆدە زانستییە باڵادەستەکاندا بەردەوام زانیاری و تێبینی و سەرنجی نوێ دروست دەبن، کە لەناو چوارچێوەی پارادایمە باڵادەستەکەدا جێیان نابێتەوە یان قابیلی تێگەیشتن نین، بۆیە بە زیادبوون و کەڵەکەبوونی ئەم زانیاری و مەعریفە نوێیانە دۆخێک دروست دەبێت کە پارادایمە باڵادەستەکە ناتوانێت لەناو مۆدێلەکانی خۆیدا شوێنیان بۆ بکاتەوە. ئەمە وا دەکات ئەو پارادایمە بکەوێتە ژێر پرسیارەوە و بەمەش سەرەتای دروستبوونی پارادایمێکی نوێ بێتە کایەوە. لای تۆماس کون پارادایم وێنەیەکی دیاریکراوی جیهان دروست دەکات، کە دەشێت بە گۆڕانی ئەو پارادایمە، وێنەیەکی تری جیهان دروست ببێت تەواو جیاواز لە وێنە باڵادەستەکەی.[2] بەم مانایە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا وەک پارادایم مانای بوونی ئەو تێزەیە بە چوارچێوەی سەرەکیی بیرکردنەوە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکان و لەپرۆسەی تازەبوونەوەی دونیا و لە شوێن و جێی دین لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، بە جۆرێک نەکرێت گومان بەرانبەر بە تیورە و مۆدێل و وێنەکانی ئەم پارادایمە دروست بکرێت و تێزەکانی وەک ڕاستی و هەقیقەتی زانستی قبووڵ بکرێن. زانستی کۆمەڵناسی بەگشتی و "کۆمەڵناسیی دین" بەتایبەتی ئەو دوو کایە زانستییەن کە تا کۆتاییی ساڵانی شەست و سەرەتای ساڵانی هەفتای سەدەی

١ – بڕوانە:

Kuhn, S. Thomas S (1962). *The structure of scientific revolutions* ( 1st. ed., Chicago: Univ. of Chicago Press) .

٢ –هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بیستەم ڕۆڵێکی سەرەکی لە دروستبوون و بڵاوکردنەوە و پاراستنی ئەم پارادایمەدا دەبینن. بەڵام وەک پێشتریش وتم، لە کۆتاییی ساڵانی شەستەوە ئەم پارادایمە و مۆدێل و گریمانەکانی دەکەونە بەر ڕەخنەیەکی هەمەلایەنەوە، کە وا دەکەن لە دونیای ئەمڕۆدا پارادایمێکی نوێ لەدایک بوو بێت، کە تەواو ناکۆک بە پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا. لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا بەدرێژایی باس لە دروستبوونی ئەو پاردایمە تازەیە دەکەین.

بێگومان "پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا" هەندێک زانیاریی گرنگمان لەسەر هەندێک ڕەهەندی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان و لەسەر شێوازی هەڵسوکەوت و بیرکردنەوەی هەندێک ئینسانی ناو ئەم کۆمەڵگایانە پێ دەڵێت، هەندێک شتمان لەسەر هەندێک دۆخ و پێگە و ڕۆڵی تایبەتی دین لەو کۆمەڵگایانەدا پێ دەڵێت، هەندێک ڕاستیمان سەربارەت بە گۆڕانی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و موقەدەس و پێگەی دەزگا و بکەرە دینییەکان لە هەندێک شوێن و بەشی دونیا و لای هەندێک هێز و کەرتی کۆمەڵایەتی پێ دەڵێت، بەڵام هاوکات وێنەیەکی گشتگیر و وەسفێکی ناڕاست و هەڵسەنگاندنێکی هەڵەی بەشێکی گەورەی ئەو دونیایەش بڵاو دەکاتەوە کە لە سەردەمی مۆدێرنەدا دروست دەبێت. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا ئەم مەسەلانە بەوردی شی دەکەینەوە. ئەوەی دەکرێت لە ئێستادا بگوترێت ئەوەیە کە دروستکەرانی ئەم پارادایمە کوڕی سەردەمێکی مێژوویی تایبەت و قۆناغێکی تایبەتی گەشەکردنی زانست و ئاستێکی تایبەتی گەشەکردنی مۆدێلە

زانستییەکان و سەلیقە دینییە تایبەتەکانن، کوڕی سەدەی نۆزدەهەم و ئەو ڕۆحیەتە تایبەتەن کە لەو سەردەمەدا دروست دەبێت. بۆیە ئەوەی کە لەسەر سەردەمەکەی خۆیان دەیڵێن لە زۆر ئاستدا قابیلی ڕەخنەکردن و پێداچوونەوەن، بە پێداچوونەوە بە پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا خۆیشیەوە. وەک ئەنترۆپۆلۆژێکی بەناوبانگ دەڵێت: پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا لە گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی خۆیدا دۆخێک دروست دەکات تیایدا دین وا دەر بکەوێت پێویستی بە لێکۆڵینەوە و بەرخوردی نوێ نەبێت، پێویستی بە گۆشەنیگای نوێ و خوێندنەوەی جیاواز نەمابێت، چونکە ئێمە لەپاڵ تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا پێشوەخت، لانی کەم لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، هەمووشتێک دەربارەی دین و پێگەی لەناو کۆمەڵگاکان و تەنانەت ئایندەشی دەزانین، لە دوای تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیاوە شتێکی نوێ لەبارەی دینەوە نەماوە ئێمە پێویست بێت بیناسین و فێری ببین.[1] ئەم پارادایمە پێمان دەڵێت تیورەی عەلمانیەت هەموو پرۆسە سەرەکی و حەتمییەکانی ناو دونیای مۆدێرنی بۆ دەستنیشان کردوین، لەوانەش، بۆ نموونە، پرۆسەی جیابوونەوەی دین و سیاسەت لەیەکتری، پاشەکشەکردنی دین بۆ مەجالی تایبەت، کەمبوونەوەی قورسایی دین لە کۆمەڵگادا، لاوازبوونی بەردەوامی کاریگەرییەکانی دین لەسەر ژیانی کۆمەلایەتی.

---

١ - بڕوانە:

Casanova, Jesé a(1994). Public Religions in the Modern World. Chicago: University of Chicago Press.

لە ئاستی دووریشدا شوێنگرتنەوەی دین بە زانست و بە پرۆسە بەردەوامەکانی بە عەقلانیکردنی دونیا و "داماڵینی سیحر لەسەر جیهان". ئەم پارادایمە سێ گریمانەی سەرەکی پێشکەش دەکات و گریمانەکانیشی وەک واقیعێکی بەرجەستە و کۆنکرێتی قابیلی نەفینەکردن و گومانلێنەکردنیش نیشان ئەدات. ئەو سێ گریمانەیەش، لانی کەم لە سەردەمی ماکس ڤێبەرەوە، بوون بە گریمانەی سەرەکیی ناو بڕی هەرەزۆری کۆمەڵناسان و رۆشنبیران و سیاسەتمەداران و فەیلەسوفان. ئەو سێ گریمانەیەش بریتین لەمانە:[1]

یەکەم، زیادبوون و گەورەبوونی ڕووبەری جیاوازیی بونیادی لە کۆمەڵگادا، واتە دروستبوونی کایەی کۆمەڵایەتیی جیاواز لە دەرەوەی دەسەڵاتی دیندا، لەوانەش دروستبوونی کایەی ئابووری، کولتووری، زانست، سیاسەت، ئەخلاق، هتد... کە هەریەکێکیان بەهای تایبەت بە خۆیان و لۆژیکی ناوەکیی تایبەت بە خۆیان بەڕێوەی دەبات، نەک لۆژیک و بەهای دینی. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە با سەیری خێڵ بکەین، کە یەکەی کۆمەڵایەتیی سەرەکییە لە کۆمەڵگا نامۆدێرنەکاندا، خێڵ لە یەک کاتدا هەم یەکەیەکی ئابووری، هەم یەکەیەکی دینی و هەم یەکەیەکی سیاسی و هەم یەکەیەکی کۆمەڵایەتییە. لە دونیای مۆدێرندا ئەم یەکانە لە یەکتری جیا دەبنەوە و هەریەکەیان سەربەخۆیی خۆی وەر دەگرێت و ڕووبەری گەورەتر و فراوانتر و ئاڵۆزتر داگیر دەکات. لە پەیوەندیدا بە تێزەی بەعەلمانییبوونی دونیاوە، لە باسکردنی پەیوەندیی نێوان دین و

---

١ - بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو

زانستدا باس لە جیاکردنەوەی دین و زانست لەیەکتری دەکرێت. ئەم جیاکردنەوەیەش زۆر جار وەک ڕزگاربوونی زانست لە دەستی دین و ئازادبوون لە فشارەکانی وێنا دەکرێت.

دووهـەم، بەشەخسـیبوون و بەکەسـیبوونی دیـن لەنـاو کایـەی دینـی خۆیـدا، واتـە گۆڕانـی دیـن خۆشـی لـە دینێکـی دەسـتەجەمعی و کۆییـەوە بـۆ دینێکی تاکەکەسـی، گۆڕانـی لـە دینێکـەوە خەریکی ڕێکخسـتنی دونیـا و ئەنجامدانـی سـرووتی دەرەکییـەوە بێـت بـۆ دینێـک کـە بـە ویـژدان و دەرونـی تاکەکەسـەوە گرێ دراوە. ئەمـەش زۆر جـار وەک پێشـمەرجی دروسـتبوونی دەوڵـەت و سیاسـەتی مۆدێـرن و لیبـرال وێنـا دەکرێـت.

سـێهەم، لاوازبوونـی بـاوەڕی دینـی و کەمبوونـەوەی گرنگییـە کۆمەڵایەتییەکانی بـاوەڕ و ئینتیمـا و کردەوەدینییـەکان، کەمبوونـەوەی قورسـایی و کاریگەریـی دەزگا دینییەکانیـش لەسـەر تاکەکـەس و کۆمەڵـگا. ئەمـەش وەک پرۆسـەیەکی بەرفراوانـی گەشـەکردن و بەرەوپێشـەوەچوونێکی ئینسـانی و گەردوونـی وێنـا دەکرێـت.

ئەوەشی ژێرخانی ئەم سێ گریمانەیە پێک دەهێنێت بریتییە لە دروسـتبوون و بڵاوبوونـەوەی پرۆسـەی بەپیشەسـازیبوون، لەدایکبـوون و بڵاوبوونـەوەی زانسـت و داهێنانـی تەکنۆلۆژیـای مۆدێـرن، لەدایکبوونـی عەقڵیـەت و میتـۆدی زانسـتییانە بـۆ بیرکردنـەوە. ئەمانـە ئـەو گۆڕانکارییانـەن کـە وا دەکـەن ڕۆڵـی دین لەکۆمەڵگادا لاواز بێت و لە باشـترین دۆخدا کورت ببێتەوە بـۆ دیاردەیـەک لـە دیـاردە زۆرەکانـی نـاو "ژیانـی تایبەتـی"ی

تاکەکەسەکان. ئەم سێ گریمانەیە کۆڵەکە سەرەکییەکانی تێزەی بەعلمانیبوونی دونیا پێک دەهێنن. یەکەمیان پێ لەسەر زیادبوونی بڕی جیاوازیی لە دونیای مۆدێرندا دادەگرێت و باس لە ڕزگاربوونی بەشێکی زۆری کایە کۆمەڵایەتییەکان لە فشاری دین دەکات، لەپێش هەمووانەوە ڕزگاربوونی کایەی سیاسەت. دووهەمیان پێداگرتن لەسەر گەشەی زانست و هاتنەکایەی عەقڵانیەتێکی زانستیی نوێ هاوشان بە پرۆسەی بەتاکەکەسیبوونی دین. سێهەمیش لاوازبوونی ڕۆڵی کۆمەڵایەتیی دین و دروستبوونی ئینتیمای نوێ بۆ مرۆڤ کە ئینتیما دینییەکەی لاواز دەکات.

ئەم پارادایمە پێی وایە ئاراستەی گەشەی کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان ئاراستەی گواستنەوەیە لە قۆناغی کشتوکاڵی و گوندنشینی نامۆدێرنەوە، بۆ کۆمەڵگای خوێندەواری و پیشەسازی و شارنشینیی مۆدێرن. ئەم گواستنەوەیەش هەمیشە کۆمەڵێک پرۆسە دەخاتەوە کە بە شێوەیەکی حەتمی دەبنە هۆکاری لاوازبوونی دین. دین کە لە قۆناغی کشتوکاڵی و نەخوێندەواری و گوندنشینیدا باڵادەست و هەمەلایەن بووە و هۆکاری یەکێتیی ناوەکیی گروپ و کۆمەڵەکان بووە و دەستنیشانی ئەخلاق و دونیای ڕۆحیی تاکەکەس و گروپ و کۆمەڵەکانی کردووە، لە دونیای مۆدێرندا هەموو ئەو ڕۆڵانە لەدەست ئەدات و بەمەش لە سێنتەری ژیانی کۆمەڵایەتییەوە دەگوازێتەوە بۆ پەراوێزەکانی ئەو ژیانە و خۆشی لە دیاردەیەکی سەرەکی و بەهێزی ناو کۆمەڵگاوە دەگۆڕێت بۆ دیاردەیەکی لاوەکی و پەراوێز.

**دەرەنجام**

بەکورتی، تێزی بەعەلمانیبوونی دونیا، پەیوەندییەکی ناوەکی و ڕاستەوخۆ و حەتمیی لەنێوان لەدایکبوونی مۆدێرنە و لاوازبوونی مانا و ڕۆڵە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و فەرهەنگییە گشتییەکانی دیندا گریمان دەکات، ئەم تێزە پێمان دەڵێت مۆدێرنە دەبێتە هۆی لاوازبوونی دین، دەبێتە هۆی جیاکردنەوەی دین لە سیاسەت و دین لە زانست و دین لە ژیانی گشتی، دەبێتە هۆی لاوازبوون و کەنارگیربوونی دەزگا و ئۆرگان و بکەرە دینییەکان، ڕۆڵی موقەدەسی دینی لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیدا کەم دەکاتەوە و پەراوێزی دەخات. ئەم تێزە لە زاری ماکس ڤیبەرەوە، وەک لە لاپەڕەکانی داهاتوودا دەیبینین، باس لە پرۆسەیەکی گەورە و بەرفراوانی "داماڵینی سیحر لە دونیا" دەکات. ئەم داماڵین و نەهێشتنی سیحرە گەر تەنها یەک ماناشی هەبێت، ئەوە مانای لاوازبوونی تەواوی دین لە دونیای مۆدێرندا دەگەیەنێت. لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا لاوازبوونی دین تەنها لە پەیوەندیدا بە دەوڵەتەوە دروست نابێت، واتە ڕۆڵی دین تەنها لە بەڕێوەبردنی دەزگاکانی دەوڵەت و عەقلانیەتی ئیشکردنی دەوڵەتدا لاواز نابێت، تەنها لە بیرۆکراسیەت دانابڕێت، واتە دین تەنها وەزیفە سیاسی و ئیدارییەکانی لەدەست نادات، بەڵکو لە ئاستی کۆمەڵگاشدا لاواز دەبێت و بە زانست یان بە عەقلانیەت یان بە هونەر و ئەدەبیاتی مۆدێرن یان بە ئایدیۆلۆژییاکان جێی دەگیرێتەوە. تێزی بەعەلمانیبوونەی دونیا هاوکات گریمانی ئەوەش دەکات

کە هەموو نوێبوونەوەیەکی کولتووری و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، نوێبوونەوەیەکی نادینی یان دوور لە دین، یاخود دژ بە دین، دەبێت. لە ئاستی تیۆرەی سیاسیشدا پەیوەندییەکی حەتمی لەنێوان دروستبوونی دیموکراسیەت و عەلمانیەتدا پێشنیار دەکات، لە ئاستە پێوانەییەکەشیدا دژ بە هەموو پرۆسەیەکی بە سیاسیکردنی دین، یان ئەنجامدانی کاری سیاسییە بە ناوی دینەوە.

بەکورتی ئەوەی زانستی کۆمەڵناسیی لە ڕێگای ئەم تێزەوە سەروەری دەکات و بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاستی پارادایم، ئەو کۆمەڵە تیورە و تێز و مۆدێلەیە کە لە سەرەوە باسم کرد، هەموو ئەمانەش لەناو زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا ناوی دەر کردوە. ئەوەی پێویستەخوێنەران لێرەدا بیزانن، ئەوەیە کە لە سەدەی نۆزدەهەم خۆیدا چەندان دەنگ و ڕوانینی دیکەی ناکۆک بەم پارادایمە عەلمانییە بوونی هەبووە، بەڵام قورسایی و هێزی ئەم پارادایمە وای کردوە ئەوان نەبیسترێن و ڕوانینەکانیان نەبێتە بەشێک لەو مۆدێل و تیورانەی کە باس لە دین و پێگەکانی لە دونیای مۆدێرندا دەکات. ئەم نووسەرانە پێیان وا بووە دین هەم ڕۆڵی گرنگ لە کۆمەڵگا مۆدرێنەکاندا دەگێڕێت و هەم لە ژیانی مرۆڤەکانیشدا. بەڵام هەیمەنەی پارادایمی بەعەلمانیبوون بە ڕادەیەک بووە، هەموو ئەو هەوڵە تیورییە جیاوازانەی خستۆتە پەراوێزەوە. لەوانەش بۆ نموونە تێڕوانین و بۆچوونەکانی کۆمەڵناسی فەرەنسی، ئەلێکسی دی تۆکفیل. ئەمە جگە لە دید و بۆچوونەکانی کۆمەڵناسێکی گرنگی وەک کۆمەڵناسی ئەمەریکی پارسۆنس، کە ئەویش لە دەرەوەی

گریمانەکانی پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیادا باسی شوێن و جێ و ڕۆڵی دینی لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەکات. لە ئاستی فەلسەفیشدا سەدەی نۆزدەهەم سەدەی فەیلەسوفێکی گەورەی وەک سۆرێن کیرکیگاردە، کە دین وەک بنەمای سەرەکیی جیهانبینی و ڕوانینەکان بۆ جیهان وێنا دەکات، بە جیهانی مۆدێرنەوە. دەڵێم ئەم هەوڵە تیورییە جیاوازانە هەبوون کە لە دەرەوەی پارادایمی بەعەلمانیبووندا کاریان کردووە، بەڵام ئەم بوونەیان نەبۆتە هۆی دروستبوونی گومان لەو پارادایمە، وەک وتم ڕەخنەکردنی ئەم پارادایمە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بەرفراوان دوا دەکەوێت بۆ ناوەڕاستی سالآنی شەست و دواتر.

# سەرچاوەکان

Bayly, C. A. (2004). The birth of Modern World, 1780-1914: Global connections and comparisions. Wiley-Balckwell Publishing.

Berger،Peter L.(1999).The Desecularization of the World. Ed. Washington DC: Ethics and Public Policy Center.

Berger, Peter (2014). The many altars of modernity. Toward a paradigm for religion in a pluralist age. De Gruyter Mouton.

Casanova, Jesé ª(1994). Public Religions in the Modern World. Chicago: University of Chicago Press.

Kuhn, S. Thomas S (1962). The structure of scientific revolutions. 1st. ed., Chicago: Univ. of Chicago Pres

Macionis,, J, Plummer, K (1997. Sociology a global introduction. Prentice Hall Europe.

Weber, M. (1975). Een keuze uit het werk van Max Weber. Deventer, Van Loughum Slaterus.

# دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (٣)

## ئەمیلی دۆرکهایم

## پێگەی دین لە دونیای مۆدێرندا

# دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (٣)
# ئەمیلی دۆرکهایم
# پێگەی دین لە دونیای مۆدێرندا

**سەرەتا**

لە لاپەڕەکانی پێشوودا لەوە دوام کە سێ زانای کۆمەڵناسی ڕۆڵێکی گەورە و کاریگەر دەبینن لە گۆڕانی تیزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" بۆ پارادایمێکی مەعریفی، واتە گۆڕینی تیورەیەک سەبارەت بە چۆنیەتیی لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن بۆ چوارچێوەی سەرەکیی بیرکردنەوە لە مۆدێرنە و بە یاسای ناوەکیی دروستبوون و گەشەکردن و پێشکەوتنی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان. هاوکات پێشنیارکردنی پەیوەندییەکی حەتمی لەنێوان پرۆسەی تازەبوونەوەی دونیا و لاوازبوونی ڕۆڵی دین لەو دونیایەدا. یەکێک لەو سێ کۆمەڵناسە: ئەمیلی دۆرکهایمی فەڕەنسییە. لەم بەشەدا هەوڵ ئەدەم بەکورتی لەسەر تێڕوانینە سەرەکییەکانی ئەم کۆمەڵناسە بۆ شوێن و جێی دین لە دونیای مۆدێرندا، بدوێم. ئەگەر لە سەدەی نۆزدەهەمدا نیتشە بیری لای چەمکی دەسەڵات و مارکس لای چەمکی ململانێ بێت، ئەوا چەمکی سەرەکی لای دۆرکهایم

چەمکی هاریکارییە، هاریکاریی کۆمەڵایەتیی کەس و گروپ و لایەنە جیاوازەکان لەناو کۆمەڵگادا، بەتایبەتی لە دونیای مۆدێرندا، کە شێوازە کۆن و تەقلیدییەکانی هاریکاریی کۆمەڵایەتیی تیا نەماوە و لە شوێنیدا پێویستە شێوازی نوێی هاریکاری دروست ببێت. لە سەرێکی دیکەوە ئەگەر مارکس و ماکس ڤێبەر باس لەوە بکەن چی کۆمەڵگا پارچەپارچە دەکات و دەیشکێنێت، ئەوا دۆرکهایم باس لەوە دەکات چی کۆمەڵگا بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، دەیهێڵێتەوە. لە دیدی دۆرکهایمدا دین ژێرخانی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیی هاریکارییە لە کۆمەڵگا سوننەتییەکاندا، بەڵام کۆمەڵگا مۆدێرنەکان ئەم ژێرخانە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەی تیادا نەماوە و بووە بە دونیایەکی عەلمانی.

**ئەمیلی دۆرکهایم**

دۆرکهایم (١٨٥٨- ١٩١٧) لە خێزان و ژینگەیەکی دینیدا لەدایک و پەروەردە دەبێت، بەڵام دواتر باوەڕە دینییەکانی لەدەست ئەدات و دەبێتە کەسێکی بێدین و بێباوەڕ. دۆرکهایم وەک بەشێکی زۆر لەخوێندەوارانی سەدەی نۆزدەهەم باوەڕێکی تەواوی بە عەقڵانیەت و بە زانست و بە پێشداوەری و گریمانە گشتییەکانی ڕێبازی ڕۆشنگەری هەبوو. لە ئاستی مەعریفیشدا دینی وەک خورافەت دەبینی و باوەڕی وا بوو ئەوەی دین لە ڕووی فیکرییەوە لەسەر کۆمەڵگا و دیاردە سروشتییەکان دەیڵێت، دەچێتە قاڵبی وڕێنە و خورافەتێکی تەواوەوە. لە بەراوردکردنی دین و زانستدا بەیەکتری دۆرکهایم زانست بە سەرچاوەی زانیاری و مەعریفەی

ڕاستەقینە دەزانێت و دین وەک ئامرازێکی مەعریفیی ناڕاست و هەڵە وێنا دەکرد. بە باوەڕی دۆرکهایم مرۆڤ بۆ تێگەیشتنێکی زانستییانە لە سروشت و لەکۆمەڵگا، پێویستی بەوە نییە بۆ دین بگەڕێتەوە، دین هیچی ئەوتۆی قابیلی باوەڕپێکردنیشی لەسەر ئەو دیاردانە پێ نابەخشێت، لەباتیی دین، مرۆڤ پێویستە بۆ زانستە سروشتییەکان و بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان بگەڕێتەوە. هەقیقەتەکانی دونیای سروشت و دونیای کۆمەڵایەتی، لە ڕێگەی دینەوە نادۆزرێنەوە، بەڵکو لە ڕێگای زانستەکانەوە دەدۆزرێنەوە. بەم جۆرە دۆرکهایم وەک کوڕی خێزانێکی دینی کە باوکی ڕابایەکی جوولەکە بووە، لەدوای تەمەنی بیست ساڵییەوە باوەڕی بە دین نامێنێت.[1]

لەم ڕووەوە بیروبۆچوون و تێگەیشتنەکانی دۆرکهایم جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی هیگڵ و ئۆگست کۆنت و مارکسدا نییە، دۆرکهایم وەک ئەوان هەمان ئەو دیدە عەقڵانییە دووبارە دەکاتەوە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا لای زۆربەی زانا و فەیلەسوفە کۆمەڵایەتییەکان، دیدی باڵادەستە. ئەوەی دۆرکهایم لە بڕێکی زۆر لە زانا و فەیلەسوفە کۆمەڵایەتییەکانی سەدەی نۆزدەهەم جیا دەکاتەوە، بۆ نموونە ئەوەی دورکهایم لە کەسێکی وەک مارکس جیا دەکاتەوە، ئەوەیە ئەو باوەڕی وا بوو ناکرێت دین تەنها بۆ وەهم و خورافەت کورت بکرێتەوە و ناشکرێت بە ناوی وەهم

1 -Jones ،Robert (1986). *Emile Durkheim: An Introduction to Four Major Works.* Beverly Hills, CA: Sage Publications, Inc., 1986. Pp. 12-23.

و خورافەتەوە زەربێکی گەورە بەسەر دین و بەسەر ڕۆڵی دین لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بهێنرێت. دین بە ڕاستەوخۆیی گرێ دراوە بە مەسەلەی پیرۆزی، واتە "موقەدەس"ەوە و بوونی موقەدەسیش بەشێکی گرنگی ژیانی کۆمەڵایەتییە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەگەرچی دۆرکهایم باوەڕی وا بوو کە دین لەئاستی مەعریفیدا وەهم و خورافەتە و تەواو ناکۆکە بە زانست، بەڵام لە ئاستی کۆمەڵایەتی و دەروونی و ڕەمزییدا ئەرک و وەزیفەی تری هەیە کە ناکرێت بە ناوی یەکسانکردنیەوە بە وەهم و خورافەت لەبیر بکرێن.[1] بەڵام دیسانەوە دورکهایم لێرەشدا پشتی تەواوەتی بە دین نابەستێت بۆ ئەوەی مرۆڤ لە دونیای مۆدێرندا تووشی تەنهاکەوتنی کۆمەڵایەتی و لێکدابڕان و ئەوەی ناوی "ئانۆمی"،Anomie ، لێ دەنێت، نەبێت. ئانۆمی بە مانای ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییە ناجێگیرە دێت، کە لە پەککەوتنی بەها و پێوەرە باڵادەستەکانەوە دروست دەبێت، یان وەک ئەنجامی نەمانی ئامانج و مانا و مەبەستێک لە ژیاندا.[2] دورکهایم باوەڕی وا بوو لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دین ئەو ڕۆڵی چیمەنتۆ کۆمەڵایەتییەی بۆ نابیرنێت کە لە کۆمەڵگا سوننەتییەکانتدا بینیویەتی، لەبەر ئەوەی دین لە دونیای مۆدێرندا تا دێت لاواز و پەراوێز دەکەوێت. لەم کۆمەڵگایەدا زانست، بەتایبەتی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و هەم پەروەردەکردنێکی مۆدێرن جێگەی

---

1 -Riley, Alexander (2015). The social thought of Emile Durkheim. Sag Publications

٢ - بڕوانە:

Durkheim, E. (1964). *The division of labor in society.*. New York, Free Press of Glencoe.

دین دەگرنەوە یان پێویستن بۆ ئەوەی هاریکاریکی تاکەکەس بن لەوەدا پەیوەندییەکی تەندروستی لەگەڵ دەوروبەرەکەی و ئەوانی تردا هەبێت و تووشی دۆخی تەنهایی و نەمانی بەها و نرخەکان نەبێت.

**دین و واقیع**

لە دیدی دۆرکهایمدا هەمیشە لەناو دین و لەپشتی دینەوە واقیعێکی تایبەت ئامادەیە، دین هێما بۆ ئەو واقیعە تایبەتە دەکات. بەڵام ئەو واقیعە کە دین هێمای بۆ دەکات، واقیعێکی ئاسمانی یاخود بوون و ئامادەگیی خودایەک لە خوداکان نییە، وەک کەسە دینییەکان تێیگەیشتوون، بەڵکو ئەو واقیعە خودی کۆمەڵگا خۆیەتی. بە مانایەکی تر دۆرکهایم پێی وا بوو ئینسان لە دیندا خودا ناپەرستێت و سەیری ئاسمان ناکات، بەڵکو خودی کۆمەڵگا خۆی دەپەرستێت، ئەو ڕۆحە کۆیی و دەستەجەمعییە دەپەرستێت کە ئینسان دەکاتە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیی ناو ژینگە و دونیایەکی کۆمەڵایەتیی یەکگرتوو. دورکهایم پێی وایە دین "سیستمێکی یەکگرتووی باوەڕ و هەڵسوکەوتە کە پەیوەندییان بە شتە موقەدەسەکانەوە هەیە (...) باوەڕ و هەڵسوکەوتێک کە خەڵک لەناو یەک کۆمەڵدا بەیەکگرتوویی کۆ دەکاتەوە."[1] دین پەرستنی ئەو هێزە یەکگرتووەیە کە کۆمەڵگاکە بەیەکگرتوویی دەهێڵێتەوە. دین ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ دوو بەش دابەش دەکات، بەشێکیان ناو

1 -Durkheim, E. (1954). *The Elementary Forms of Religious Life*. New York: The Free Press. p. 47.

دەنێت موقەدەس و ئەوی تریان ئاسایی و ڕۆژانەیی. ئەوەی لە دینێکدا شتێک دەبێت بە موقەدەس پەیوەندیی بە شتەکەوە نییە، بەڵکو پەیوەنیی بەو کەسانەوە هەیە کە وەک موقەدەس مامەڵەی دەکەن. بە بۆچوونی دۆرکهایم ئەمە وا دەکات دین هەمیشە "شتێکی کۆیی و دەستەجەمعی بێت."[١]

بە مانایەکی تر لە ڕوانینی دورکهایمدا دین نمایشکردنی ئاسمان و خوداکان نییە، بەڵکو نمایشکردنی کۆمەڵگایە بۆ خودی خۆی وەک یەکەیەکی یەکگرتوو و بەهێز، کە هەموو ئەندامەکانی بەیەکتریەوە کۆ دەکاتەوە و هێزێکی گەورەیان لێ دروست دەکات، کۆمەڵگا لە دیندا خۆی لەباتیی خودا دەبینێت و لەباتیی ئیعجاب بۆ خودا ئیعجاب بە خۆی دروست دەکات. بەکورتی ئەوەی لە دیندا ئامادەیە نە خودایە نە دونیایەکی ترە، نە فریشتە و ئەهریمەنە، واتە شتگەلێک نییە لە دەرەوەی کۆمەڵگا خۆیدا و جیاواز لە کۆمەڵگا خۆیشی، ئەوەی ئامادەیە خودی کۆمەڵگا خۆیەتی. ئەم ڕوانینەی دۆرکهایم بۆ دین نزیکە لەو ڕوانینەوە کە فیورباخ و مارکس بۆ دین هەیانە، ئەوانیش پێیان وایە ئەوەی لە دیندا ئامادەیە دروستکردنی خودایەکی بێهەڵە و دونیایەکی پێرفێکت و بێهەڵەیە، کە ڕەگ و ڕیشەکانی لەناو واقیعێکدایە، کە پڕیەتی لە نوقسانی و هەڵە و پەژارە. بەڵام جیاوازیی سەرەکیی نێوان دۆرکهایم و ئەو زانایانەی تر لەوەدایە کە دۆرکهایم ئەرک و وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتی و دەروونیی گرنگ بە دین دەبەخشێت کە لای نووسەرەکانی تر بەو ڕوونییە ئامادە نییە. دۆرکهایم وەک

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٧.

مارکس دین بە ڕەنگدانەوەی کۆمەڵگا دەزانێت، بەڵام لە تێگەیشتنیدا بۆ خودا دیدی ئەو لە دیدی مارکس جیاوازە. ئەگەر خودا لای مارکس، لە ڕاستیدا لای فیورباخیش، بە ئایدیالکردنی سروشتی ئینسان خۆی بێت وەک بوونەوەرێکی تاکەکەسی، واتە خودا بریتی بێت لە وێنەیەکی بێهەڵە و پێرفێکتی ئینسان خۆی، بەڵام بەرزکراوە بۆ ئاسمان، واتە ئینسان خودای لەسەر وێنەی خۆی وەک بوونەوەرێکی داهێنەر و هەمەتوانا دروست کردبێت و لە ئاسماندا دایینابێت، ئەوا خودا لای دۆرکهایم وێنەی تاکەکەسێکی بێهەڵە و پێرفێکت نییە، دورکهایم خودا لە وێنەی تاکەکەسدا نابینێت، نایشوبهێنێت بە مرۆڤ، بەڵکو یەکسانی دەکات بە کۆمەڵگا، بە یەکەیەکی دەستەجەمعی و پێکەوەیی بەهێز و هەمەتوانا. خودا لای دورکهایم خودی کۆمەڵگا خۆیەتی، کۆمەڵگایە بە موقەدەس کراوە و بەرز کراوەتەوە بۆ ئاسمان. بە مانایەکی دیکە دورکهایم وەک مارکس لەو باوەڕەدایە کە خودا دروستکراوێکی ئینسانی و کۆمەڵایەتییە، بەڵام جیاوزییەکەیان لەوەدایە خودا لای مارکس وەک تاکەکەسێک دروست کراوە، لە کاتێکدا لای دورکهایم وەک کۆمەڵگا خۆی دروست کراوە. لای دۆرکهایم کۆمەڵگا وەک خودا ئەبەدییە و وەک خوداش ئەو هەستە لە ئینساندا دروست دەکات کە بەردەوام پێوستی بە ئەوانی تر و بە پێکەوەبوونی دەستەجەمعییە بۆ مانەوە. وەک چۆن مرۆڤی دینی باوەڕی بەوەیە کە بۆ مانەوەی لە ژیاندا پێویسی بە خودایە، بە هەمان شێوە مرۆڤی ئاساییش باوەڕی وایە کە بۆ مانەوەی پێویستی بە کۆمەڵگایە. لای

دورکهایم هەمیشە کۆمەڵگا پێدراوی یەکەمە و شتەکانی تر، بە خودی دین خۆشیەوە، وێنە و ڕوانین و نماییشێکن لەناو کۆمەڵگادا دروست دەکرێن. دۆرکهایم پێی وایە کۆمەڵگا وەک خودا ئەو هەستە لە ئینساندا دروست دەکات کە ئەو لەتاکەکەس گەورەتر و بەنرختره، وەک خوداش داوا لە تاکەکەسەکان دەکات لە خزمەتی ئەودا بن و سوود و قازانجە تایبەتەکانی خۆیان لەبیر بکەن لەپێناوی سوود و قازانجە کۆمەڵایەتییەکاندا. بەکورتی خودا و کۆمەڵگا یەک شتن و دین ئەو شوێنەیە کە هەردووکیانی تیادا دروست دەکرێت. ئەمەش وا دەکات دین هەمیشە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بێت، "شتێک" بێت هەمیشە کۆمەڵگا دروستی دەکات، وێنەکان و وێناکردنەکانی دین وێنە و وێناکردنی دەستەجەمعین و تەعبیر لە واقیعی پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی دەکەن.[1]

پێداگرتن لەسەر ئەم ڕەگەزە دەستەجەمعییە خاڵی هەرەسەرەکیی کۆمەڵناسیی ئایینە لای دۆرکهایم، لە ڕاستیدا دین لای دورکهایم هەمیشە پێویستی بە جۆرێک لە کۆڕ و کۆبوونەوە و کۆمەڵەیەک هەیە کە ناوی دەنێت "کۆمەڵەی ئەخلاق"، moral community، کۆمەڵەیەکی ئەخلاقی لەو کەسانە پێک دێن کە هەمان باوەڕیان هەیە، ئیتر لە باوەڕدارە سادەکانەوە بیگرە بۆ پیاوانی دین، هەموو ئەمانەش ئیلتیزامێکی ئەخلاقی بەو دینەوە و لە ڕێی ئەوەوە بەیەکترییەوە هەیە.[2] ئەم ڕەهەندە گشتی و

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشو.
٢ -هەمان سەرچاوی پێشوو ل ٤٢.

دەستەجەمعییەیە وا دەکات دۆرکهایم دین وەک سیستمێکی یەکگرتوو لە عەقیدە و باوەڕ و هەڵسوکەوت ببینێت کە لەسەر جیاکردنەوەی موقەدەس لە ناموقەدەس کار دەکات. ئەو شتانەی حەرام دەکرێن و مامەڵەیەکی تایبەت دەکرێن جیا دەکرێنەوە لەو شتانەی کە دەبێت ڕێزیان لێ بگیریت و بەردەوامییان پێ بدرێت. ڕێزگرتنی ئەم جیاکارییە یەکێکە لە میکانیزمە سەرەکییەکانی دروستبوونی پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی. کۆبوونەوە لەدەوری موقەدەسیش زۆربەی جار فۆرمی سروت و تقوستی تایبەتیی هەیە، کە تیایاندا بوونی دەستەجەمعی ئامادەگی و بەردەوامبوونی خۆی دەسەلمێنێت و درێژەی پێ ئەدات. دۆرکهایم پێی وایە دەکرێت دین هەبێت خودای تێدا نەبێت، بەڵام ناکرێت دین هەبێت موقەدەسی تێدا نەبێت، جیاکردنەوەی موقەدەس و ناموقەدەس "جەوهەر"ی دین دەستنیشان دەکات.[1] موقەدەسیش ئەو شتەیە کە مرۆڤە جیاوازەکان لەدەوری خۆی دەکاتەوە و دەیانکات بە کۆمەڵگا، دەیانکات بە یەکەیەکی دەستەجەمعی و پێکەوەیی. ئەو باوەڕ و هەڵسوکەوتانەش دەربارەی موقەدەس و لەدەوری موقەدەس کۆ دەکرێنەوە لەناو سیستمێکی ئەخلاقیدا یەک دەخرێن، هەروەها لە فۆرمی کەنیسە یان هەر دەزگایەکی دینیی تردا بەرجەستە دەکرێن. هەموو ئەمانە وا دەکات دۆرکهایم دین وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ببینێت، دیاردەیەک کاری سەرەکیی ئەوەیە تاکەکەسەکان لەناو "کۆمەڵەیەکی ئەخلاقیدا" پێکەوە کۆ بکاتەوە و فۆرمی

---

١ -هەمان سەرچاوەی پیشوو ل ٣٥.

بوونێکی دەستەجەمعییان پێ ببەخشێت. دۆرکهایم پێی وا بوو باوەڕ و قەناعەتی دینیی تاکەکەسەکان لە باوەڕی ئەو گروپ و کۆمەڵەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەوان ئەندامن تیایدا. لە هەموو دۆخێکیشدا خاڵی هەرەسەرەکی لە دیندا مەسەلەی دروستکردن و پەرستنی موقەدەسە، موقەدەسیش دیاردە و دروستکراوێکی کۆمەڵایەتییە، نەک ئاسمانی، هیچ شتێکیش بە ڕادەی بوونی پێکەوەیی و دەستەجەمعی بۆ باوەڕداران موقەدەس نییە. ئیشی موقەدەسیش بەستنەوەی تاکەکەس نییە بە ئاسمانەوە، بەڵکو بەستنەوەیەتی بە شتێکەوە لە خۆی گەورەتر، بە کۆمەڵگایەکەوە کە تاکەکەس لەناویدا لەدایک دەبێت و گەورە دەبێت و دەمرێت. موقەدەس لە دیدی دۆرکهایمدا لەو پێداویستییەوە دەست پێ دەکات کە مرۆڤ هەیەتی بۆ ئەوەی هەمیشە بەشێک بێت لە شتێک گەورەتر لە بوونی تاکەکەسانەی خۆی.

لای دورکهایم دین ڕەمز و وێنە و کردە و سروت و ئۆرگانی هاوبەش بە تاکەکەسەکان دەبەخشێت و دەیانکاتە گروپی هاوشێوە و یەککگرتوو. هاوکات هەستێکی بەهێز و ئاگراویی قابیل بە تەقینەوە و هەڵچوونی گەورە بە دیندارەکان دەبەخشێت، بەتایبەتی لە کاتی ئەنجامدانی سروتە دەستەجەمعییەکاندا. وەک چۆن کۆمەڵێک چەمک و وێنە و ئامرازی بیرکردنەوەش بە ئینسان دەبەخشێت بتوانێت لە ڕێگایانەوە ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆی لێک بداتەوە و تێبگات. لەم ڕووەوە دۆرکهایم دین وەک جۆرێک لە کۆمەڵناسی دەبینێت، بەڵام کۆمەڵناسییەکی پڕ ئەفسانە و خورافەت، نەک

کۆمەڵناسی وەک زانست. کۆمەڵگا لە ڕێگای دینەوە، واتە لە ڕێگای ئەم کۆمەڵناسییە پڕ هەڵە و خوارافەتەوە، هەوڵی ئەوە نادات لە خوداوەند تێبگات، بەڵکو دەیەوێت لە خودی خۆی تێبگات، خۆی بۆ خۆی نمایش بکات و خۆی نیشانی خۆی بدات. لەم ئاستەدا دۆرکهایم تا ئەو شوێنە دەڕوات کە بڵێت هەر کۆمەڵگایەک دینی تێدا نەبێت، ناتوانێت وێنەیەکی تایبەتی خۆی وەک کۆمەڵگا هەبێت، ناتوانێت بەرانبەر بە خودی خۆی بەئاگا بێت. دین ئەو شوێنەیە کە کۆمەڵگا تیایدا بەر لەوەی لە هەر شتێکی تر بڕوانێت لە خودی خۆی دەڕوانێت. خەڵک لە ڕێگای پەرستنی خوداوە بەبێ ئەوەی ئاگادار بن ئەو دەسەڵاتە دەستەجەمعییە ئەپەرستن کە بەسەر سەریانەوەیە، ئەو دەسەڵاتەی کە ئاراستەیان دەکات. دۆرکهایم لەو باوەڕەشدایە دین ئەرکێکی گرنگی تریش دەبینێت کە بە ئەرکی ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتی ناوی دەبات، دین لە ڕێگای بەهێزکردنی ئەو پەیوەندییانەوە کە تاکەکەسە ئیماندارەکان لەگەڵ یەکدا و لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیەدا کە ئەندامن تیایدا دروستی دەکەن، تۆکمەی و ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتیی دەپارێزێت. کۆبوونەوەی هەموویان لەدەوری موقەدەسێک، بەشێکە لە کۆبوونەوەی ئەوان لەدەوری یەکتر. هەر لێرەدا یەکێک لەو ڕەخنە سەرەکییانەی لە تێڕوانینی دۆرکهایم بۆ دین دەگیرێت ئەوەیە کە ئەو ڕەهەندە تاریک و نێگەتیڤەکانی دین نابینێت، ئەوە نابینێت چۆن دەکرێت دین ببێتە هۆکاری دروستبوونی ناکۆکی و دوژمنایەتیی کۆمەڵایەتی و چۆن دەشێت ببێتە هۆکاری بەرپابوونی جەنگ و پێکدادانی

خوێناوی و هەڵوەشاندنەوە و پارچەپارچەبوونی کۆمەڵایەتی. واتە دین تەنها تۆکمەیی و ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتیی مەیسەر ناکات، بەڵکو دەکرێت خودی کۆمەڵگا وێران بکات و ببێتە هۆی دروستبوونی نائارامی و پشێوی و دابڕانی کۆمەڵایەتی.

بەکورتی دۆرکهایم ڕای وایە ناکرێت دین تەنها بۆ وەهم و خورافەت کورت بکرێتەوە، چونکە ئەگەر تەنها وەهم و خورافەت بوایە، ئەودەم پێشکەوتن و گەشەکردنی کۆمەڵگا ئینسانییەکان هەر زوو کۆتاییان پێ دەهێنا. هەموو ئەمانە وا دەکەن تێگەیشتنی دۆرکهایم بۆ دین، سەرەڕای ئەوەی کە خۆی کەسێکی بێدین و بێباوەڕ بووە، تێگەیشتنێکی پۆزەتیڤ بێت و پێی وا بێت دین ڕۆڵێکی گرنگ لەدروستکردنی یەکگرتن و تۆکمەیی و هاوئاهەنگی و هاوکاریی کۆمەڵایەتیدا دەبینێت.

### دین و مۆدێرنە

لە پەیوەندیدا بە لە دایکبوونی دونیای مۆدێرنەوە، دۆرکهایم پێی وایە کە ڕۆڵی دین لەم دونیایەدا تەواو لاواز دەبێت و تەواو پەراوێز دەکەوێت. ئەم لاوازبوونە لە ئاستە مەعریفییەکەیدا دیاردەیەکی پۆزەتیڤە و بیرکردنەوەی زانستی و عەقڵانی شوێنی خورافات دەگرێتەوە، بەڵام دورکهایم ئەرکێکی کۆمەڵایەتیی گرنگ بە دین دەبەخشێت، کە لەدەستدانی دین دەشێت کێشەی گەورە دروست بکات. ئەو ئەرکەش ئەرکی پاراستنی ئاوێزانبوون و تۆکمەبوون و پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتییە. لاوازبوونی دین لای ئەم

کۆمەڵناسـە ئەگـەری هەڵوەشـاندنەوە و پارچەپارچەبوونـی کۆمەڵایەتیـی گەورەتـر و هەمەلایەنتـر دەکات، گـەر دونیـای مۆدێـرن ئەلتەرناتیڤێـک بـۆ دیـن و بـۆ ئـەم ڕۆڵـەی دیـن لـە ژیانـی کۆمەڵایەتیـدا دەیگێڕێـت، نەدۆزێتـەوە. مۆدێرنـە لـە ڕێـگای پرۆسـەی بەعەلمانیبونـەوە کۆمەڵگایـەک دروسـت دەکات تیایدا دین ئەو ڕۆڵانە لەدەست ئەدات کە لە کۆمەڵگا سـوننەتییەکاندا دەیگێڕێـت و کۆمەڵـگاش چەنـد مۆدێرنتـر و تازەتـر ببێتـەوە ئەوەنـدە ڕۆڵـی دیـن تیایـدا لاوازتـر دەبێـت. ئەگـەر دیـن ژێرخانـی شـێوازەکانی پێکەوەبوونـی کۆمەلایەتـی و فۆرمەکانـی هاریکاریکردن و ئامێزانبوون بێت لە کۆمەڵگای سـوننەتیدا، ئـەوا لاوازبوونـی دیـن و پەراوێزکەوتنی لـە دونیـای مۆدێرندا مانـای دروسـتبوونی کێشـەیە لە هەموو ئـەو بوارانەدا، گـەر ئـەو دونیایـە نەتوانێـت ئەلتەرناتیڤێـک بـۆ دیـن بدۆزێتـەوە میکانیـزم و پراکتیکـی نـوێ بەرهـەم نەهێنێـت کـە پێکەوەبوونـی کۆمەڵایەتیـی ڕێـک و ئاراسـتە بـکات. هەمـوو سۆسـیۆلۆژیای دورکهایـم لـەدەوری ئـەم کێشـەیە دەسـوورێتەوە، کێشـەیەک کـە لاوازبوونـی دیـن لـە دونیـای مۆدێرنـدا دروسـتی دەکات.[1]

دورکهایـم پێـی وا بـوو مـادام پرۆسـەی بەتاکەکەسـبوون لـە کۆمەڵـگا مۆدێرنەکانـدا بـە شـێوەیەکی بـەردەوام دروسـت و بەهێـز دەبێـت، بۆیـە تـا دێـت دیـن لـەو کۆمەڵگایانـەدا لاواز دەبێـت و دەگۆڕێـت بـۆ دیاردەیەکـی لاوەکـی. ئـەوەی شـوێنی

١ - بڕوانە:
Rawls, W. Anne (2012). Durkheim's theory of modernity: Self-regulating practices and constitutive orders of social and moral facts. Journal of Classical Sociology. Vol 12, Issue 3-4.

دین لەو کۆمەڵگایانەدا دەگریتەوە عەقلانیەتە، عەقلانیەت دەبێتە ئاکاری سەرەکیی هێزە کۆمەڵایەتییەکان و شوێنی دین دەگریتەوە، بەڵام عەقلانیەت ناتوانێت ئەو ڕۆحە دەستەجەمعییە دەستەبەر بکات کە کۆمەڵگا پێویستی پێیەتی بۆ مانەوە، ئەمەش وا دەکات مەترسیی ئەوە دروست ببێت شتێک نەمێنێتەوە بتوانێت ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتی و پاراستنی ئەو ڕۆحە دەستەجەمعییەی هەموو کۆمەڵگایەک پێویستی پێیەتی، مەیسەر بکات. لەم ڕووەوە دۆرکهایم پێی وایە کۆمەڵگای مۆدێرن پێویستی بە دروستکردنی دەزگای کۆمەڵایەتیی نوێ و ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتیی نوێ هەیە بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییە گەورەیە پڕ بکاتەوە کە لاوازبوونی دین لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا دروستی دەکات. دورکهایم باس لە هاتنەکایەی دۆخی Anomie "ئانۆمی" لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەکات، ئانۆمییش لە پێناسە هەرە سادەکەیدا مانای دۆخی نەمان و وێرانبوونی بەهاکان، دۆخێک تیایدا بەها دینییەکان و بەها سوننەتییەکانی خێزان و نۆرمە کۆمەڵە تەقلیدییەکان کاریگەرییان نامێنێت، بەڵام هاوکات کۆمەڵگا نەیتوانیوە کۆمەڵێک بەهای ئەلتەرناتیڤ دروست بکات کە ئاراستەیەکی ئەخلاقی بە تاکەکەس و گروپەکان ببەخێت. پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا وا دەکات دۆخی ئانۆمی بێتە کایەوە و ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی ناجێگیر دروست ببێت کە لە پەککەوتنی بەها و پێوەرە باڵادەستەکانەوە دروست دەبێت.[1] دۆخی ئانۆمی دەرەنجامی فەشەلی هەموو جۆرەکانی

---

١ - بڕوانە:

Durkheim, E. (1964). *The division of labor in society.*. New York,

ئامێزانبوونــی کۆمەڵایەتییــە، کۆتایــی فۆرمــە جیاوازەکانــی هاریکاریی سوننەتییە لەنێوان مرۆڤەکاندا و نەبوونی شێوازی نــوێ و ئەلتەرناتیڤــە بــۆ هاریــکاری و هــاودەردی، ئەمــە وا دەکات مــرۆڤ هەســت بــە دابــڕان و تەنهاییەکی تاکەکەســی و کۆمەڵایەتیی گــەورە بکات، تەنیاییــەک تێکــەڵ بــە نائومێدی و نەمانی ئامانجێک لــە ژیانــدا. لــە دۆخــی ئانۆمیدا دونیایــەک دروســت دەبێــت کــە هیــچ شــێوازێکی مانــاداری ئینتیمــا بــە مرۆڤەکانی نــاوی نابەخشــێت، نــە ئینتیمــا بۆ خێزان، نــە ئینتیما بــۆ دیــن و نــە ئیتیمــا بــۆ سیاســەتیش. دورکهایــم بەشــێک لــە دیــاردەی پەنابــردن بــۆ خۆکوشــتن لــە کۆمەڵگا مۆدێرنەکانــدا بــەم دۆخــە تایبەتــەوە دەبەســتێتەوە.

بــەڵام دورکهایــم تیوریســتێکی ڕەشــبین نییــە و پێــی وایــە کۆمەڵگا مۆدێرنــەکان دەتوانــن بەســەر ئــەو کێشــانەدا زاڵ ببــن و بەهــای نــوێ و شــێوازی هاریــکاری و بەدەمەوەچوونــی کۆمەڵایەتیی نوێ دروست بکەن. ئەگــەر شێوازی "هاریکاریی خۆبەخــۆ" و "میکانیکــی"ی نــاو کۆمەڵگا تەقلیدییــەکان لەپاڵ لاوازبوونــی دینــدا لاواز ببێــت، ئــەوا کۆمەڵــگا مۆدێرنــەکان دەتوانــن لــە شــوێنی ئەواندا شــێوازی نوێــی هاریکاریــی بێننــە کایــەوە، کــە دۆرکهایــم بــە "هاریکاریــی ئۆرگانیــی" ناویــان دەبات. ئەم هاریکارییە ئۆرگانییانــە لەناو ئەو کایانەدا دروست دەبــن کــە لــە کۆمەڵــگا مۆدێرنەکانــدا دروســت دەبــن، بنەمــای هاریکارییەکــەش دیــن نییــە، بەڵکــو بوونــی بەهــای هاوبــەش و توانــای خۆڕێکخســتنی ســەربەخۆیە لای کەســەکان.[1]

---

Free Press of Glencoe

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٧٩-

**ئامێزانبوون لە کۆمەڵگایەکی بێدیندا**

وەک وتم، پرسیاریی سەرەکیی سۆسیۆلۆژیای دۆرکهایم لەدەوری ئامێزانبوونی کۆمەڵایەتی دەسووڕێتەوە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، دوای ئەوەی دین هێز و توانای خۆی لەو کۆمەڵگایانەدا لەدەست داوە. ئەو پرسیارە دەپرسێت: چۆن هێزە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگا مۆدێرنەکان بەیەکەوە ببەستینەوە و نەهێڵین پارچەپارچەبوون و لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵایەتی بالادەست ببێت؟ چۆن کۆمەڵگا بهێڵینەوە و بیپارێزین؟ چۆن نەهێڵدرێت بەشە جیاوازەکان لەیەک بترازن و دابەش ببن بۆ یەکەی بچووکی بێپەیوەندی و دابڕاو؟ دۆرکهایم لە سێ شت دڵنیا بوو. یەکەم، کۆمەڵگا مۆدێرنەکان کۆمەڵگایەک نین پەیوەندیی خزمخوازی و خێڵ و خوێن بەیەکەوە گرێیان بدات. دووهەم، کۆمەڵگا مۆدێرنەکان دین ناتوانێت ئەندامەکانی بەیەکەوە کۆ بکاتەوە، چونکە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا دینی تەواو لاواز و پەراوێز خستوە. سێیەمیش، خێزانیش یەکەی کۆکردنەوەی تاکەکەسەکان نییە بەیەکەوە. لە دیدی دورکهایمدا مۆدێرنە شتێک ناهێڵێتەوە ناوی "کۆمەڵەی سروشتی" و "سوننەتیی" بێت و لە شوێنی ئەوە یەکەیەکی موجەرد و گەورە دروست دەکات کە ناوی کۆمەڵگایە. مۆدێرنە کۆتایی بە توێژە کۆمەڵایەتییە جێگیر و نەگۆڕەکان و هیرارکیتە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکانیان دەهێنێت و لە شوێنی ئەواندا مەسەلەی "ڕێککەوتن" و

512 Rawls, W. Anne (2012).

"کۆنتراکتی کۆمەڵایەتی" دەهێنێتە کایەوە. هاوکات مۆدێرنە لەگەڵ خۆیدا کێشەی دروستبوونی تاکگەرای و سەرهەڵدانی ئەنانیەت و دابڕانی مرۆڤەکان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. پرسیاری دۆرکهایم و زانستی کۆمەڵناسی بەگشتی ئەوەیە: چۆن بەرەنگاریی ئەم کێشانە ببینەوە؟ وەک دەزانین وەڵامی مارکس بە کێشەکانی دونیای مۆدێرن کۆمۆنیزمە، گۆڕینی سەرلەبەری سیستمی سەرمایەدارییە لە ڕێگای شۆڕشی کۆمەڵایەتییەوە. مارکس باوەڕیشی وا بوو کە بەرپابوونی ئەو شۆڕشە مەسەلەیەکی حەتمییە. بەم مانایە مارکس پیاوێکی گەشبین و خۆشباوەڕ بوو. بەڵام دورکهایم باوەڕی بە شۆڕشی کۆمەڵایەتی نەبوو، باوەڕی بە کۆمۆنیزم نەبوو، باوەڕی بە گۆڕینی ڕادیکاڵ و سەرلەبەری سیستەمەکە نەبوو، بەڵکو باوەڕی بەوە بوو کە دەکرێت سیستمەکە چاک بکرێتەوە، نەخۆشییەکانی دەستنیشان بکرێت و چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە. دورکهایم بە پێچەوانەی مارکسەوە پیاوێک بوو باوەڕی بە گۆڕانی هێمن و لەسەرخۆ و چاککردنەوەی رووبەر و ڕەهەندە خراپەکانی کۆمەڵگا هەبوو. بە ڕادەی مارکسیش خۆشبین و گەشبین نەبوو، ڕەشبینیش نەبوو، بەڵکو پیاوێک بوو پڕ لە گومان.

### مۆدێرنە و کۆنتراکتی کۆمەڵایەتی

بەڵام ئایا وەڵامی دۆرکهایم بۆ کێشەکانی دونیای مۆدێرن چییە؟ ئەگەر کۆمۆنیزم وەڵام نییە، کۆمەڵگا مۆدێرنەکان چۆن دەتوانن خۆیان لە دابەشبوون و هەڵوەشاندنەوە

بپارێزن؟ لە وەڵامدا دۆرکهایم پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت کە کۆمەڵگا مۆدێرنەکان پێویستیان بە کۆنتراکت، واتە بە ڕێککەوتن هەیە. بەڵام کۆنتراکت تەنها کۆنتراکتی کۆمەڵایەتی بە مانا ڕۆسۆیی و لۆکییەکەی نییە، واتە ئەم کۆنتراکتە یەک کۆنتراکتی گشتی نییە کە هەموو کۆمەڵگا بەیەکەوە کۆ بکاتەوە، بەڵکو کۆنتراکتی زۆر و فرەجۆرە لە سەرجەمی بوارەکانی ژیان و کایەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایانەدا، لە فۆرمی ڕێککەوتنی زۆر و ڕۆژانەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا لەسەر ئەوەی ئازاری یەکتری نەدەن، ژیانی یەکتری تێک نەدەن، بەڕێزەوە لەگەڵ یەکدا بژین، بۆ قازانجی خۆیان هاریکاریی یەکتر بکەن. هاوکات دورکهایم باوەڕی وا بوو کۆمەڵگا بەر لەوەی بگات بەو قۆناغەی کۆنتراکت دروست بکات، پێویستی بەوەیە لانی هەرەکەمی کۆگیری و یەکێتیی تێدا بێت، شتێک لە پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی یەکگرتوویی تێدا بێت. لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا ئەوەی ئەم شتە لە پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی دابین دەکات و کۆمەڵگا بەیەکەوە دەبەستێتەوە، چیتر دین نییە، بەڵکو "دابەشکردنی کارە"، دابەشکردنێکی چڕ و هەمەلایەنەی کار. لە ڕێگای ئەم دابەشکردنەوە دۆخێک دروست دەبێت هەر کەسێک کار و پیشەیەکی تایبەتی هەبێت و هەر کەسێک برێک لە پێداویستییەکانی ژیان لەناو کۆمەڵگا دابین بکات، ئەم دۆخە وا دەکات کەسە جیاوازەکان لەوە تێبگەن کە هەموویان پێویستیان بە یەکترییە، بۆ ئەوەی بتوانن بژین و بەردەوام بن تاکەکان و گروپەکان و پیشەکان

و لێزانییە جیاوازەکان و دەزگاکان و کایەکان پێویستیان بە یەکترییە.[1]

دورکهایم باوەڕی وا بوو "دابەشکردنی کار" لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا تا دێت فراوانتر و هەمەجۆرتر دەبێت، پیشەکان زیاد دەکەن و کارەکان و ئەرکەکان زۆرتر و هەمەجۆرتر دەبن، ئەمەش دۆخێک دروست دەکات مرۆڤەکان تا بێت پێویستیی زیاتریان بە یەکتری هەبێت. بۆ نموونە کەسێک کە ئەندازیارە پێویستی بە بەننا و دارتاش و نانەوا هەبێت، ئەوەی نانەوایە پێویستی بە مامۆستا هەبێت بۆ منداڵەکانی و پێویستی بە پزیشک هەبێت بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی، ئەوەی منداڵی هەیە پێویستی بە باخچەی ساوایان و قوتابخانە هەبێت هتد... دورکهایم پێی وایە لەم جۆرە کۆمەڵگایەدا لەباتیی "هاریکاریی میکانیکی"ی تەقلیدیی، "هاریکاریی ئۆرگانی" دروست دەبێت، ئەگەر لە هاریکاریی میکانیکیدا کۆمەڵەکان بچووک بن و ئەندامەکانی هەموویان یەکتری بناسن و دینێک بەیەکەوە کۆیان بکاتەوە، ئەوا لە هاریکاریی ئۆرگانیدا کەسەکان یەکتری ناناسن و لە کۆمەڵگایەکی گەورەدا دەژین و دین ناتوانێت چیتر هەموویان بەیەکەوە کۆ بکاتەوە. لای دۆرکهایم هاریکاریی ئۆرگانی دەرەنجامی ئەو دابەشکردنە زۆرەی کارە کە لە دونیای مۆدێرندا دێتە کایەوە. جگە لە

---

١ - بڕوانە:
Durkheim, E. (1964). *The division of labor in society.*. New York, Free Press of Glencoe.

دابەشکردنی کار ئەوەی دەتوانێت بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان بەیەکەوە گرێ بدات "کۆمەڵگای مەدەنی" و "کۆمەڵگا پیشەیی"یەکانە، ئەمانەش دەتوانن مرۆڤەکان کۆ بکەنەوە و بیانخەنە پەیوەندییەوە لەگەڵ یەکدا و لەگەڵ دەوڵەتدا.[1]

**دەرەنجام**

بەکورتی، دەکرێت تێزە سەرەکییەکەی دۆرکهایم دەربارەی دین بەم شێوەیە کورت بکەینەوە: ئەگەر خاڵی سەرەکی لە دیندا پێداگرتن بێت لەسەر سروشتی دەستەجەمعیی کۆمەڵگاکان و پاراستنی ئەو ڕۆحە دەستەجەمعییە بێت لەناو کۆمەڵگادا ئامادەیە، ئەوا کۆمەڵگای مۆدێرن، کە کۆمەڵگای تاکەکەسە لێکدابڕاوەکانە و دین تیایدا لاوازە و ئەو شوێن و پێگە گرنگەی نەماوە کە لە کۆمەڵگا نامۆدێرنەکاندا هەیبوو، میکانیزمی تر پێویستە بۆ دروستکردنی هاریکاریی کۆمەڵایەتی و پاراستنی کۆمەڵگا لە پارچەپارچەبوون و هەڵوەشاندنەوە. دۆرکهایم بەلایەوە گرنگ نەبووە ئایا تاکەکەسە مۆدێرنەکان بە شێوازی نوێ و لە فۆڕمی تاکەکەسییانەدا درێژە بە ئەزموونی دینیی خۆیان ئەدەن یان نایدەن، ئەوەی ئەو بەلایەوە گرنگ بووە ئەو ڕەهەندە گشتی و ئەرکە دەستەجەمعییەیە کە پێی وایە دین هەڵگریەتی کە دین لە دونیای مۆدێرندا لەدەستی داوە. لە هەموو ئەمانەشدا دورکهایم تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەسەلمێنێت و وەک

1 -هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ژێرخانـی ڕوانینـە سۆسـیۆلۆژییەکانی بـەکاری دەهێنێـت. ژێرخانێـک وەک نیشـانمان دا پـێ لەسـەر ئـەوە دادەگرێـت کـە کۆمەڵـگا مۆدێرنـەکان بـەرەو ئـەوە دەڕۆن بەتـاڵ ببنـەوە لـە دیـن، یـان لانـی کـەم دیـن ببێتـە دیاردەیەکـی لاوەکـی و پەراوێزیـی نـاو ئـەو دونیایـە. لـە هەمـوو ئەمانـەدا دۆرکهایـم لەدایکبوونـی کۆمەڵـگای مۆدێـرن و پاشکشـەکردنی دیـن وەک یاسـایەکی مێژوویـی وێـنا دەکات، لاوازبـوون و پەراوێزکەوتنـی دیـن وەک لۆژیکـی ناوەکـی لەدایکبـوون و گەشـەکردنی کۆمەڵـگا مۆدێرنـەکان دەبینێـت. ئەمـەش نیشـانی ئـەدات لەبـەر چـی دۆرکهایـم یەکێکـە لەتیوریسـتە سـەرەکییەکانی تیـزەی بەعەلمانیبوونـی بەردەوامـی دونیـای مۆدێـرن.

## سەرچاوەکان

Durkheim, E. (1964). The division of labor in society.. New York, Free Press of Glencoe.

Durkheim, E. (1954). The Elementary Forms of Religious Life. New York: The Free Press. p. 47

Jones، Robert (1986). Emile Durkheim: An Introduction to Four Major Works. Beverly Hills, CA: Sage Publications, Inc., 1986. Pp. 12-23.

Rawls, W. Anne (2012). Durkheim's theory of modernity: Self-regulating practices and constitutive orders of social and moral facts. Journal of Classical Sociology. Vol 12, Issue 3-4.

Riley, Alexander (2015). The social thought of Emile Durkheim. Sag Publications.

# دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (٤)
# ماکس ڤێبەر و تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا

**سەرەتا**

کۆمەڵناسی ئەڵمانی ماکس ڤێبەر (١٨٦٤-١٩٢٠) یەکێکە لەو زانا کۆمەڵایەتیيانەی ڕۆڵێکی هێجگار گەورە دەبینێت لە تیۆریزەکردنی چۆنیەتیی دروستبوونی دونیای مۆدێرن و چۆنیەتیی لێکدانەوەی دیاردەکانی ناو ئەو دونیایە، بە خوێندنەوە و شیکردنەوەی شوێنگە و ڕۆڵ و پێگەی دینەوە لەناو ئەو دونیایەدا و لە دروستبوونی ئەو دونیایەدا. لە ڕاستی دوور ناکەوینەوە گەر بڵێین بەشی زۆری ئەوەی ئەم کۆمەڵناسە ئەڵمانییە لەسەر دونیای مۆدێرن دەیڵێت، دەبێتە ئەو چوارچێوە تیۆرییە سەرەکییەی ساڵانێکی درێژ زۆربەی زانا کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی خۆی و دوای خۆشی بۆ لێکدانەوەی چۆنیەتیی دروستبوونی دونیای مۆدێرن وەک شتێکی تەواو تازە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، بەکاری دەهێنن و قبووڵی دەکەن. یەکێک لەو دید و ڕوانینە تیۆرییە کاریگەرانەی ماکس ڤێبەر، کە وەک بەڵگەنەویستی لێ دێت و بێ پرسیار و گومانلێکردن قبووڵ دەکرێت، پێشنیارکردنی ئەو

پەیوەندییە حەتمییەیە لەنێوان لەدایکبوونی کۆمەڵگای مۆدێرن و پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا و لاوازبوونی بەرفراوانی ئامادەگی و ڕۆڵی دین لەو دونیایەدا. لە ڕاستیدا برێکی زۆر لەو چەمک و وێنە و دەستەواژانەی کە پایەکانی "پارادایمی عەلمانیەت" دادەڕێژن، لەناو فیکری ماکس ڤێبەرەوە دێن، بەتایبەتی ئەو بەشەی فیکری ڤێبەر کە بە ناوی "کۆمەڵناسیی ئایین"ەوە ناسراوە. کاریگەریی ماکس ڤێبەر لەم بوارەدا زۆر لە کاریگەرییەکانی دۆرکهایم و مارکس و ئەوانیتر گەورەتر و فراوانترە.

## ژیانی ماکس ڤێبەر

ماکس ڤێبەر ساڵی ١٨٦٤ لە شاری ئێرفوت لە ئەڵمانیا لە خێزانێکی بۆرژوازیی دەوڵەمەند لەدایک دەبێت. خێزانی ماکس ڤێبەر لە سەدەی هەژدەهەمدا لە سالزبۆرگەوە ڕادەکەن و وەک پەناهەندە دێن بۆ ئەڵمانیا، لەبەر ئەوەی بنەماڵەکەی ماکس ڤێبەر پرۆتستانی بوون و لەدەست کاتۆلیکەکانی شاری سالزبۆرگ ڕادەکەن. باوکی ماکس ڤێبەر لە خێزانێکی بازرگانیی گەورەدا لەدایک بووە، دۆخی ئابووریيان زۆر باش و خاوەنی کارخانە و بزنسی خۆیان بوون. باوکی لە سەردەمی بسمارکدا دەبێت بە ئەندامی پەرلەمانی پروسیا. دایکی ماکس ڤێبەر ئافرەتێکی هێجگار دینداری سەر بە کالڤینیزمی پرۆتستانتیزم بووە و پەیوەندیی ڤێبەر و دایکە باوەڕدارەکەی پەیوەندییەکی زۆر پتەو بووە. ماکس ڤێبەر قوتابییەکی هێجگار لێهاتوو و بەتوانا بوو، هێشتا لە قۆناغی ناوەندیدا دەبێت کە

چەندان سەرنج و تێبینی لەسەر کارەکانی گۆتە و کانت و هیگڵ دەنووسێت و لەگەڵ ئەنجامدانی کارەکانی قوتابخانەشدا هەر ٤٠ بەرگەکەی کارەکانی گۆتە دەخوێنێتەوە. بەبێ هیچ مامۆستایەک و بەدەستپێشخەریی خۆی، خۆی فێری زمانی عیبری دەکات بۆ ئەوەی بتوانێت تێکستە کۆنەکانی ئینجیل بە زمانە ڕەسەنەکەی خۆی بخوێنێتەوە. ئەگەرچی ماکس ڤێبەر خۆی پیاوێکی بێدین، یان بێباوەڕی دینی بوو، بەلام ڕێزێکی گەورەی بۆ باوەڕەکەی دایکی هەبووە، بەتایبەتی بۆ ئەخلاقی کارکردن و ئەو هەوڵدان و ڕەنجدانەی کالڤینیزم لە ئیماندارانی داوا دەکات. ڤێبەر خۆی لەو ساڵانەدا دەژی کە دونیای مۆدێرن بە خێراییەکی گەورە لە زیاد لە بوارێکدا دروست دەبێت و گەشە دەکات. خوێندنەوە و تێگەیشتنی ئەم دونیایە دەبێتە خولیای سەرەکیی ئەم پیاوە.[1]

### عەقلانیەت، نەک دین، وەک ئاکاری سەرەکیی دونیای مۆدێرن

لە دیدی ماکس ڤێبەردا ئاکاری سەرەکیی دونیای مۆدێرن پرۆسەی بەعەقلانیبوونە، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەڵێن ڕاشیۆنالیزەیشن Rationalisation. لە تەماشاکردنیدا بۆ دونیای مۆدێرن و لە جیاکردنەوەی ئەم دونیایە لە دونیای سوننەتی، ئەم کۆمەڵناسە، پرۆسەیەکی بەرفراوانی بەعەقلانیبوونی کۆمەڵگا دەبینێت کە سەرجەمی بوارە جیاوازەکانی ژیانی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی و

1 -Allen, Kieran (2004). Max Weber. A critical introduction. London: Pluto Press. P15-17.

فەرهەنگی دەگرێتەوە. مرۆڤی مۆدێرنیش وەک مرۆڤێکی عەقڵانی وێنا دەکات کە حیساباتی ورد و لێکدانەوە و لۆژیکی تایبەتی خۆی لەپشتی بڕیار و کار و کردەوەکانیەتی، نەک دین. ئەم پرۆسەی بەعەقڵانیبوونە کۆڵەکەی سەرەکیی دونیای مۆدێرن پێک دەهێنێت و هەر ئەویش لە دونیای بەر لە مۆدێرنی جیا دەکاتەوە. ئەم عەقڵانیەتە هەم دەچێتە ناو سیاسەتەوە، هەم ناو ئابوورییەوە، ناو دەزگاکانی دەوڵەت و ناو خودی کۆمەڵگا خۆیشیەوە.[1] بەلام پرۆسەی بەعەقلانیبوون چییە؟ ئەم کۆمەڵناسە چ مانایەکی بە پرۆسەی بەعەقڵانیبوونی کۆمەڵگا دەبەخشێت و لە چ تێگەیشتنێکەوە وەک ئاکاری سەرەکیی دونیای مۆدێرن پێشنیار دەکرێت؟

پرۆسەی بەعەقڵانیبوونی کۆمەڵگا بە مانا هەرە سادەکەی مانای زاڵبوونی بیرکردنەوەی عەقڵانیانەیە بەسەر کار و کردەوە و ئاکاری بکەرە کۆمەلایەتییەکانی ناو دونیای مۆدێرندا. عەقڵانیەت خۆیشی، بە مانا هەرە سادەکەی، مانای گەڕاندنەوە بۆ حیساباتی ورد و پلانی داڕێژراو و بیرلێکراوە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو، بەبێ حیسابکردن بۆ بەها و نرخ و هەست و نەستی ئینسانەکان خۆیان، چونکە هەموو ئەم شتانە دەشێت ڕێگر بن لەبەردەم حیساباتە عەقڵانی و بیرکردنەوە پلانبۆدانراوەکاندا کە گەیشتن بە ئامانجەکان بە شێوەیەکی خێرا و چالاک و کەمترین مەسرەف، ئاراستەیان دەکەن. پرۆسەی بەعەقڵانیبوون

---

1 -Weber, M. (2005). *Max Weber: Readings and Commentary on Modernity*. S. Kalberg (Ed.)

مانای بالادەستیی حیساباتی عەقڵیی ڕووت و وشک و بێهەست بەسەر سەرجەمی شێوازەکانی تری نرخاندن و هەڵسەنگاندنی ئینسانیدا. بەعەقڵانیبوونی کۆمەڵگا بە مانای ئەوەی کۆمەڵگا لۆژیکێکی بۆ ئەنجامدان و ڕاپەڕاندنی کار هەبێت کە بە کەمترین هەوڵ و تەقەلا و وزەسەرفکردن، زۆرترین دەسکەوت بەدەس تبهێنیت، ئەم پرنسیپە ناوی پرنسیپی کارایی یان "کەفائەت"ە Efficiency. دووهەم هەوڵدان بۆ پێشبینیکردنی ڕووداوەکان لە ڕێگای کۆکردنەوەی زانیارییەوە لەسەریان، Predictability. سێهەم توانای تەرجەمکردنی بیرکردنەوە لە دیاردەکان بۆ ژمارە و ئامار و حیساباتی ماتماتیکی، واتە توانای ژماردنیان .Calculability چوارەمیش مانای پشتبەسن بە ئامێر بۆ ئەنجامدانی کارەکان. هەموو ئەمانە ئاکاری ئەو پرۆسەی بەعەقڵانیبوونەیە کە لە دونیای مۆدێرندا ڕوو دەدات و بە هەمووشیان کۆمەڵگایەک و جۆرێک لە مرۆڤ دروست دەکەن جیاواز لە کۆمەڵگا و مرۆڤەکانی دونیای بەر لە مۆدێرن.[1] بە بۆچوونی ماکس ڤێبەر ئەوەی مرۆڤ لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەجووڵێنێت، ئەو پرنسیپە عەقڵانیانەی سەرەوەیە، ئەو حیسابات و ژماردن و ئامارکارییەیە کە باس کران، مەسەلەی عەمەلیبوون یان نەبوونی بڕیارەکانە، نەک ئەوەی کۆمەڵێک بەها و نرخی ئەخلاقی یان دینیی یان دونیایی تەقلیدی و سونەتیی لەپشتی بڕیارەکانەوە بێت. ئەوەی سەرنج لەم ئاکارانەی پرۆسەی

---

1 -R. Collins (1986). Max Weber: A selective Key. London: Sage. P. 63.

بەعەقڵانیبوونی کۆمەڵگا و دونیا بدات، دەبینێت هیچ ڕۆڵێکی بۆ دین تیادا نەماوەتەوە، دونیای مۆدێرن لەم ڕوانینەدا دونیایەکە دین تیایدا بەتەواوی لاواز و پەراوێزخراوە. ئەم پرۆسەی بەعەقڵانیکردنە نەک تەنها کۆمەڵگایەکی مۆدێرن دروست دەکات، بەڵکو سەرمایەداری، کاپیتالیزم، دەکاتە شێوازی سەرەکیی کۆمەڵگا لەو دونیا مۆدێرنەدا.[1]

## دیدێکی تاریک

دیدی ماکس ڤێبەر بۆ مۆدێرنە، کە لای ئەو یەکسانە بە کاپیتالیزم، دیدێکی تەواو تاریکە و باوەڕی وایە کاپیتالیزم ئەلتەرناتیڤی نییە و ئەمە ئەو شتەیە کە دەبێت لەگەڵیدا بژین، ئەگەرچی هاوکات نیشانی ئەدات کە هەڵگری دونیایەک تاریکی و نارەحەتی و کێشەی ئەخلاقی و ژیاری و وجودییە. بەشێکی زۆری نووسینەکانی ڤێبەر تەرخانە بۆ شیکردنەوەی ئەم ڕووە تاریکەی مۆدێرنە. ئەم وێناکردنە تاریکەی مۆدێرنە کەلەپوورێکی تایبەتە هەندێک ڕەگەزی لە مارکسەوە دێت و بە دۆرکهایمدا تێدەپەڕێت و لای ماکس ڤێبەر بەتەواوی وەک دیدی باڵادەست دەچەسپێت. ژیانی شەخسیی ڤێبەر و دۆخی

---

١ -ماکس ڤێبەر ئەگەرچی دونیای مۆدێرن وەک دونیایەکی بەتاڵ لە دین یان بێدین یان دونیایەک تیایدا دین پەراوێز خراوە، دەبینێت، بەلام تێزە سەرەکییەکەی دروستبوونی ئەم دونیا مۆدێرنە، واتە دروستبوونی کاپیتالیزم، بە ئەخلاقی دینیی پرۆتیستانتییەوە گرێ ئەدات. بڕوانە:
Weber, Max (1958). The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism. Translated by Talcott Parsons with a new introduction by Anthony Giddens. New York: Charles Scribner's Sons

ئەڵمانیا لە دەیەکانی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کاریگەریی گەورە لەسەر ڕەشبینیی ئەم کۆمەڵناسە دادەنێن. ڤیبەر ساڵە درێژەکانی جەنگی جیهانیی یەکەمی بە چاوی خۆی بینی و لە نزیکیشەوە گەشەکردن و بەهێزبوونی ناسیۆنالیزمێکی نەفیکەری بۆ هەموو شێوازێکی پێکەوەژیانی هێمن، ئەزموون کرد. ئیهانەکرنی تەواوی ئەڵمانیاشی لەدوای دۆڕاندنی جەنگی جیهانیی یەکەمەوە بینی و ئەو دۆخە وێران و شێواوە گەورەیەی بینی کە براوەکانی جەنگ بەسەر کۆمەڵگای ئەڵمانیدا سەپاندیان.

لای ڤیبەر مێژووی مرۆڤایەتی مێژووی بەدواییەکداهاتنی سیستمە ئابوورییەکان و شێوازەکانی بەرهەمهێنان نییە، وەک مارکس دەڵێت، بەڵکو مێژووی بەدواییەکداهاتنی شێوازەکانی هەیمەنەکردنە، domination، هەیمەنە بە مانای باڵادەستبوونی هێزێک لە هێزەکان بەسەر هەموو ئەوانی تردا. مێژووی مرۆڤایەتی مێژووی جێگۆڕکێی شێوازە جیاوازەکانی هەیمەنەیە لە فۆرمی لەدایکبوونی شێوازی جیاوازی دەسەڵات و دەسەڵاتدارێتیدا، نەک شێوازە جیاوازەکانی بەرهەمهێنان. ڤیبەر سێ جۆری جیاوازیش لە شێوازەکانی هەیمەنە و باڵادەستی لەیەکتری جیا دەکاتەوە: باڵادەستیی سوننەتی، باڵادەستیی کاریزمی، باڵادەستیی یاسایی عەقڵانی. ئەمەی سێیەمیان شێوازی سەرەکیی باڵادەستی و سەروەرییە لە دونیای مۆدێرندا، جیاوازیی دونیای مۆدێرن و دونیاکانی بەر لە دونیا مۆدێرن لەوەدایە کە شێوازی سەرەکیی حوکمڕانی و هەیمەنەکردن شێوازێکی یاسایی عەقڵانییە. ئەگەر لای مارکس ئابووریی دینامیک و جووڵێنەری مێژوو بێت، ئەوا

لای ڤێبەر دەسەلات دەبێتە جوولێنەری مێژوو، شێوازی ئەم دەسەلاتەش لە دونیای مۆدێرندا شێوازێکی عەقلانی و یاسایی و ئیدارییە، کە لە ئاستە سیاسییەکەیدا بریتییە لە هاتنەکایەی لیبرالیزم وەکو سیستمی سیاسی. بەم مانایە پرۆسە جیاوازەکانی بەعەقلانیبوونی دونیا جۆرێک لە دەسەلات دەهێنێتە کایەوە، کە شێوازێکی یاسای و بیرۆکراسیی دەگرێتە خۆی کە لە فۆرمی لیبرالیزمدا ئامادەیە. بەلام ڤێبەر پێی وایە تەنانەت دەسەلاتی لیبرالییش، کە دەسەلاتێکی بیرۆکراسی و یاساییە، لە جەوهەری خۆیدا دەسەلاتێکی نیمچەتۆتالیتارە. بە مانایەکی دیکە فۆرمی بالادەستیی هەیمەنە لە دونیای مۆدێرندا، گەرچی فۆرمێکی یاسایی و بیرۆکراسییە، بەلام هاوکات هەلگری هەیمەنەی دەسەلاتێکی نیمچەتۆتالیتارییە.[1] بەم شێوەیە ماکس ڤێبەر دیدێکی هێجگار رەشبینی بەرانبەر بە دونیای مۆدێرن هەیە، ئەم دیدەش تەنها لە ئاستی سیاسیدا ئامادە نییە کە گەشەکردنی بیرۆکراسیەت وا دەکات دەسەلاتی دەولەت بۆ ناو وردەکارییەکانی ژیانی تاکەکەس و گروپەکان بگوازێتەوە، بەلکو تەواو وەک فریدریک نیتشە مۆدێرنە وەک نەخۆشییەکی میتافیزیکی وێنا دەکات، وەک سەردەمێک ئینسان تیایدا نەخۆشە نەک ئازاد. ئەم نەخۆشکەوتنەشی پەیوەندیی بەوەوە هەیە پرۆسەی بەبیرۆکراسیکردنی ژیان، کە ڤێبەر بە دەستەواژەی دروستبوونی "قەفەزی ئاسنین" ناوی دەبات و مرۆڤی دونیای مۆدێرن لەناویدا ژیان بەسەر دەبات، دەتوانێت بە ئاستێک بگات هەموو رۆحیەتێکی تاکبوون و تاکایەتی لە

1 -Allen, Kieran (2004). Max Weber. A critical introduction. London: Pluto Press. P 97-116

ئینسان بسێنێتەوە، ئەمە جگە لە هەر ئازادییەکی مانادار.[1] بە بۆچوونی من لەم ڕووەوە نزیکییەکی گەورە لەنێوان دیدی ماکس ڤێبەر و دیدی فرانز کافکادا بۆ مەسەلەی دەسەڵاتی بیرۆکراسیی مۆدێرن و گیرۆدەبوونی مرۆڤ بە یاسا و بەها و دەزگا و خواستەکانی ئەم بیرۆکراسیەتەوە، هەیە. لە سەرێکی دیکەوە ڤێبەر پێی وایە مۆدێرنە دەسەڵاتەکان لە دەستی کۆمەڵێک خەبیر، یان لێزانی ناو دەزگا بیرۆکراتەکاندا کۆ دەکاتەوە، ئەم لێزانانە دەبنە بکەرە سەرەکییەکانی ژیان لەناوکۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، ئەوان دەستنیشانی ئەوە دەکەن چی باشە و چی خراپ و چی تەندروستە و چی ناتەندروست. بەڵام ئەم لێزانانە ئەو کەسە ڕۆشنگەر و عەقڵانی و سەربەخۆ و ئازادانە نین کە بۆ نموونە فەیلەسوفێکی ڕۆشنگەری وەک ئیمانوێل کانت باسیان دەکات، عەقڵانیبوونیشیان ئەو عەقڵانیەتە نییە کە ڕۆشنگەری باسی دەکات، ئەمانە زیاتر ئەو فەرمانبەرە بیرۆکراتە بێهەست و بێدڵ و بێویژدانانەن کە فرانز کافکا لە ڕۆمانەکانیدا وێنەیان دەکێشێت و بێڕەحمانە باسیان دەکات. کەسانێکی بێڕۆح کە بەپێی کۆمەڵێک یاسای پێشوەختنووسراو و بەپێی تەعلیماتی ناو هەرەمیەتێکی بیرۆکراسیی دیاریکراوی دەسەڵات، بڕیار لەسەر شتەکان و دیاردەکان و ژیانی مرۆڤەکان دەدەن. ڤێبەر خۆی ئەم ئینسانانە کە مۆدێرنە دروست و سەروەریان دەکات لە

---

١ -بۆ پەیوەندیی نێوان ماکس ڤێبەر و نیتشە بڕوانە:
Kent, A. Stephen (1983). Weber, Goethe, and the Nietzschean Allusion: Capturing the Source of the “Iron Cage” Metaphor. Sociology of Religion, Volume 44, Issue 4, 1 December 1983, Pages 297–319

کتێبی: *"ئەخلاقیاتی پرۆتستانی و ڕۆحی کاپیتالیزم"*دا بەم جۆرە وەسف دەکات:

"کەس نازانێت کێ لە ئاییندەدا لەناو ئەم قەفەزە ئاسنینەدا دەژی، کەس نازانێت ئایا لە کۆتایی ئەم پێشکەوتنە گەورەیەدا پێغەمبەرێکی تەواو نوێ پەیدا دەبێت، یاخود سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەی بیرۆکە و ئایدیالە کۆنەکان دەبینین، یاخود هیچ یەکێک لەمانە نابێت و لەباتی ئەوان بەبەردبوونێکی میکانیکی ڕوو ئەدات، کە ڕازاوەیە بە سوود و قازانجی شەخسیی پڕ تەشەنوج. دەشێت بەرانبەر "دواهەمین مرۆڤ"ی ئەم پێشکەوتنە فەرهەنگییە بگوترێت: ئەمانە "کەسانی لێزانن بەبێ ڕۆح، چێژپەرست بەبێ دڵ، بوونەوەرێکی تەواو بێخەیاڵ".[1] "لێزانی بێڕۆح" و "چێژپەرست، بەلام بەبێ دڵ" و "کەسانێک بێخەیاڵ" ئەو ناوانەیە کە ماکس ڤێبەر بۆ مرۆڤی ناو سیستمی سەرمایەداری و کۆمەڵگا مۆدێرنەکانی بەرکار دەهێنێت. وێناکردنی ئەم کۆمەڵگایانە وەک "قەفەزێکی ئاسنین" و وێناکردنی بۆ عەقڵانیەت وەک ئامرازێک بۆ بەرهەمهێنانی کەسانی بێخەیاڵ و بێدڵ و بێڕۆح، وێناکردنێکە دواتر لەسەر دەستی نووسەرانی "قوتابخانەی فرانکفۆرت"دا گەشەی زیاتری پێ ئەدرێت و باس لە مەترسیی کورتبوونەوەی عەقڵانیەت بۆ "عەقڵانیەتێکی ئامرازی" دەکرێت کە دونیا بۆ سۆپەرمارکێتێکی گەورە کورت دەکاتەوە و "مرۆڤی تاکڕەهەند" دروست دەکات.

1 -*Weber, Max (1992). The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism*, T. Parsons (trans.), A. Giddens (intro), London: Routledge. P 182..

**بەعەقلانیبوونی دونیا و پێگەی دین**

بەکورتی پرۆسەی هەرەسەرەکی و هەرەبنەڕەتیی لەدایکبوونی مۆدێرنە لای ڤێبەر پرۆسەی بەعەقلانیبوونە، بەڵام ئایا ئەم باڵادەستبوونەی عەقلانیەت چ دەرەنجامێکی بۆ شوێن و جێ و پێگەی دین لە دونیای مۆدێرندا هەیە و چ ڕۆڵ و کاریگەرییەک بۆ دین لە ژیانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەو دونیایەدا دەهێڵێتەوە؟ هەردوو کتێبی "ئەخلاقی پرۆتستانی و ڕۆحی کاپیتالیزم و کتێبی *"ئابووری و کۆمەڵگا"*ی ڤێبەر تەرخانە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە. تێزەکەی ڤێبەر زۆر سادە و گشتگیرە، بەڵام کاریگەرییەکی هێجگار گەورە لەسەر ژمارەیەکی زۆر لە زانای کۆمەڵایەتییەکانی دوای خۆی بەجێ دەهێڵێت و لە ڕاستیشدا بەرز دەبێتەوە بۆ ئاستی پارادیمێکی زانستی. تێزەکەش بەم جۆرەیە: سەردەمی ڕۆشنگەری دونیابینییەکی عەقڵانی بەرانبەر بە جیهان بەرهەم دەهێنێت، کە لەسەر لێکۆڵینەوەی تەجریبی و مەعریفەی زانستی و پاسادانکردن و سەلماندن کار دەکات، هەروەها تەکنولۆژیایەکی تازە دێتە کایەوە کە هاریکاریی مرۆڤ دەکات بۆ ئەوەی بتوانێت بەسەر سروشت و گەردووندا زاڵ ببێت و بیانهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەم گەشەکردنە گەورەیەی عەقلانیەتە وا دەکات بۆچوون و لێکدانەوە بنەڕەتییەکانی دین چیتر لە کۆمەڵگای مۆدێرندا قبووڵ نەکرێت. بەمەش ئەو دوژمنە سەرسەختەی ڕۆژگارێکی درێژ لەبەردەمی زانستدا بوو، مەبەست لێرەدا دونیابینیی ئایینییە، لەناو دەچێت و

فەزایەکی ئازاد لەبەردەم گەشەکردنی بیرکردنەوەی زانستیدا دەکرێتەوە. ئەم لەدەستدانی باوەڕە بە دین وا دەکات دین هەم وەک دونیابینی و عەقیدە و باوەڕ و هەم وەکو دەزگا و ڕێکخراوە و هەم وەک پراکتیک و هەڵسوکەوت لاواز ببێت. بەکورتی لەدایکبوونی مەعریفەی زانستی و بەگەڕخستنی ئەم مەعریفەیە لە ئاستی تەکنۆلۆژیدا و گۆڕینی بۆ ئامێر، لەگەڵ گەشەکردن و فراوانبوونی سیستمی پەروەردە و خوێندنی نوێشدا و زیادبوونی ژمارەی ئەوانەی کە دەتوانن بخوێننەوە و فێر ببن، پێگە و ڕۆڵ و تواناکانی دین لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا تەواو لاواز دەکات. لەم دونیا تازەیەدا کارەساتە تاکەکەسییەکان، کارەسەتاکانی ناو سروشت، بۆ نموونە بوومەلەرزە و بورکان و لافاوە گەورەکان، بارین و نەبارینی باران، جەنگی نێوان میلەتان، هەموویان لەلایەن زانستە تازەکانەوە لێک ئەدرێنەوە و چیتر پیاوانی دین و بیرکردنەوەی سیحری ئەو سەرچاوانە نین کە ئەو دیاردانە لێک بدەنەوە و بە کۆمەڵگادا بڵاوی بکەنەوە. هۆکاری ئەو کارەساتانەش چیتر گرێ نادرێنەوە بە هێزێکی ئاسمانیی یان سروشتی و یان ئینسانییەوە، یان گرێ بدرێن بە قەدەر و چارەنووسێکی کوێرانەوە کە نەکرێت لێک بدرێتەوە، بەڵکو گرێ ئەدرێنەوە بە هۆکارە فیزیای و بایۆلۆژی و مادییەکانیانەوە. ئیتر پیاوانی دین و سیحربازان ئەو کەسانە نین کە دیاردەکان لێک بدەنەوە و بە کۆمەڵگا بڵێن شتەکان بۆ بەو شێوەیە دێن و تێدەپەڕن، لەپاڵ پیاوانی دینییشدا ژمارەیەکی گەورە لە مامۆستا و پزیشک و ئەندازیار و

فیزیاناس و سایکۆلۆژیست و زانا و لێزانە جۆربەجۆرەکانی تر لەدایک دەبن و لە ڕێگای زانیاریی زانستی و مەعریفەی نوێوە دونیا و دیاردە جۆربەجۆرەکانی لێک ئەدەنەوە.[1]

بەکورتیەکەی ڕۆشنگەریی لە ڕێگای بیرکردنەوەی زانستییەوە شەپازلەیەکی گەورەی لە هەموو شێوازەکانی بیرکردنەوەی میتافیزیکی وەشاند، لەپێش هەموانیشەوە لە دین. ئەوەی کە ئاڵۆز و نەناسراو بوو لەلایەن دەسەلات و تواناکانی عەقڵی ئینسانەوە پەلامار ئەدرێت و لە ڕێگای تەکنۆلۆژیاوە نهێنییەکانیان دەدۆزرێنەوە و دەهێنرێنە ژێر ڕکێفی مرۆڤەوە. ئەوەی کە نەناسراو و نەزانراو بوو، ئەوەی کە جاران دین و میتافیزیک، ڕاڤەیان دەکرد و لێکیان ئەدایەوە، ئێستا ئیتر لێکدانەوەی زانستی و لۆژیک و دیدی عەقلانی لەناو زانستەکانی وەک فیزیا و بایۆلۆژیا و کیمیا و پزیشکی و هەندەسە و ماتماتیکەوە دەناسرێن و شی دەکرێنەوە.

جگە لەو گەشەکردنە زانستی و مەعریفییەی باسمان کرد ماکس ڤێبەر بەدرێژیی باس لە سیستمی یاسایی و سیاسیی دونیای مۆدێرن و جیاوازییەکانی لەگەڵ دونیای بەر لە مۆدێرندا دەکات. وەک هێمام پێ کرد یەکێک لە مانا گرنگەکانی بەعەقلانیبوونی دونیا لای ڤێبەر مانای

---

١ بڕوانە:

Daniel Bell. 1999. The Coming of Post-Industrial Society. NY: Basic Books

هەروەها بڕوانە:

Steve Bruce. 2002. God is Dead: Secularization in the West. Oxford: Blackwell. P.36-37-38.

دروستبوونی "شێوازێکی تازەی هەیمەنە"یە کە بناغەیەکی یاسای و بیرۆکراسیی هەیە. ڤیبەر پێی وایە ئەم هەیمەنە تازەیە جێگای هەردوو شێوازەکەی "هەیمەنەی تەقلیدی" و "هەیمەنەی کاریزمی" دەگرێتەوە. لەهەیمەنەی تەقلیدیدا دەسەڵاتداران لەسەر بنەمای خوورەوشتی کۆمەڵایەتیی تەقلیدی و لەسەر بنەمای عادات و تەقالید و بەها کۆن و دێرینەکان حوکم دەکەن. خاڵی هەرەسەرەکی لەم بەهایانەدا ئەوەیە دەسەڵاتدار بە ناوی مافێکی خودابیەوە یان بە ناوی ویراسەتەوە حوکم دەکات، خۆیشی کەسایەتییەکی موقەدەسە و ئەم موقەدەسبوونەشی لە خوداوە بۆ ماوەتەوە. دین لێرەدا بنەمای دەسەڵاتدارێتی و بنەمای ئەو بەهایانەیە کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییەکانی دەسەڵات ڕێک دەخەن. ئەم شێوە دەسەڵاتە لە دەسەڵاتی پادشا کۆنەکان و سوڵتانەکان و دەرەبەگە خاوەن زەوییەکان و سەرکردە دینییەکان و سەرۆک خێڵەکانی ناو کۆمەڵگا تەقلدییەکاندا، دەر دەکەوێت. ئەم حوکمڕانانە نە هەڵبژێردراون، نە ئۆفیس و مەکتەبی تایبەتیان بۆ حوکمڕانی هەیە، نە یاسا و بەهای نووسراو هەیە ئاراستەی هەڵسوکەوتەکانیان بکات، نە جیهازی بیرۆکراسییان هەیە، ئەوەی هەیانە شێوازێکی ڕاستەوخۆ و شەخسیی حوکمکردنە کە پەنای بۆ دەبەن و پیادەی دەکەن. ئەم جۆرە دەسەڵاتە "رەعیەت"یشی هەیە نەک هاوڵاتیی خاوەن ماف، دین بنەماکانی دەستنیشان دەکات نەک پەیمان یان کۆنتراکت یان بەهای سیاسی و یاسایی ناشەخسی، سیستمێکی بیرۆکراسیی بوونی نییە ئەم دەسەڵاتە شانی دادابێتە سەر.

"هەیمەنەی کاریزمی"یش هەیمەنەیەکە لەسەر گریمانکردنی هەبوون و ئامادەگیی هەندێک توانای دەگمەن و بێوێنە و سروشتی لە هەندێک تاکەکەسدا کار دەکات کە بەسەریەکەوە وا دەکەن بتوانێت کاریگەریی لەسەر دەوروبەرەکەی دابنێت و وەک کەسێکی زیرەک و کەموێنە مامەڵەی بکەن، تا ئەو شوێنەش وەک کەسێکی موقەدەس وێنای بکەن. ڕەگوڕیشەی ئەم شێوازەش لە دەسەلات دیسانەوە ڕگوڕیشەیەکی دینییە. لای ڤیبەر، کاریزما هەندێک توانا و سیفەتی تایبەتە کە خوداوەند بەم یان بەو ئینسانی بەخشیوە و بە ئەوانی تری نەبەخشیوە. خودا وای لەم کەسە تایبەتانە کردوە تواناداربن و بتوانن ببن بە سەرکردە و دەسەلات بگرنە دەست. ئەوەشی دەسەلاتی کاریزمی داوای دەکات باوەڕبوونێکی بێپرسیار و بێگومانکردنە بە سەرکردە کاریزمییەکان و باوەڕ بە توانا و مانا دینی و سیحرییەکەی بوونی ئەو وەک سەرکردەیەکی کاریزمی. ئەم جۆرە دەسەلاتەش لە ئیشکردنی خۆیدا "هەوادار" دروست دەکات نەک هاولاتیی خاوەن ماف و بەرپرسیاریتی.[1] بەلام بەلای ڤیبەرەوە "هەیمەنەی یاسایی و عەقلانی" لە دونیای مۆدێرندا هەیمەنەیەکی نادینییە، دەسەلاتێک هەڵی گرتوە کە عەلمانییە و لەناو سیستمێکی بیرۆکراسیدا نیشتەجێیە کە کەسانی لێزان و فەرمانبەرانی بیرۆکرات بەڕێوەی دەبەن.

لە ئاستی ئابوورییشدا ئەوەی دروست دەبێت سیستمی

1 -Allen, Kieran (2004). Max Weber. A critical introduction. P 97-116

کاپیتالیزمـە، کـە بـە بۆچوونـی ڤێبـەر جگـە لـەوەی سیسـتمێکە لەسـەر عەقڵانیەتـی حیسـابکردنی وردی ئەگەرەکانی قازانـج و زیانکـردن کار دەکات، هـاوکات سیسـتمێکە تەمـاح و حـەزی هەبوونـی شـتومەکی زۆر و بێشـومار، حـەزی نوقمبـوون لەنـاو دونیـا و چێژەکانیـدا، دەگۆڕێـت بـۆ بەهـای ئەخلاقیـی گرنـگ و تـازە. گۆڕینـی تەمـاح و ویسـتی هەبـوون دەبێتـە بنەمایەکـی ئەخلاقیـی گرنگـی نـاو ئـەم دونیـا تازەیـە و هیـچ پەیوەندییەکیشـیان بـە دینـەوە نامێنێت. بەشـێکی زۆری کتێبـی "*ئەخلاقـی پرۆتسـتانیزم و ڕۆحـی کاپیتالیـزم*" تەرخانـە بـۆ باسـکردنی ئـەم مەسـەلەیە.[١]

**دەسەلاتێکی ناشەخسی**

خاڵێکـی گرنگیـی تێـزەی بەعەلمانیبوونـی دونیـا و لاوازبوونـی ڕۆڵـی دیـن لای ماکـس ڤێبـەر، پەیوەسـتە بـە لەدایکبوونـی فۆرمێکـی نـوێ لـە دەسـەلاتەوە کـە دەسـەلاتێکی ناشەخسـی و بیرۆکراسـییە. لای ڤێبـەر دەسـەلات لـە دونیـای مۆدێرنـدا ناشەخسـییە و یاسـا هەڵسـوکەوت و کارەکانـی ڕێـک دەخـات، میکانیزمـی دیاریکـراوی کارکـردن و چاودێریکردنـی هەیـە، دەزگای بیرۆکراسـیی گـەورە دروسـت دەکات، لەدروسـتکردن و مانـەوە و کارکردنـی ئەمانـەدا دیـن هیـچ ڕۆڵێـک ناگێڕێـت. ئەوانـەی لێـرەدا هەیمەنەیـان هەیـە دەزگاکانـن نـەک تاکەکەسـەکان، بیرۆکراسیەتە نـەک خواسـتی تاکەکەسـی، یاسـا

1 *Weber, Max (1992). The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism*, T. Parsons (trans.), A. Giddens (intro), London: Routledge. P 71-74

و نۆرمی دیاریکراوە نەک هەست و خواستی دینی. ئەوەی چۆنیەتیی هەڵسوکەوتی دەزگاکان ئاراستە دەکات ڕێسا و سنوور و سەلاحیەتی بیرۆکراسییانەی ئەو دەزگایانەیە، نەک حەز و ویست و زەوقی تاکەکەسەکان، نەک ئیرادەیەکی خودایی و دینی یان ئەم یان ئەو بەها و کەلەپووری ئایینییەوەک پێشتر وتم ڤێبەر دیدێکی کافکایی بەرانبەر بەم گەشەسەندنەی بیرۆکراسیەت هەیە و لە ڕاستیدا مرۆڤی ناو دونیای مۆدێرن وەک کەسێکی زیندانکراو لەناو "قەفەزی ئاسنینی" بیرۆکراسیەتدا وێنا دەکات. هۆشیاری تاکەکەسی و دەستەجەمعییش لای ڤێبەر هۆشیارییەکە ئەم دەسەڵاتە مۆدێرنە چووەتە ناوییانەوە و لە ناوەوەڕا ئاراستەیان دەکات. ئەگەر لای مارکس میکانیزمە ئابوورییەکان و پێگەی چینایەتیی هۆشیاری ئاراستە بکات و لای فرۆید سێکس ئەم کارە ئەنجام بدات، ئەوا لای ڤێبەر، زۆر بەر لە تێزەکانی میشێل فۆکۆ، دەسەڵاتی بیرۆکراسیی ئەم کارە دەکات. بەم مانایە دیدی ڤێبەر بەرانبەر بە دونیای مۆدێرن دیدێکی ڕەخنەییە، بەڵام ئەم ڕەخنەییبوونەی مانای بانگەشەکردن نییە بۆ گەڕانەوە بۆ دونیای بەر لە مۆدێرن و بە هیچ مانایەکیش مانای گەڕاندنەوە نییە بۆ دین، کە ڤێبەر زۆربەی کات وەک بیرکردنەوەیەکی سیحری و ناعەقڵانی وێنای دەکات.

**مەسەلەی شەرعیەت**

ئەو خاڵەی لە پەیوەندیدا بەم نووسینەی منەوە گرنگییەکی تایبەتیی هەیە: مەسەلەی شەرعیەتی ئەم سیستمە یاسایی و عەقڵانییە بیرۆکراسییە تازەیە. ئایا شەرعیەتی ئەم

سیستمە لەکوێوە دێت؟ ڤیبەر لەم بابەتەدا تەواو ئاشکرایە: ئەم سیستمە تازەیە پێویستی بە دین نییە بۆ ئەوەی ڕەوایەتیی سیاسیی پێ ببەخشێت، ئەوانەشی بەگەڕخستن و بەڕێوەبردنی سیستمەکەیان لەسەر شانە، کەسایەتی و پیاوانی دین نین. دین خۆیشی بەشێک نییە لە سیستمی حوکمڕانی و پرنسیپە دینییەکان ئەو پرنسیپانە نین کە کۆمەڵگا و دەوڵەت و بیرۆکراسیەتی مۆدێرن ئاراستە دەکەن. هەموو ئەمانە وا دەکەن دین لەم ئاستەشدا ئەو ڕۆڵەی لە کۆمەڵگاکانی بەر لە مۆدێرنەدا هەیبوو، نەیمێنێت و تا دەوڵەتیش تازەتر و مۆدێرنتر ببێتەوە دین لاوازتر و پەراوێزتر ببێت. بەم مانایە هەیمەنەی بیرۆکراسیەت، کە وەک وتم هەیمەنەیەکی یاسای و عەقڵانییە، هۆکاری سەرەکیی لاوازبوونی دەسەڵاتی دینە لە ئاستی سیاسی و حوکمڕانیدا لە کۆمەڵگای مۆدێرندا. خاڵی سەرەکییش لای ڤیبەر لە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵگاکاندا پەڕینەوەیە لە دەسەڵاتی تەقلیدی و کاریزمییەوە بۆ دەسەڵاتی یاسایی و عەقڵانی، ئەمەش هاوشانە بە کەمبوونەوەی کاریگەریی دین لەسەر سیاسەت و لەسەر کۆمەڵگا و لەسەر کایە تازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی.

### داماڵینی سیحر لە دونیا

سەرجەمی ئەو پرۆسانەی باسمان کرد وا لە ماکس ڤیبەر دەکات باس لە پرۆسەی "داماڵینی سیحر لە دونیا" بکات و دونیای مۆدێرن وەک دونیایەکی بێدین یان دونیایەک بە دینێکی

لاواز و بێکاریگەرییەوە وێنا دەکات.[1] وەک بە ناوەکەیدا دیارە "پرۆسەی داماڵینی دونیا لە سیحر" پرۆسەیەکە دونیا دەکاتە دونیایەکی بەتاڵ لە دین، بەڵام پڕ لە فەرمانبەری بیرۆکراس و پڕ لە عەقڵانیەتی حیاسبکردن و پێوان و بەراوردکاری و وردکردنەوەی بڕیارەکان بۆ ئەگەرەکانی سەرکەوتن و دۆڕاندن. لە ئاستی مەعریفیشدا لەدایکبوونی زانستە نوێکان وا دەکەن ئینسان چیدی باوەڕی بە هێز و لێکدانەوە سیحرییەکان نەمێنێت و بەوە مەحکوم بێت لە دونیایەکدا بژی پێویستی بە خوداکان نەمابێت و نهێنییەکی ئاسمانییش نەمابێت دین لەباتیی زانست بتوانێت لێکی بداتەوە. لای ڤێبەر دونیای داماڵدراو لە سیحر، دونایەکە بە کەمترین شیعر و بە زۆرترین ئینشاوە، دونیایەکە بێرۆح، قەفەزێکی ئاسنینە و مرۆڤ لەناویدا مەحکومە بە یاساکانی قەفەزەکە. بەڵام ڤێبەر باوەڕی وا بوو کە دونیای مۆدێرن لەئاستی مەعریفی و لە ئاستی چالاکیدا بە ڕادەیەک پڕ دەبێت لە جیاوازی و بە ڕادەیەک کایەی زانستیی جیاواز و چالاکیی جیاوازی تیادا دروست دەبێت، هیچ یەکەیەکی گشتی و هاوبەش ناتوانێت بەها جیاوازەکانی ئەو کایانە و ئەو چالاکییانە بەیەکەوە کۆ بکاتەوە. لە دونیای مۆدێرندا هەر کایەیەک و هەر چالاکییەک دەبێتە دروستکەر و پارێزەری بەهای تایبەت بە خۆی، بەمەش ئەو زەمینە کۆمەڵایەتی و فیکرییە کۆتایی پێ دێت

---

[1] - دەربارەی چەمکی "داماڵینی سیحر لە دونیا" بڕوانە:

Max Weber (1958). “Science as Vocation” in: Hnas H Gerth and C Wright Mills, eds. From Max Weber: Essays in sociology. New York. P 155-156.

کە دەتوانێت ببێتە بنەمای دروستبوونی یەک سیستمی بەها و یەک ئەخلاقی یەکگرتوو بۆ هەمووان، یان ببێتە بنەمای بەرهەمهێنانی یەک جیهانبینی بۆ هەموو کۆمەڵگا، ئەمەش وا دەکات کۆمەڵگا ببێتە سەرزەمینی دروستبوونی ئەخلاق و بیرکردنەوە و دید و ڕوانینی جیاواز و ناکۆک و ناتەبا بەیەکتری. ئەوەی وا دەکات کۆمەڵگا مۆدێرنەکان نەتوانن خودایەکی هاوبەش بەرهەم بهێنن دروستبوونی ئەو بنەما کۆمەڵایەتی و فیکری و ئەخلاقییە پرجیاوازییانەیە کە باس کران، ئەو کۆمەڵە بنەمایەش ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ و سەرەکین بۆ پرۆسەی بەعەلمانیبوونێکی هەمەلایەنەی دونیا.

## دین و سەرمایەداری

بێگومان ماکس ڤێبەر پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان ئایین و دروستبوونی دونیای مۆدێرنیشدا دەبینێت، بەتایبەتی لەنێوان ئەخلاقیاتی پرۆتستانی و ڕۆحی سیستمی سەرمایەداریدا. ڤێبەر ئایینی پرۆتستانی، بەتایبەتی ڕێبازی کالڤینیزم لەناویدا، بە سەرچاوەیەکی گرنگی دروستبوونی سیستمی سەرمایەداریی مۆدێرن دەزانێت. بەم مانایە ماکس ڤێبەر یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی لەدایکبوونی دونیای نوێ بە دینەوە گرێ ئەدات. تێزەی سەرەکیی کتێبی "ئەخلاقیاتی پرۆتێستانیزم و ڕۆحیی کاپیتالیزم" نیشاندانی ڕەگوڕیشە دینییەکانی کاپیتالیزمە، قۆناغی سەرەتایی دروستبوونی کاپیتالیزم و بەها دینیەکانی کالڤینیزمی بەتوندنی بەیەکەوە گرێ دراوە. بەڵام ڤێبەر باوەڕی وایە ئەم کاریگەرییە

تەنها لە قۆناغەکانی سەرەتای دروستبوونی سەرمایەداریی مۆدێرندا ئامادە بووە و کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکان هەر زوو ئەو ڕەگوڕیشە دینییەی بەشدارن لە دروستبوونیدا، بەجێ دەهێڵن و عەقڵانیەتی نوێ دەکەنە بنەمای کارکردن و گەشەکردنیان.

بە شێوەیەکی گشتی ماکس ڤێبەر باوەڕی وایە کە دینەکان ڕێگرن لەبەردەمی دروستبوون و گەشەکردنی کۆمەڵگای مۆدێرندا، تەنها پرۆتێستانیزم نەبێت، بەتایبەتی ئاراستەی کالڤینیزم لەناو پرۆتستانیزمدا. بە بۆچوونی ڤێبەر دینەکان بڕێکی زۆر لە سیحر و خورافەت و ناعەقڵانیەتیان تێدایە کە ڕێگرن لەبەردەم دروستبوونی عەقڵیەتی حیسابکاری سەرمایەداریدا، ئەمە جگە لەوەی کە خاڵی سەرەکیی زۆربەی دینەکان بریتییە لە بیرکردنەوە لەو ژیان و دونیا و بوونە ئاسمانییەی کە هەڵگیراوان بۆ دوای مردن و دەکەونە دەرەوەی ئێرە و ئێستاوە. زۆربەی دینەکان ژیانی سەرزەمین وەک سەفەرێکی کورت و تێپەڕ و وەک بەردەبازێک بەرەو پەڕینەوە بۆ ژیانێکی جاویدانە لە ئاسماندا، وێنا دەکەن. هەموو ئەمانەش ڕۆحی زوهد و دژەدونیای و پاشەکشێکردن لە جیهان بەهێز دەکەن و کۆمەڵێک بەها و ڕوانین گەشە پێ ئەدەن کە دژ بە کاپیتالیزم و عەقڵانیەتی ناوەکیی سیستمی کاپیتالیزمن. بە بۆچوونی ڤێبەر هەندێک لە دینەکان، لێرەدا ڤێبەر باس لە ئیسلام دەکات، لەباتیی گەشەدان بە ڕۆحیەتی بەرهەمهێنان و ڕۆحیەتی گەڕانێکی بەرهەمهێنانە بەدوای قازانجدا، دینی جیهاد و شەڕوشۆڕ و پەلاماردانی سەربازین،

ئەم شتانەش نەک هاریکاریی ئەوە ناکەن سەرمایەداریی وەک سیستم دروست ببێت، بەڵکو دژ بە سەرەتا هەرە سادەکانی دروستبوونی ئەو سیستمە کار دەکەن. ئەگەر سەرمایەداری پێویستی بە بەرهەمهێنان و کارکردنی چالاک و ئاسایش و جێگیریی بەردەوام هەبێت و پێویستی بە گەڕانی بەردەوام و بێماندووبوون بێت بەدوای قازانج و بازاڕدا، ئەوا، بە بۆچوونی ڤێبەر، دینێک کە شەڕوشۆڕ و پەلاماری سەربازی و جیهاد بەشە گرنگەکەی بێت، ناتوانێت پێداویستییەکانی سیستمی سەرمایەداریی مەیسەر بکات. لەم ڕووەوە ماکس ڤێبەر باوەڕی وایە کە ئیسلام تەواو ناکۆکە بە پرۆتستانیزم و بەتایبەتی بە کالڤینزیم، بۆیە دینێکە ناتوانێت هاریکاری لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن و کاپیتالیزم بێت.[١] دروستبوونی سەرمایەداری مانای سەرکەوتن بەسەر سەرجەمی ئەو ڕێگرە دینییانەدا کە ناهێڵن سەرمایەداری وەک سیستمێکی بەرهەمهێن دروست ببێت، مانای سەرکەوتنی فشاری سیستمی کارکردنی دونیایی و پارەپەیداکردنی مۆدێرن بەسەر ئەمر و نەهی و حەلاڵ و حەرامە دینییەکاندا. دروستبوونی سەرمایەدارییش وەک سیستم مانای ئەوەی دین ئەو هێزەی نەماوە کە بتوانێت ڕێ لە دروستبوونی ئەم سیستمە بگرێت.

بە بۆچوونی من ئەم ڕوانینانەی ڤێبەر بۆ پەیوەندیی نێوان دین و کاپیتالیزم کێشەی زۆر گەورەیان تێدایە و لەزۆ

١ بۆ ڕوانینی کامس ڤێبەر سەبارەت بە ئیسلام بڕوانە:
Sukidi (2006). Max Weber's remarks on Islam: The Protestant Ethic among Muslim puritans. Islam and Christian-Muslim Relations. Volume 17, 2006. Issue 2.

رووپشەوە ناڕاستن، یان بەو ڕەهاییبە ڕاست نین کە ڤیبەر گریمان و باسی دەکات، چونکە ئەمڕۆ بەشی هەرە گەورەی دونیای ئیسلام و موسڵمانان، ئەگەر نەڵێم هەمووی، لەناو سیستمی سەرمایەداریدا دەژین و ئەم سیستمە شێوازی سەرەکی و بنەڕەتیی بەرهەمهێنان و ئیشکردن و کەڵەکەکردنی سەرمایەیە لەو بەشەی دونیادا کە ئیسلام تیایدا دینی باڵادەستە، هاوکات لە دۆخێکیشدا تیایدا ئیسلام لە هەموو کاتێکی تر زیاتر ئامادە و بەهێزترە لەناو ژیانی ڕۆژانە و ژیانی فەرهەنگی و سیاسیی ئەو کۆمەڵگایانەدا. وەک پێشتر هێمامان پێ کرد ڤیبەر پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان پرۆتستانیزم، بەتایبەتی ڕێبازی کالڤینزیم و دروستبوونی سەرمایەداریدا گریمان دەکات، بەڵام هاوکات پێ لەسەر ئەو خاڵەش دادەگرێت کە سەرمایەداریی مۆدێرن لەدوای دروستبوونیەوە پێویستی بەو ڕۆحە دینییە نامێنێت بۆ گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی بە دونیادا. ئەگەر جەوهەری سەرمایەداری لەسەر ئیشکردن دروست بووبێت، ئەوا لە تێزەی سەرەکیی کتێبی "ئەخلاقی پرۆتستانی و ڕۆحی سەرمایەداری"دا بەم جۆرەیە: ئەگەر ئینسان بە درێژاییی مێژووی خۆی ئیشی کردبێت بۆ ئەوەی بژی، ئەوا لەناو ئایینی پرۆتستانیەتدا ئینسان دەژی بۆ ئەوەی ئیش بکات. کارکردن و ڕەنجکێشان لە پرۆتستانیزمدا بۆ ئاستی شتێکی موقەدەس بەرز کراونەتەوە و ئەرکی ئینسان لە دونیادا ئەوەیە ڕەنج بکێشێت و کار بکات بۆ ئەوەی بتوانێت لە خوداوەند نزیک بکەوێتەوە و لەوەش

دڵنیا بێت کە سەر بەو گروپە ئیماندارەیە کە خودا بڕیاری داوە بیانخاتە بەهەشتەوە. سەرکەوتن و پێشکەوتنی ئینسان لە ژیانی سەرزەمینیدا لە ڕێگای ئیش و ڕەنجکێشانەوە، هێمایە بۆ ڕازیبوونی خودا لەو ئینسانە و ئەم ڕازیبوونەش مانای پاداشتدانەوەی ئەو ئینسانەیە بە بەهەشت. بە بۆچوونی ڤێبەر ئەم باوەڕە دینییە پرۆتستانییە وا دەکات ئینسان نەک تەنها خوو بە کارکردنەوە بگرێت، بەڵکو کارکردن وەک جۆرێک لە ئیدمان و موعتادبوونی لێ بێت، ببێت بە شتێک گەر ئینسان بیەوێت لە دونیا و قیامەتدا ڕزگاری ببێت، ناچار بێت پەنای بۆ ببات و ژیانی خۆی بۆ تەرخان بکات. وەک وتم لای پرۆتستانتەکان ئینسان لە ڕێگای کارکردنەوە لە خودا نزیک دەکەوێتەوە، سەرکەوتن لەم دونیایەدا نیشانەیە بۆ سەرکەوتن لە قیامەتدا. ئەم ئیشپەرستی و بەرزڕاگرتنەی ئەخلاقیاتی ئیشکردن بەشێکی گرنگی ئەخلاقیاتی سەرمایەدارییشە. بە بۆچوونی ڤێبەر ئەم ئەخلاقیاتی ئیشپەرستییەی پرۆتستانیزمە وا دەکات ئەم دینە زۆر نزیک بێت لە ڕۆحی سەرمایەدارییەوە، ڕۆحێک لە لایەکەوە لەسەر کارکردنی زۆر و بەردەوام کار دەکات و لە لایەکی ترەوە لەسەر کەڵەکەکردنی سەرمایە و خستنەگەڕی بەردەوامیی ئەو سەرمایەیە لە پرۆژەی نوێدا بە مەبەستی دەوڵەمەندبوونی زیاتر و زۆرتر. پرۆتستانیزم وەک سەرمایەداریی دەوڵەمەندبوون و سەرکەوتن لە ژیانی سەرزەمینیدا وەک هێمایەک بۆ ڕازیبوونی خودا لە ئینسان وێنا دەکات. بە بۆچوونی ڤێبەر هەموو ئەمانە وا دەکەن

پرۆتستانیەت ئەو ڕۆڵە گەورەیە ببینێت لە دروستبوونی سەرمایەداریی مۆدێرندا. ئەم تێزەی ڤێبەر لە زیاد لە سەرێکەوە ڕەخنە کراوە و کورتهێنان و ناڕاستییەکانی سەلمێندراوە، باسکردنی ئەم ڕەخنانە دەکەوێتە دەرەوەی مەبەستی ئەم نووسینە.

### دەرئەنجام

بەکورتی؛ ئەگەر دین لای کارل مارکس ئامرازێکی سەرەکیی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵایەتی و چاودێریکردنی چینایەتی بێت، واتە ڕێگر بێت لەوەی مرۆڤە ئاساییەکان دونیاکەی خۆیان بگۆڕن و دونیایەکی نوێ دروست بکەن، ئەوا لای ماکس ڤێبەر دەبێتە یەکێک لە هۆکارە هەرەسەرەکییەکانی گۆڕانکاری، گۆڕانکاریی گرنگیش، لەوانە دروستبوونی سەرمایەداری وەک فۆرمی سەرەکیی هاتنەکایەی دونیای نوێ. بەڵام دین دوای دروستبوونی سەرمایەداری ئیتر ئەو پێگە و هێز و ڕۆڵەی نامێنێت کە پێشتر هەیبووە و تەواو دەکەوێتە پەراوێزەوە. سەرمایەداری لە گەشەی خۆیدا دەبێتە سیستمێکی سەربەخۆی بێدین و بێخودا و بێڕۆح و بەدونیادا بڵاو دەبێتەوە. دین لە دونیای مۆدێرندا نەک تەنها لاواز و بێکار و بێکاریگەری دەبێت، بەڵکو ئەم لاوازبوونە دەبێتە پێشمەرجی دروستبوونی ئەو دونیا مۆدێرنە. بەم جۆرە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەبێتە تێزەی سەرەکیی دروستبوونی دونیای مۆدێرن و لۆژیکی ناوەکیی سەرمایەداری و مۆدێرنە خۆیشی. ئەوەی دۆرکهایم و ماکس ڤێبەر لەسەر دین دەیڵێن و ئەوەی

نووسەرەکانی تری سەدەی نۆزدەهەم دەینووسن، دواجار لای کۆمەڵناسێکی ئینگلیزی، بە ناوی "بریان ویلسون"ەوە کۆ دەکرێتەوە و تێزە هەرەسەرەکییەکەی عەلمانیەت و بەعەلمانیبوونی دونیای لێ دروست دەکرێت. بریان ویلسۆن، بە گەڕاندنەوەیەکی بەردەوام بۆ ڤێبەر، تێزەی عەلمانیەت دەکات بە تێزەی هەرەسەرەکیی ناو زانستی کۆمەڵناسیی مۆدێرنە. لە بەشی داهاتوودا باس لە ڕوانین و لێکدانەوەکانی ئەم کۆمەڵناسە ئینگلیزە دەکەم، بۆ ئەوەی لە لاپەڕەکانی دواتری ئەم کتێبەدا باس لە بەشێک لەو ڕەخنە گەورە و هەمەلایەنانە بکەم کە لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا گیراوە و دەگیرێت.

# سەرچاوەکان

Allen, Kieran (2004). Max Weber. A critical introduction. London: Pluto Press.

Daniel Bell. 1999. The Coming of Post-Industrial Society. NY: Basic Books

R. Collins (1986). Max Weber: A selective Key. London: Sage. P. 63.

Bruce, Steve. 2002. God is Dead: Secularization in the West. Oxford: Blackwell.

Weber, Max (1958). "Science as Vocation" in: Hnas H Gerth and C Wright Mills, eds. From Max Weber: Essays in sociology. New York. P 155-156.

Weber, Max (1995). The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism. Translated by Talcott Parsons with a new introduction

by Anthony Giddens. New York: Charles Scribner's Sons.-

Weber, Max (2005). Max Weber: Readings and Commentary on Modernity. S. Kalberg (Ed.)

# دروستبوونی پارادایمی عەلمانیەت (٥)
# بریان ویلسن
# حەتمیەتی بەعەلمانیبوونی دونیا

**سەرەتا**

بریان ویلسن (١٩٢٦-٢٠٠٤) ئەو کۆمەڵناسە بەریتانییەیە کە بە ئالاهەڵگری تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دادەنرێت، لە ٤٠ ساڵی ڕابردوودا کەم کۆمەڵناس هەیە بە ئەندازەی ئەم پیاوە بەرگریی لە هێڵە سەرەکییەکانی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیای لە سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە تا ئەمڕۆ، کردبێت. بریان ویلسن پرۆفیسۆری کۆمەڵناسی بوو لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، لە بواری کۆمەڵناسیی ئاییندا کارگەلێکی زۆری ئەنجام داوە و نووسینێکی زۆری لەسەر گروپ و سێکتە دینییەکان لە دونیای مۆدێرندا هەیە. لە سەرەتای هەفتاکانی سەدەی بیستەمدا بۆ ماوەی چەند ساڵێک سەرۆکی "کۆمەڵەی نێودەوڵەتیی سۆسیۆلۆژیای دین" بووە و لە چەندان زانکۆی جیاوازی دونیادا دکتۆرای فەخریی لە بواری کۆمەڵناسیی دیندا پێ بەخشراوە. بەشێکی گرنگی نوسینەکانی لە بوای

تیورەی بەعەلمانیبونی دونیادایە. ئەم پیاوە بەشی هەرەزۆری تێزەکانی ماکس ڤێبەر لەسەر عەقلانیەت و لەسەر لاوازبوونی دین لە دونیای مۆدێرندا و لەسەر دروستبوونی کایەی نوێ و جیاواز لە دەرەوەی دیندا و لەسەر بەهێزبوونی دەسەلاتی زانست، وەر دەگرێت و گەشەیان پێ ئەدات. لەم ڕووەوە لەوانەیە کاریگەریی ماکس ڤێبەر لەسەر هیچ کەسێکی دوای خۆی بە ئەندازەی کاریگەری لەسەر بریان ویلسن گەورە نەبێت. "کۆمەڵناسیی دین" لای ویلسن بەتەواوی لەژێر سێبەری کۆمەڵناسیی دین لای ماکس ڤێبەردایە.[1]

## پرۆسەی عەلمانیبوون وەک دیاردەیەکی گەردوونی

لای ویلسن بەعەلمانیبوونی دونیا پرۆسەیەک نییە تایبەت بەم یان بەو بەشی دونیا بەتەنها، لەناو ئەم یان ئەو دیندا بەتەنها ئامادە بێت، بەڵکو دیاردەیەکی جیهانییە و بەتوندی بە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەلایەتییەوە گرێ دراوە. لای ئەم کۆمەڵناسە ناکرێت قسە لە بوونی کۆمەڵگایەکی مۆدێرن بکەین بەبێ ئەوەی قسە لە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی ئەو کۆمەڵگایە نەکەین. جگە لەم گەردوونیبوونە، پرۆسەی بەعەلمانیبوون ئاکارێکی دیکەشی هەیە، ئەویش ئاکاری حەتمیبوونیەتی. لە دیدی ئەم کۆمەڵناسەدا پرۆسەی بەعەلمانیبوون پرۆسەیەکی حەتمییە و وەک لۆژیکی ناوەکیی

---

١ - بڕوانە:
Dobbelaere, K. (2006). Bryan Wilson's contribution to the study of secularization.

پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی کار دەکات. ئەم حەتمیبوونەش وا دەکات عەلمانیەت ڕووی لە ئاییندەی هەموو کۆمەڵگاکانی دونیا بێت، چارەنووسێک بێت هەر کۆمەڵگایەک بیەوێت تازە ببێتەوە ناچار بێت قبووڵی بکات، ناکرێت کۆمەڵگا و ژیان تازە ببێتەوە، بەڵام پرۆسەی بەعەلمانیبوون و ڕوو نەدات و نەیەتە کایەوە. عەلمانیەت بەم مانایە بەشێکە لەو مێژووەی لە سەبەینێی هەموو کۆمەڵگاکان و لە سەبەینێی هەموو مرۆڤایەتیدا دێتە کایەوە. بەڵام بەعەلمانیبوون لە هەموو شوێن و بەشێکی دونیادا بە یەک شێوە و لەسەر هەمان هێڵ ڕوو نادات، ئەم کۆمەڵناسە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە لە هەر ژینگەیەکی کولتووری و فەرهەنگی و مێژوویی تایبەتدا پرۆسەی بەعەلمانیبوون فۆرم و ڕێچکە و خێراییی جیاواز دەگرێتە خۆی، هەموو کۆمەڵگا و بەشە جیاوازەکانی دونیا بە یەک شێوە بەعەلمانی نابن و بە یەک شێوە ناچنە ناو پرۆسەی تازەبوونەوەوە. ئەگەر لاوازبوونی دین بەشێکی نەگۆڕی هەر پرۆسەیەکی تازەبوونەوە و بەعەلمانیبوونی دونیا بێت، ئەوا لاوازبوونی دین لە هەر شوێنێکدا شێوازێکی تەواو تایبەت دەگرێتە خۆی.[1]

1 -Wilson, B. (1998) "The Secularization Thesis: Criticisms and Rebuttals", in R. Laermans, B. Wilson and J. Billiet (eds). Secularization and Social Integration. Leuven: Leuven University Press. P. 48.

**سێ ئاستی لاوازبوونی دین**

بریان ویلسن پرۆسەی بەعەلمانیبوون وەک پرۆسەیەکی گەورە و بەردەوامی کەمبوونەوە و لاوازبوونی کاریگەرییەکانی دین لە سێ ئاستی سەرەکیدا دەبینێت. یەکەمیان لاوازبوونی فیکری دینی. دووهەم، لاوازبوونی هەڵسوکەوت و ئاکاری دینی. سێیهەمیش لاوازبوونی دەزگا دینییەکان. ئەمانەش وا دەکەن پیاوانی دین ئەو ڕۆڵ و کاریگەرییە گەورەیەیان نەمێنێت کە لە کۆمەڵگا سوننەتی و نامۆدێرنەکاندا هەیانبووە. پرۆسەی بەعەلمانیبوون مانای لاوازبوونی دین لەو سێ ئاستە سەرەکی و بنەڕەتییەدا، لاوازبوونی دین لە ئاستی فیکری و زانستیدا، لاوازبوونی لە ئاستی هەڵسوکەوت و ئاکاری کۆمەڵایەتیدا و لاوازبوونی لە ئاستی دەزگاییدا.[١] هەموو ئەمانەش مانای لاوازبوونی کاریگەرییەکانی دین لە ئاستی کۆمەڵگادا وەک گشتێک و لە ئاستی تاکەکەسی و ژیانی تایبەتیشدا. واتە هەم کۆمەڵگا دەکەوێتە ناو پرۆسەی بەعەلمانیبوونی بوارە جیاوازەکانیەوە، لەوانەش بواری ئابووری و سیاسی و فەرهەنگی و هتد... هەم ژیانی تاکەکەس خۆیشی بەعەلمانی دەبێت.[٢] بەکورتی، پرۆسەی بەعەلمانیبوون، لە دیدی ئەم کۆمەڵناسەدا پرۆسەیەکی حەتمیی هاوشانی تازەبووەنەوەیە و وا دەکات دین هەم لە ئاستی کۆمەڵگادا و هەم لە ئاستی دەزگاییدا و هەم لە ئاستی تاکەکەسیدا لاواز ببێت.

لە ئاستی یەکەمدا پرۆسەی بەعەلمانیبوون دەبێتە هۆکاری

---

1 -Wilson, B. (1969). Religion in Secular Society. Harmondsworth:Pelican

٢ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٠-١١

لەدایکبوونی کۆمەڵگا بە مانا مۆدێرنەکەی، واتە لەدایکبوونی ڕووبەرێکی کۆمەلایەتیی گەورەتر لە تاقم و گروپ و تایەفە دینییەکان، لەدایکبوونی کۆمەڵگا وەک سەرچاوەی سەرەکیی شوناس و ئینتیما و لەوێشەوە دەستهەڵگرتن لە ئینتیما بۆ گروپە دینی و کۆمەلایەتییە بچووک و ناوچەیی و مەزهەبی و لۆکاڵییەکان. پرۆسەی بەعەلمانیبوون وا دەکات لەباتیی ئەوەی یەکە بچووکەکانی وەک تایەفە و مەزهەب و خێڵ سەرچاوەی شوناس و تەمەهایکردنی ئەخلاقی و سیاسی و کۆمەلایەتیی تاکەکەسەکان بێت، "کۆمەڵگا" وەک یەکەیەکی گەورە و تازە لەدایک ببێت و دەبێت بە سەرچاوەی یەکەمی ئەو شوناسانە.[1] لە ئاستی دەزگاییدا، پرۆسەی بەعەلمانیبوون، مانای دروستبوونی کۆمەڵێک دەزگای تازەیە کە لەپاڵ ئەنجامدانی چەندەها ئەرک و کاری تازەدا، بەشێکی زۆر و گرنگی ئەو کارانەش ئەنجام ئەدەن کە پێشتر دەزگا دینییەکان جێبەجێیان دەکرد. ئەمەش وا دەکات دەزگا دینییەکان ئەو بایەخەی جارانیان نەمێنێت و تووشی شێوازێک لە شێوازەکانی بێئیشی و بێرۆڵی ببن و تابێتیش چۆڵ و بەتاڵ ببنەوە. هەموو ئەمانە وا دەکەن برێکی گەورەی ئەو ڕووبەرە کۆمەلایەتی و فەرهەنگییانەی کە جاران دەزگا دینییەکان کاریان تێدا دەکرد، لەژێر دەستی دەزگا دینییەکان بێنە دەرەوە و بکەونە ژێر دەستی دەزگا تازەکانەوە. بۆ نموونە دروستبوونی دەزگاکانی پەروەردە

1 -Wilson B (ed.) (1967) Patterns of Sectarianism, Organization and Ideology in Social and Religious Movements. London: Heinemann Educational Books

و فێربوونـی نـوێ، کـە شـوێنی قوتابخانـە و فێرگـە دینییەکانـی بـەر لـە هاتنـی مۆدێرنـە و بـەر لـە دروسـتبوونی پرۆسـەی بەعەلمانیبوونـی دەگرنـەوە. سیسـتمێکی تـازەی پـەروەردە و فێربوون دروست دەبێت کە دەچێتە شوێنی سیستمە دینییە باڵادەستەکە. ئەمـە جگـە لـە دروسـتبوونی کایـەی جیاواز کـە دەزگای جیاوازیان تیادا دروست دەبێت و ئەو دەزگا تازانەش پەرە بە بیروبۆچوون و بەهـای نادینی و دابڕاو لە بەهـای نـاو دەزگا دینییـەکان ئـەدەن. لەوانـەش بـۆ نموونـە لەدایکبوونـی "کایـەی مافـەکان" و وێناکردنـی تاکەکـەس وەک بوونەوەرێکـی یاسایی خـاوەن مـاف. لەوێشـەوە لەدایکبوونـی سیستمی داداگا و داوەریـی مۆدێـرن کـە لەگـەڵ ئـەو وێناکردنـە تازەیـەدا بـۆ تاکەکـەس بگونجێت. یاخـود لەدایکبوونـی "کایـەی پزیشـکیی نـوێ" و گەشـەکردنی تێگەیشـتنی ئینسـانی بـۆ چۆنیەتیـی کارکردنی لەشـی مرۆڤ و شێوازی نەخۆشییەکان و چۆنیەتیی گرنگیدانـی دەسـەڵاتی مۆدێـرن بـە تەندروسـتیی تاکەکەسـی و تەندروسـتیی دانیشـتووان. لەوێشـەوە لەدایکبوونـی سیسـتمی تەندروسـتیی مۆدێـرن و جێگرتنـەوەی ئـەم سیسـتمە بـۆ هەمـوو ئـەو هەڵسوکەوتە دینیانـەی مەبەسـتیان چاککردنـەوەی نەخـۆش و بەهێزکردنـی تەندروسـتی بـوو.[1]

لـە ئاستی تاکەکەسییشـدا، پرۆسـەی بەعەلمانیبوون، مانـای دروسـتبوونی دۆخێکی فەرهەنگیی تـازە و لەدایکبوونی جۆرێک لـە هۆشـیاریی نـوێ کـە ئینسـان دەگـۆڕن بـۆ بوونەوەرێکـی سـەربەخۆ و عەقڵانـی و ڕەخنەگـر، بـۆ بوونەوەرێـک خـۆی بتوانێـت بڕیـار بـۆ خـۆی بـدات و خـۆی بتوانێـت مانـا و

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بۆچوون و لێکدانەوەکانی خۆی دەستنیشان بکات. پرۆسەی بەعەلمانیبوون لەم ئاستەدا مانای لەدایکبوونی جۆرێک لە هۆشیاری کە بۆ جیاکردنەوەی باش لە خراپ و ڕاست لە هەڵە پێویستی بە دین و بە پیاوانی دین و دەزگا دینییەکان نەبێت، بەڵکو عەقڵ و ویژدانی کۆمەلایەتی و تاکەکەسییانەی خۆی پێوەر و ئاراستەکەری بێت. ئەمەش مانای دروستبوونی دۆخێکە دین نەتوانێت چیتر تیایدا ماناکانی باشە و خراپە و ئەشێ و ناشێ و حەلاڵ و حەرام بۆ تاکەکەسەکان دەستنیشان بکات، نەتوانێت بە تاکەکەس بڵێت چۆن هەڵسوکەوت بکات، چی بە ئەخلاقی و چی بە بەدئەخلاقی بزانێت، هەروەها چی وەک پیرۆز و چی وەک ناپیرۆز مامەڵە بکات. پرۆسەی بەعەلمانیبوون لەم ئاستەدا مانای ئەوەی دەزگا و دەسەلات و بکەرە دینییەکان چیتر نەتوانن دەستنیشانی ئەوە بکەن خەڵک چ باوەڕێکیان هەبێت، چ پرنسیپێکی ئەخلاقیی ژیانیان ئاراستە بکات و تەنانەت چۆن لە خودی دین خۆی و لە هەڵسوکەوتی دینییەکان تێبگەن. بەکورتی لەدایکبوونی ئەم جۆرە لە تاکەکەسی هۆشیار وا دەکات دین نەتوانێت چیتر بە ئینسان بڵێت چۆن بژیی و باوەڕی بە چی بێت و ژیانی لەپاڵ کام دیدی ئەخلاقیدا ڕێکی بخات.[1]

### دین بەبێ پیاوانی دین

بریان ویلسن باوەڕی وایە دەشێت دین لە ئاستی باوەڕی تاکەکەسیدا بمێنێتەوە و وەک عەقیدەیەکی تایبەت تاکەکەسەکان باوەڕیان پێی هەبێت، ئەوەی لە دۆخی بەعەلمانیبوونی دونیادا

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو

دەگۆڕێت، ئەوەیە تاکەکەسەکان ئەو باوەڕە شەخسییە دینییانە بە سەربەخۆیی لە دەسەڵاتە دینییەکانی ناو کۆمەڵگا دەژین و بە سەربەخۆیی ئەزموونیان دەکەن و بە سەربەخۆییش گەشەیان پێ ئەدەن. واتە تاکەکەسەکان تێگەیشتنی خۆیان بۆ دین لە پیاوانی دین و لە مەلا و قەشە و مزگەوت و کەنیسەکانەوە وەر ناگرن، بەڵکو خۆیان دەبن بە سەرچاوەی تێگەیشتنی خۆیان لە دین و بە شێوەیەکی سەربەخۆ هەوڵی لێکدانەوەی ناوەرۆکی تێکست و پراکتیکە دینییەکان ئەدەن. ئەم پرۆسەی بەتاکەکەسیبوونەی دین لای ویلسن هێمایەکی گرنگی سەرکەوتنی پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیایە، چونکە بەعەلمانیبوونی دونیا کۆتایی بە دین ناهێنێت وەک باوەڕێکی تاکەکەسی، بەڵکو دەیکات بە دینێکی شەخسی، کە پێویستی بە دەزگا و ڕابەرە دینییەکان نەبێت بۆ دەستنیشانکردنی ماناکانی دین و دینداری. بەکورتی پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا لای ئەم کۆمەڵناسە، لەسەر هەمان ئەو دیدە فیکرییەی لای ماکس ڤیبەر ئامادەیە بەردەوامە و هێماش بۆ پاشەکشەی ڕۆڵی دین لە هەموو ئەو ئاستانەدا دەکات کە لە سەرەوە باسمان کرد. لەباتیی دینیش هاتنەکایەی دید و ڕوانین و بۆچوون و بەها و نرخی نادینیی کە هاریکاریی مرۆڤ بکەن بۆ ئەوەی لە پێگە و شوناسی خۆی تێبگات و بەو شێوەیەش لە دونیادا هەڵسوکەوت بکات کە هەم ئازاد بێت و هەم بشتوانێت بوونی پێکەوەیی لەگەڵ کەسانی تردا بپارێزێت. وەک پێشتریش وتمان بریان ویلسن دین هەم وەک شێوازێکی بیرکردنەوە و هەم وەک جۆرێکی تایبەت لە هەڵسوکەوت و پراکتیک مامەڵە دەکات، وەک چۆن وەک بوونێکی دەزگایی

فرەجۆریش وێنای دەکات. واتە دین لای ئەم کۆمەڵناسە تەنها کۆمەڵێک باوەڕ و عەقیدە و سروت نییە، بەڵکو کۆمەڵێک دەزگا و بکەری کۆمەڵایەتییشە، هەمیشەش لەناو کۆمەڵێک دەزگا و ڕێکخراودا ئامادە و بەرجەستەیە، وەک بەرجەستەبوونی مەسیحییەت لەناو دەزگای کەنیسە و ئیسلام لەناو مزگەوت و تەریقەتەکاندا و دینەکانی تر لەناو پەرستگا جیاوازەکانی تردا. ئەوەی لای ویلسن شوێنی سەرنجە، بەستنەوەی توندی لەدایکبوونی مۆێرنە و لاوازبوونی دینە بەیەکەوە. لای ئەم کۆمەڵناسە هەموو پرۆسەیەکی تازەبوونەوە بەحەتمی دۆخێکی ناهەموار بۆ دین دروست دەکات و وای لێ دەکات پێگە و دەسەڵات و ڕوانینەکانی لاواز و پەراوێز بکەون. هاوکات مۆدێرنە بەحەتمی پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا سەروەر و بەهێز دەکات و هیچ تازەبوونەوەیەکی ڕاستەقینە بوونی نییە بەبێ لاوازبوونی ڕۆڵی دین لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا. ئەوەشی ئەم گشتە گەورەیە ئاراستە دەکات، هەمان ئەو پرۆسەی بەعەقلانیبوونەیە، کە ماکس ڤێبەر باسی دەکات. وەک ڤێبەر، ویلسنیش ڕای وایە کە پرۆسەی بەعەقلانیبوون هەم هێزی کەلەپوور و سوننەت و تەقلید لەناو دەبات، یان تەواو لاواز دەکات، هەم هێزی کاریزما کەنارگیر دەکات، لەباتیی ئەوانیش هێزی عەقلانیەت و یاسا نوێکان بەهێز دەکات. بە مانایەکی دیکە لای ویلسن، وەک لای ماکس ڤێبەر، ئاکاری هەرە سەرەکیی کۆمەڵگاکانی بەر لەمۆدێرنە بالادەستیی کەلەپوور و کاریزمایە، کە ڕەگوڕیشەی دروستبوون و مانەوەیان لەناو دین و دونیابینیی دینیدایە. لەم ڕوانینەدا کۆمەڵگا نامۆدێرنەکان کۆمەڵگای داخراون و دین، کە لەم

دیدەدا یەکسانە بە خورافەت و سیحر، ڕۆڵی سەرەکیی لەم داخستنەدا دەبینێت و جیهانبینیی ئەم کۆمەڵگایانە دەستنیشان دەکات. پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا، کە لەم ڕوانینەدا جەوهەری تازەبوونەوە دەستنیشان دەکات، کۆتایی بەو سیحر و خورافەتانە دەهێنێت و وا دەکات دونیا لە توێژاڵ و بەرماڵە سیحرییەکەی دابماڵرێت.

# سەرچاوەکان

Dobbelaere, K. (2006). Bryan Wilson's contribution to the study of secularization. Social Compass, 2006 Jun, Vol.53(2), pp.141-146

Wilson B (ed.) (1967) Patterns of Sectarianism, Organization and Ideology in Social and Religious Movements. London: Heinemann Educational Books.

Wilson, B. (1969). Religion in Secular Society. Harmondsworth: Pelican.

Wilson, B. (1998) "The Secularization Thesis: Criticisms and Rebuttals", in R. Laermans, B. Wilson and J. Billiet (eds) Secularization and Social Integration. Leuven: Leuven University Press.

# ڕەخنە لە نادین (١)
# کیرکیگارد دژ بە هیگڵ

**سەرەتا**

لە لاپەڕەکانی پێشوودا هێڵە سەرەکییەکانی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیام لای سێ کۆمەڵناسی گرنگی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم شی کردەوە و لەوە دوام کە ئەم تێزە بە درێژایی ساڵانێکی درێژ لە سەدەی بیستەمدا وەک پارادایمێکی بەهێز کاری کردوە. باسم لەوەش کرد لە سەدەی نۆزدەهەمەوە ڕوانینێک دروست دەبێت کە پێی وایە دین ئەو ڕۆڵەی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا نامێنێت و لە دونیای مۆدێرندا زانست شوێنی دین دەگرێتەوە. بەشێکی گرنگی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا لای ئەو سێ کۆمەڵناسەی باسم کرد درێژەدانە بە دیدی ئەو فەیلەسوفە نادینی و دژەدینانەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا نووسیویانە، لە هیگڵەوە بۆ سەر فرۆید، بە تێپەڕین بەناو فیورباخ و مارکس و نیتشەدا. بەڵام ئەمە هەموو تێزە فیکرییەکان و ڕوانینەکانی سەدەی نۆزدەهەم نییە، لەو سەدەیەدا چەندان دەنگی فیکری و فەلسەفیی گرنگ هەبوون کە ئەو ڕوانینەیان

بۆ دونیا و بۆ دین نەبووە، کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا هەڵگریەتی. هەندێکیان تا ئەو شوێنە ڕۆیشتن کە نەتوانن وێنای ژیانی ئەخلاقیی مرۆڤ بکەن بەبێ بوون و ئامادەگیی دین. لە ناوە هەرە گرنگەکانی ئەم جۆرە لە ڕوانین بۆ دین لە هەمان سەردەمی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا، فەیلەسوفی دانیمارکی: سورین کیکیگارد (١٨١٣-١٨٥٥) و کۆمەڵناس و فەیلەسوفی سیاسیی فەرەنسی: ئەلێکسی دی تۆکفیل (١٨٠٥-١٨٥٩). ئەوەی وای کردوە ماوەیەکی درێژ دەنگی ئەم کەسانە سەبارەت بە ڕۆڵ و شوێن و پێگەی دین لە دونیای مۆدێرندا نەبیسترێت، باڵادەستیی پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیایە. ئەم پارادایمە بیروبۆچوونی ئەم دوو نوسەرەی لەسەر پێگەی دین لە دونیای مۆدێرندا تەواو پەراوێز خستوە و وەک نەبوو مامەڵەی کردون. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا ڕوانینەکانی کیرکیگارد و تۆکفیل نیشان ئەدەم، بەر لەوەی لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا بگەڕێمەوە سەر ڕەخنەکردنی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا لای ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵناس و ئینسانناس و فەیلەسوفانی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم.

### لە هیگڵەوە بۆ کیرکیگارد

بۆ هەموو خوێنەرێکی سادەی فیکری فەلسەفیی سەدەی نۆزدەهەم ئاشکرایە کە لەدوای هیگڵەوە، بەتایبەتی لەلای گروپی "هیگلییە لاوە چەپەکان"، ڕەخنەکردنی دین بە سەرەتای هەموو ڕەخنەیەکی کۆمەڵایەتی و فیکریی دەزانرێت و ڕزگاربوونی کۆمەڵگا لە دین وەک هەنگاوی

یەکەمی ڕزگاربوونی کۆمەڵگا لە خورافەت و گەیشتن بە ئازادیی ڕاستەقینە وێنا دەکرێت. لەم ئاستەدا نووسەرانێکی وەک مارکس و ئەنجلس و فیورباخ بەناوبانگترین ڕەخنەگری کۆمەڵایەتیی سەدەی نۆزەهەمن، کە پێیان وایە ڕەخنەکردنی کۆمەڵگا بەبێ ڕەخنەکردنی دین مانایەکی ئەوتۆی نابێت و هەنگاوە بنەڕەتی و سەرەکییەکانی ڕەخنەی کۆمەڵایەتییش بە ڕەخنە لە دین دەست پێ دەکات. مێژوو لای ئەم هیگڵییە لاوانە جووڵەیەکی مەبەستەگەرای هەیە و ئەوەی ئەم جووڵەیە دەیەوێت وەدیی بهێنێت، تێکشکانی هەموو ئەو ڕێگر و بەربەستانەن کە لەناو مێژوودا لە بەردەمی بەرجەستەبوونی عەقڵ و ئازادیدا دروست بوون. لە دیدی ئەماندا دین یەکێکە لەو ڕێگرە سەرەکییانە و دوای دینیش سیستمە سیاسییە ستەمگەرەکان دێت.[1] من لە بەشەکانی پێشووی ئەم نووسینەدا هەوڵم دا هێڵە گشتییەکانی ئەو ڕەخنانە لە جەوهەر و پێگە و ڕۆڵی دین لە مێژوودا نیشان بدەم و ئەوە ڕوون بکەمەوە ئەم هیگڵییە لاوانە چ جۆرە پەیوەندییەک لەنێوان دین پرۆژەی مۆدێرنەدا پێشنیار دەکەن. دوای ئەوەش بەدرێژی لەسەر تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا وەستام و نیشانم دا کە ئەم تێزەیە لەناو کۆمەڵناسیی ماکس ڤێبەر و دۆرکهایمەوە دێت و بەناو بەشێکی گەورەی فیکری سۆسیۆلۆژی و فەلسەفەی سیاسیی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بڵاو دەبێتەوە و وەک پارادایمێکی لێ

---

١ -سەبارەت بە هیگڵیە لاوەکان و بیروبۆچوونەکانیان بڕوانە:
Stepelevich, Lawrence S. (1983). The Young Hegelians: An Anthology. Cambridge

دێت. وەک پێشتریش هێمام پێ کرد، ئەوەی لەم بەشەدا و لە لاپەڕەکانی تری ئەم کتێبەدا دەمەوێت بە خوێنەری نیشان بدەم، ئەو بەشانەی تری فیکر و تێڕامانی فەلسەفی و کۆمەڵایەتییە کە هەر لە سەدەی نۆزدەهەم خۆیدا بەرگرییان لە دین کردوە و پێیان لەسەر گرنگیی ڕۆڵە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و ئینسانییەکانی داگرتووە. ئەوانەشی لە بواری فیکری سیاسی و تێڕوانینی فەلسەفی و کۆمەڵناسییدا بەم ئاراستەیەدا بیریان کردۆتەوە بە پلەی یەکەم کەسانێکی دژە هیگڵن. نە دونیابینیی هیگڵییان قبووڵە نە دید و ڕوانینەکانی هیگڵییە لاوەکان. لە ئاستی فەلسەفیدا فەیلەسوفی دانیمارکی: سۆرێن کیرکیگارد، ئەو کەسەیە کە ڕەخنەیەکی گەورە لە عەقڵانیەت و فەلسەفەی سیستماتیکیی هیگڵ دەگرێت و بەرگرییەکی گەورە لە ئایین بەگشتی و لە ئایینی مەسیحیەت بەتایبەتی دەکات، لە ئاستی کۆمەڵناسی و ڕەخنەی کۆمەڵایەتییشدا کۆمەڵناسی فەرەنسی: ئەلیکسی دی تۆکفیل، دیدێکی تر بۆ دین گەشە پێ ئەدات ناکۆک بەو دیدە عەلمانییەی لە بەشەکانی ڕابردوودا باسم کرد و بە گژ ئەو ڕوانینەشدا دەچێتەوە کە پێی وایە دین لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا لاواز بووە و ڕۆڵێکی ئەوتۆ لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیدا نابینێت. تۆکفیل دیدێکی تر بۆ مەسەلەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی نیشان ئەدات، کە ناکۆکە بەو دیدەی پێی وایە کۆمەڵگا چەند تازە ببێتەوە ئەوەندە لە دین دوور دەکەوێتەوە. بەڵام با سەرەتا لە هەندێک لە ڕوانینە فەلسەفییە سەرەکییەکانی کیرکیگاردەوە دەست پێ بکەین و

بزانین ئەم نووسەرە دانیمارکییە چی لەسەر دین و ڕۆڵی دین لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەلایەتیدا، دەڵێت.

**جارێکی تریش هیگل**

لە بەشەکانی پێشووی ئەم باسەدا لەوە دوام کە ڕەگوڕیشە بەهێزەکانی بەرگریکردن لە عەقلانیەت و گریمانکردنی ماڵئاواییکردن لە دین لە دونیای مۆدێرندا بە پلەی یەکەم لە هیگڵەوە سەرچاوە دەگرێت و بەناو سەدەی نۆزدەهەمەدا بلاو دەبێتەوە. ڕاستە بەر لە هیگل نووسەرانی سەردەمی ڕۆشنگەری ڕەخنە لە دین دەگرن، بەلام هیگل ئەو ڕەخنانە دەخاتە ناو چوارچێوەیەکی فەلسەفیی سیستماتیکەوە، واتە دەیانخاتە ناو سیستمێکی فەلسەفیی عەقلانییەوە و شێوازێکی تیوریی ڕێکخراویان پێ دەبەخشێت و بە قۆناغەکانی گەشەکردنی فیکر و بیرکردنەوەی مرۆڤەوە لەناو مێژوودا، گرێیان ئەدات. واتە ڕەخنە لە دین تەنها وەک ڕەخنە لە بابەتێک لە بابەتەکان خۆی نماییش ناکات، بەڵکو وەکو بەشێکی سەرەکیی جووڵەی ناوەکیی فیکر لە سەردەمە کۆنەکانەوە بۆ سەردەمی مۆدێرن دەر دەکەوێت. ئەوانەی لەدوای هیگڵەوە دێن بە زۆر شێوە ناچارن بەناو فیکر و دید و چەمک و تێڕوانینەکانی ئەودا تێبپەڕن. یەکێک لەوانەی کە بەناو فیکری هیگڵدا تێدەپەڕێت، بەلام دەکەوێتە جەنگێکی دەستەویەخەوە لەگەڵیدا، فەیلەسوفی دانیمارکی: سۆرین کیرکیگاردە. قسەیەک هەیە دەڵێت ئەگەر هیگل شاخێکی فەلسەفیی گەورە بێت، ئەوا دوو کەس لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە دوو دیوی جیاوازی ئەو شاخەدا دێنە خوارێ، یەکێکیان مارکسە، ئەوی

تریان کیرکیگاردە. یەکێکیان پێی وایە فیکری هیگڵ فیکرێکی ژێرەوژوورە و پێویستە بخرێتەوە سەر قاچەکانی خۆی بۆ ڕۆیشتن، ئەمەیان مارکسە، ئەوی تریان لەسەر کۆتاییهاتن بە فیکری هیگڵ کار دەکات و پێی وایە فیکرێکە ژیانی مرۆڤ لاواز و هەژار دەکات، ئەمەشیان کیرکیگاردە. ئەگەر هیگڵییە چەپەکانی دوای هیگڵ لە گەڕانەوەیەکی بەردەوامدا بن بۆ ڕەهەندە عەقڵانی و یونیڤێرسیاڵییەکەی هیگڵ، ئەوا بەشێکی گەورەی بوونگەراکان لە گەڕانەوەیەکی بەردەوامدان بۆ فیکری کیرکیگارد لەو ڕەهەندانەدا کە ڕەخنەی فەلسەفەی سیستماتیک، و عەقڵانیەت و تاککەرایی نوقمبووی ناو جمهور و کۆمەڵگا دەکات.[1]

لە ڕاستیدا کیرکیگارد هێندە دژ بە بیرکردنەوەی هیگڵ بوو، ئەو خۆی وەک دژە فەلسەفە و وەک "نافەیلەسوف" دەناساند، بە خۆیشی دەگوت ئەو فەیلەسوف نییە، بەڵکو نووسەرێکی دینییە و هیچی تر. بەڵام کە باس لە دینیبوونی کیرکیگارد دەکرێت، باس لە ئەزموونێکی فیکری و حەیاتیی هێجگار تایبەت و پڕ تراژیدیا دەکرێت. دین لەناو ئەم ئەزموونەدا مانای تایبەت و ئەرکی تایبەت وەر دەگرێت کە زۆر جیاوازە لەو مانایانەیەی کەنیسە و قەشە و قسەکەرە ڕەسمییەکانی دین لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە دینیان بەخشیوە. ئەم خاڵە دواتر بەوردی شی دەکەمەوە. ئەوەی لێرەدا و لە پەیوەندیی نێوان کیرکیگارد و هیگڵدا دەمەوێت باسی بکەم،

---

١ بڕوانە:
Stewart, Jon (2003). Kierkegaard's relation to Hegel reconsiderd. Cambridge University Press ..

ئەوەیە کە دینبوونی فیکر و کەسایەتی کیرکیگارد مانای ئەوە نییە کیرکیگارد تەنها ڕەخنەی لە ڕەهەندە سیستماتیکی و عەقلانییەکەی فیکری هیگڵ گرتووە، واتە تەنها بە گژ ئەو ڕۆحە دژ بە دینەی فیکری هیگڵدا نەچۆتەوە کە دەبێتە بنەمای بەشێکی گەورەی ڕەخنە لە دین لە فیکری سەدەی نۆزدەهەمدا، بەڵکو ڕەخنەیەکی توندیش لە کەنیسەو پیاوە دینییەکانی سەردەمی خۆی دەگرێت، کە بە بۆچوونی کیرکیگارد دینیان کورت کردۆتەوە بۆ هەندێک تقوسی سادە و ڕووکەش و ڕوانینی دۆگمایی.

## ژیانی کیرکیگارد

ئەم فەیلەسوفە دانیمارکییە ژیانێکی کورتی پڕ کارەسات و نەهامەتی ژیا، لە تەمەنی ٤٢ ساڵیدا دەمرێت و لەدوای خۆیەوە تەنها کۆمەڵێک کتێبی هێجگار گرنگ بەجێ دەهێڵێت. کیرکیگارد بە باوکی فەلسەفەی وجودی، یان فەلسەفەی بوونگەرایی دادەنرێت، کە لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا دەبێت بە یەکێک لە قوتابخانە فەلسەفییە هەرە گرنگەکانی مێژووی فەلسەفە لە خۆرئاوادا. لەم ڕووەوە کاریگەریی کیرکیگارد لەسەر هایدگەر و کارل یاسپەرز و سارتەر و کامۆ و زۆرێکی تر لە بوونگەراکانی سەدەی بیستەم، کاریگەرییەکی گەورە و بەرچاوە.

کیرکیگارد لە خێزانێکدا لەدایک دەبێت کە دین تیایدا ڕۆڵێکی گەورە لە ژیانیاندا دەگێرێت، خێزانێکی دینی کە ئاینی مەسیحی ئاراستەکەری هەڵسوکەوت و قەناعەتەکانیان بووە. لەو خێزانەدا کیرکیگارد منداڵی ژمارە حەوتی خێزانەکە بووە

و هەر لە منداڵییشەوە کەسێکی خەمبار و گۆشەگیر و بێهاوڕێ بووە، بەڵام لە قوتابخانەدا یەکێک بووە لە منداڵە زیرەکەکان، توانایەکی گەورەی لە فێربوونی زمانی لاتینیدا هەبووە. لە تەمەنی ٢٨ ساڵیدا بڕوانامەی دکتۆرا لە زانکۆی کۆپنهاگن لە بواری فەلسەفە و خوداناسیدا وەر دەگرێت. لە ساڵانی دواییدا کۆمەڵێک کتێبی گرنگ دەنووسێت و ژمارەیەکیان لەژێر ناوی نهێنیدا بڵاو دەکاتەوە، ئەم کتێب و نووسینانە پڕن لە ڕەخنە لە دینی ڕەسمی و لە شێوازی دینداریی کەنیسە و تێگەیشتنی قەشەکانی ئەو سەردەمە. هاوکات ڕەخنەیەکی توندیش لەو دید و تێڕوانینانە دەگرێت کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا عەقڵ و عەقڵانیەت و بەرگریکردن لە "بابەتیبوونی فیکر" دەکەنە بنەمای کارکردنیان. سەرجەمی ئەم نووسینانە هێڵە گشتییەکانی ئەو فەلسەفە دینی و وجودییە دادەڕێژن کە دواتر فیکری کیرکیگاردیان پێ دەناسرێتەوە. دوای ئەوەی ئاشکرا دەبێت کە کیرکیگارد نووسەری ئەو کتێبانەیە کە دژ بە دینی ڕەسمی و دژ بە کەنیسەی باڵادەست نووسراون، ئیتر کە لەسەر شەقام و شوێنە گشتییەکان دەر دەکەوێت، خەڵک هوهای لێ دەکێشن و قسە و تەعلیقی ناشیرینی پێ ئەڵێن. ئەمە وا دەکات کیرکیگاردیش لەلای خۆیەوە بڕیار بدات جگە لە دژایەتیکردنی زیاتر و هەمەلایەنتری کەنیسە و بەگژاچوونەوەی دینداریی باڵادەست شتێکی دیکە نەکات. بە جۆرێک کیرکیگارد لەسەر شەقامەکان و لە کاتی پیاسەکردندا خەڵک ڕادەوەستێنێت و ڕەخنە لە هەڵسوکەت و جلوبەرگ و بیروباوەڕی دینی و شێوازی دینداریان دەگرێت. لەم ڕووەوە هەندێک کەس کیرکیگارد بە سوکرات

بەراورد دەکەن، چونکە سوکراتیش لە شوێنە گشتییەکانی شاری ئەتینادا خەڵکی ڕادەوەستاند و پرسیاری قورس و زەحمەتی لێ دەکردن و نیشانی ئەدان کە ئەوەی ئەوان بەبێ هیچ گومان و بیرکردنەوەیەک باوەڕیان پێیە، زۆر دوورە لە هەقیقەتەوە. ئەمە وا دەکات لە هەندێک ناوەنددا کیرکیگارد بە "سوکراتی شاری کۆپنهاگن" ناو ببرێت، کە دەشمرێت؛ جگە لە قوتابییەکانی خۆی و هەندێک لە خوێنەری کتێبەکانی، هیچ کەسێک لە خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی سەردەمەکەی خۆی لەسەر گۆڕەکەی ئامادە نابن. لەم ڕووەوە وەک چۆن مارکس بەتەنهایی دەمرێت و بە خاک دەسپێردرێت، کیرکیگاردیش بە هەمان شێوە دەمرێت و مامەڵە دەکرێت.[1]

## ڕەخنەی کیرکیگارد لە هیگڵ

ڕەخنەی کیرکیگارد لە هیگڵ لە سێ ئاستدا بەرجەستەیە. ئاستی یەکەمیان ڕەخنەیە لە فیکرێکی سیستماتیک، واتە ڕەخنەیە لە فیکرێک دونیا و دیاردەکان لەناو یەک سیستمی فیکریدا کۆ دەکاتەوە و پرۆسەکان و جووڵەکانیش خۆشیان وەک سیستمێک دەبینێت و مامەڵە بکات. سیفەتی سەرەکیی سیستمیش دیسپلینکردن و ئاراستەکردنی تەواو و زۆر جار حەتمیی بکەرەکان و فۆرمی بیرکردنەوەکانیشە. لەم دۆخەدا فیکر دیاردەکان وا دەبینێت وەک ئەوەی یاسای ناوەکییان هەبێت و گەر ئینسان بتوانێت ئەم یاسایانە بدۆزێتەوە، ئەودەم دەتوانێت پێشوەخت شێوازی جووڵە و گۆڕان و گەشەکردنی دیاردەکان، ئاشکرا بکات. بەکورتی سیستمگەرایی هەڵگری

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.vii

جۆرێک لە جەبریەت و حەتمیەتگەراییە کە بکەربوونی مرۆڤ خۆی و سەربەخۆبوونی فیکر خۆی تەواو سنووردار دەکات. لەم ئاستەدا کیرکیگارد جیاوازییەکی گەورە و بنەڕەتی دەکات لەنێوان فیکر و بووندا. کیرکیگارد پێی وایە فیکر دەتوانێت هەندێک شتمان لەسەر ئینسان و لەسەر دونیا پێ بڵێت، بەڵام ناتوانێت هەموو بوونمان نیشان بدات و بۆ شی بکاتەوە. بە بۆچوونی کیرکیگارد بوون هەمیشە زۆر دەوڵەمەندتر و چڕتر و فرەلایەنترە لەوەی فیکر و زمان بتوانن بەتەواوی بەرجەستەی بکەن و نهێنییەکانی ئاشکرا بکەن. بە مانایەکی دیکە لای کیرکیگارد فیکر و بوون دوو شتی لەیەک جیاوازن، بوون ناکرێت بکرێت بە فیکرێکی سیستماتیک و وا مامەڵە بکرێت وەک ئەوەی یاسایەک هەیە هەموو ئاست و دەرکەوتەکانی بەیەکەوە گرێ ئەدات و بەڕێوە دەبات، بوون دەشێت ئەزموون بکرێت، بکرێت بە ژیان، ئینسان بە شێوەیەکی ناوەکی لەگەڵیدا بژی و بمرێت، بەبێ ئەوەی ببێت بە فیکر، یان فیکر بتوانێت یاسای بۆ دابنێت و لەناو سیستمێکدا جێگیری بکات. کیرکیگارد لەم خاڵەدا تەواو دژ بەو شێوازە فەلسەفییە سیستماتیکییەی هیگڵە، کە دەیەوێت بوون لەناو کۆمەڵێک چەمک و گریمانە و تیز و پاسادانی فەلسەفیدا جێگیر بکات. بە بۆچوونی کیرکیگارد ڕەهەندێکی تاکەکەسی و خودی لەبیرکردنەوەدا هەیە، کە بەدوای هەقیقەتە بابەتییەکاندا ناگەڕێت، بەڵکو لە شێوەی کۆمەڵێک بەهادا دەر دەکەوێت، کە ئینسان دەکەنە بوونەوەرێکی بەرپرسیار و نیشتەجێی ناو کۆمەڵێک پەیوەندیی ئینسانی، کە لە سەرێکەوە ئینسان بەتوندی بە خودی خۆیەوە گرێ ئەدات،

لە سەرێکی دیکەوە بەو ژینگە و ئینسانەی ترەوە کە ژیانیان لەگەڵدا بەش دەکات. بە بۆچوونی کیرکیگارد ئەم ڕەهەندە ناوەکییە هەرگیز فیکری سیستماتیکی عەقلانیی ناتوانێت پێی بگات و بیدۆزێتەوە، چونکە ئینسان بوونەوەرێک نییە لە هەقیقەتە بابەتییەکان دروست کرابێت، بەڵکو ئەو هەقیقەتە شەخسی و تاکەکەسییانە دروست بووە کە بەتوندی بە ئەزموونی شەخسی و تایبەتی ئەوەوە وەک مرۆڤێکی تاک و تەنها گرێدراون و هەر ئەوانیش لەناو دونیادا دەیجووڵێنن. ئینسان زمانی هەیە بۆ ناسینی واقیع، بەلام زمان شتێکی بێلایەن و بابەتی نییە، بەڵکو پڕە لە ڕەهەندی شەخسیی تاکەکەسی، بۆیە ئەو وێنەیەی ئینسان لەسەر واقیع و لەسەر دونیا دروستی دەکات، هەمیشە وێنەیەکی شەخسی و خودییە، نەک وێنەیەکی بابەتی، کە بابەتیبوونەکەی کۆڵەکەی سەرەکیی فەلسەفەی هیگڵە. بە بۆچوونی کیرکیگارد ئەم ڕەهەندە شەخسی و تایبەتییەی هەقیقەتە وا دەکات ئینسان بتوانێت ببێتە بوونەوەرێکی دەگمەن و ژیان ببێتە خاوەنی قوولاییەکی بێوێنە. کیرکیگارد لەم ئاستەدا ڕەخنەیەکی گەورە لەو دیدە هیگڵیە دەگرێت کە باس لە جووڵەیەکی گەردوونییانەی ڕۆحێکی جیهانیی دەکات کە گوایە لەناو مێژوودا ئامادەیە و ئەوە ئاراستەکان دەستنیشان دەکات. کیرکیگارد پێی وایە ئەم جووڵە جیهانی و گەردوونییە تاکبوونی مرۆڤ و ئەزموونە تاکەکەسی و شەخسییەکان بە هەموو مانایەک پشتگوێ دەخات و دەسڕێتەوە.[١]

---

١ - بڕوانە:
Stweart, Jon (2012). Kierkegaard's Influence on Philosophy:

ڕەخنەی دووهەمی کیرکیگارد لە هیگڵ، ڕەخنەیە لە عەقڵانیەت وەک سەرەکیترین ئاکاری هەر یەکێک لە فیکر و لە ئینسان. ڕەخنەی کیرکیگارد لە فیکری سیستماتیک و هەقیقەتگەرا لای هیگڵ، هاوکات ڕەخنەیە لەو دیدە کە عەقڵ وەک تاکە ئامرازی گەیشتنی ئینسان بە هەقیقەت دەناسێنێت. کیرکیگارد لێرەدا بەرگرییەکی گەورە لە باوەڕ و عەقیدەی دینیی دەکات دژ بە لۆژیک و بیرکردنەوەی عەقڵانییانە. بە بۆچوونی کیرکیگارد ئەرکی باوەڕ و عەقیدە بریتییە لە گەڕاندنەوەی "مەحاڵ" و "نائەگەر" بۆ ناو فیکر، گەڕاندنەوەی ئەو ڕەهەندانە کە عەقڵ ناتوانێت پێیان بگات و باسیان بکات و بیاندۆزێتەوە. هاوکات یەکێک لە ئەرکەکانی تری بیرکردنەوە، ئەرکی دروستکردنی پەیوەندییەکی ناوەکیی پڕ عیشق و هەست و سۆزە لەگەڵ ناوەوەی ئینسان خۆیدا، نەک تەنها بەرهەمهێنانی زانیارییەکی بابەتیی دەربارەی دونیای دەرەوە. لەم ئاستەدا کیرکیگارد باس لە خودا دەکات وەک کەسێک کە بۆ ئەوەی بتوانێت بەقووڵی لە ئینسان تێبگات و ببێت بە مامۆستای ئینسان، لە ئاسمان دادەبەزێت و خۆی لە ڕێگای مەسیحەوە دەخاتە قاڵبی ئینسان و دێتە ناو ئینسانەکانەوە بژی. بە مانایەکی دیکە خودا بۆ ئەوەی ئینسان بەباشی بناسێت خۆی لە ڕێگای مەسیحەوە دەکات بە ئینسان و دێتە ناو ژیان و ئەزموون و هەست و نەست و بەختەوەری و بەدبەختیی ئینسانەکانەوە. ئەمەش کردەیەکە گەرچی لە تێڕوانینی عەقڵیدا وەک مەحاڵ دەر دەکەوێت،

---

German and Scandinavian Philosophy. London: Ashgate. P. 135.

بـەڵام بەشـێکی گرنگـە لـە ژیـان و مێـژووی مـرۆڤ خـۆی. لـە ڕاسـتیدا کیرکیـگارد لـە پەیوەندیـی نێـوان عەقـڵ و بـاوەڕدا هاوکێشـەکە پێچەوانـە دەکاتـەوە و عەقـڵ دەخاتـە خزمەتـی باوەڕەوە. بەکورتـی، کیرکیگارد لـە ڕێگای ڕەخنەکردنیـەوە بـۆ عەقڵانیـەت، هـەوڵ ئـەدات شـوێنێکی گونجـاو بـە هەسـت و سـۆز و ئیحساسـی مرۆڤ ببەخشـێت و لەناو بیرکردنەوەی فەلسـەفی و خودناسـیی مەسـیحیدا شـوێنی ڕاسـتەقینەی بۆ بکاتەوە. وەک نووسـەرێک دەڵێت: کیرکیـگارد "نەخشـەی دڵـی مرۆڤ دروسـت دەکات، لۆژیکـی هەسـت و ئیحساسـات دروسـت دەکات."[١]

ڕەخنـەی سـێهەمی کیرکیـگارد لـە هیـگڵ، بریتییـە لـەو وێنەیەی هیگڵ بۆ ئینسـانی دروسـت دەکات وەک بوونەوەرێکی عەقڵانیـی بێناکۆکیـی ناوەکـی و کەسـایەتییەکی هاوسـەنگ، گونجـاو لەگـەڵ خـۆی و لەگـەڵ دەوروبـەر و دونیـادا، واتـە وێناکردنـی ئینسـان وەک بوونەوەرێکـی بـێ وەسوەسـە و بـێ گومـان و بـێ پرسـیاری زەحمـەت و بێـوەڵام و بێدڵەڕاوکـێ و هتـد... گەرچـی لـە فیکـری هیگڵـدا ناکۆکـی چەمکێکـی گرنگـە، بـەڵام ناکۆکییـەکان هەمیشـە بـە شـێوەیەکی عەقڵانـی کۆتاییـان پـێ دێـت و چارەسـەر دەکرێـن و دۆخێکـی نـوێ و باشـتر و پێشـکەوتووتر دەهێننەکایـەوە. لـە کاتێکـدا کیرکیـگارد پێـی وایـە ژیانـی ئینسـان بەگشـتی و بـوون بەتایبەتـی پڕیەتـی لـەو ناکۆکـی و ناتەبایـی و نەگونجانانـەی کـە هیـچ سیسـتمێکی

---

١ - بڕوانە:
Gouwens, J. David (1996). Kierkegaard as religious thinker. Camridge University Press. p. 76-78

فەلسەفی و عەقڵی ناتوانێت چارەسەریان بکات. ئینسان کاتێک دەتوانێت بەقووڵی بژی کە ژیانێکی دەوڵەمەند و چڕ و لێوانلێو لە دوودڵی و لەرزین و داچڵەکین و سەرسوڕمان بژی و بەرجەستە بکات، ژیانێک عەقڵ ناتوانێت کۆنترۆڵ و ئاراستەی بکات و کۆتایی بە ناکۆکی و ناتەباییەکانی ناوی بهێنێت.

بەکورتی، کیرکیگارد لە پەیوەندیی نێوان باوەڕ و عەقڵ، یان دین و عەقڵانیەتدا، باوەڕ و دین بە گرنگتر دەزانێت و شوێنێکی ناوەندییان لە ئاکار و ژیانی ئینساندا پێ دەبەخشێت، گرنگ نییە ئەو ژیانە لە کۆمەڵگایەکی سوننەتیدا بێت یان لە کۆمەڵگایەکی مۆدێرنی عەقڵانیدا. ئەگەر فەیلەسوفێکی گەورەی وەک کانت تەنها لەپاڵ گریمانکردنی کۆمەڵێک سنووردا بۆ تواناکانی عەقڵ، بەرگری لە دین بکات، واتە لەو شوێنانەدا بەرگریی لە دین بکات کە عەقڵ ناتوانێت دەستی پێیان بگات، ئەوا کیرکیگارد هاوکێشەکە پێچەوانە دەکاتەوە و پێی وایە تەنها لەو دۆخانەدا بەرگریی لە عەقڵ دەکرێت کە دین نەتوانێت دەستی پێیان بگات. واتە لای کانت عەقڵ بە پلەی یەکەم دێت و دین بە پلەی دووهەم، کە عەقڵ نەیتوانی دڵنیایی ببەخشێت ئیتر دین دێت، بەڵام لای کیرکیگارد دین بە پلەی یەکەم دێت و عەقڵ بە پلەی دووهەم، واتە لەو شوێنانەدا کە دین نەیتوانی دڵنیایی بدات ئینجا عەقڵ دێت. لای کیرکیگارد ئەوەی ئینسان پێویستی پێیەتی گەیشتن بە دڵنیایی نییە، ئەوە نییە فیکر خەریک بێت "هەقیقەت"ی دونیا بەگشتی و "هەقیقەت"ی خودا بەتایبەتی، بۆ ئینسان کەشف بکات، ئەوەی ئینسان پێویستی پێیەتی

متمانەیەکی قووڵ و ڕیشەیییە، متمانەیەک بەلای کیرکیگاردەوە تەنها دین دەتوانێت بە مانا قووڵ و ناوەکییەکەی پێشکەشی بکات. بە باوەڕی کیرکیگارد ئەم متمانە ڕیشەیییە کە دین دەیبەخشێت، چاکەکارییەکە لە سەرووی هەموو چاکەکارییەکانی ترەوە.[1] لێرەشدا کیرکیگارد پێگە و توانایەک بە دین دەبەخشێت کە گەردوونی و هەمیشەیییە و پابەستی ئەم یان ئەو قۆناغی گەشەکردنی ئینسانی و کۆمەڵایەتی نییە.

## سێ شێواز لە ژیان

یەکێک لە ڕەهەندە سەرەکییەکانی فیکری ئەم فەیلەسوفە دانیمارکییە، پێداگرتنە لەسەر توانای ئینسان لەسەر هەڵبژاردن، هەڵبژاردنی شێوەژیان و شوناس و عەقیدە و باوەڕی شەخسی و دیدی تایبەت بە خۆی. لە یەکێک لە کتێبە هەرە گرنگەکانیدا کیرکیگارد سێ شێوازی جیاواز لە ژیان، یان سێ شێوازی ئامادەگیی ئینسان لە دونیادا، لەیەکتری جیا دەکاتەوە و بە هەریەکێکیشیان ئاکار و مانا و نرخ و بەهایەکی جیاواز دەبەخشێت. یەکەمیان "شێوەژیانی ئیستاتیکی"ە، دووهەمیان "شێوەژیانی ئەخلاقی" و سێهەمیشان "شێوەژیانی دینیی"ە.[2]

---

١ - بڕوانە:
Bernier ،Mark (2015). The task of hope in Kierkegaard. Oxford University Press P. 163-164

٢ - بڕوانە:
Hanson, Jeffrey A. (2017).Kierkegaard and the Life of Faith: The Aesthetic, the Ethical, and the Religious in Fear and Trembling . Indian University Press.

شێوەژیانی ئیستاتیکی ئەو شێوەژیانەیە کە چێژوەرگرتن و تێرکردنی حەز و ئارەزووەکان و دروستکردنی پەیوەندیی ڕاستەوخۆ و دەستبەجێ لە ئێستا و لێرەدا، خاڵی هەرە سەرەکی و بنەڕەتییە تیایدا. ژیانێک تیایدا مرۆڤ بەدوای تێرکردنێکی دەستبەجێی ئارەزووەکانی و بەدوای بەدەستهێنانی چێژ و خۆشییەکی خێرا و ڕاستەوخۆدا دەگەڕێت، چ لە ئاستە مادییەکەیدا و چ لە ئاستە ڕەمزی و موفاریقەکەیدا. بە مانایەک لە ماناکان ئەم شێوەژیانە نزیکە لە ژیانێکی "دۆن جوان"ەوە، یان ئەو شێوەیەیە لە ژیان کە بە "ژینایێکی دۆنجوانانە" ناو دەنرێت، دۆن جوان وەک پیاوێک کە بەئاسانی و دەستەبجێ لەم ئافرەتەوە بۆ ئەو ئافرەت و لەم شێوازی چێژوەرگرتنەوە بۆ ئەو شێوازی تریان دەڕوات و تێدەپەڕێت. لە ڕاستیدا کیکیگارد شێوە ژیانی ئیستاتیکی کورت ناکاتەوە تەنها بۆ ئەم ڕەهەندە دۆن جوانییە، چونکە کیرکیگارد ئەو کەسەی کە هەڵگری ئەم شێوە ژیانەیە، وەک کەسێکی پڕ لە گومان و ڕەشبینی و ناجێگیر وێنا و بەرجەستە دەکات، کەسێک کە ناتوانێت پەیوەندیی قووڵ بە ژیان و بە ئینسان و بە مەسەلە گرنگەکانەوە دروست بکات و هەمیشە پەیوەندییەکانی کورتخایەن و کاتی و بێقوولایین. لە ڕاستیدا کیرکیگارد ئەم جۆرە پەیوەندییانە وەک پەیوەندیی ناپەیوەندی دەبینێت. ئەو جۆرە مرۆڤانە هەڵگریین کە ناتوانن خاوەنی هەڵبژاردنێکی ڕاستەقینە بن و خۆیان ساغ بکەنەوە و بە بارێکدا بکەون، مرۆڤێک ناتوانێت بەوەفا یان بێوەفا بێت، چونکە هەم وەفاداری تووشی نائومێدیی دەکات و هەم بێوەفاییش، هەم گیر بە دەستی وەفاوە دەخوات و

هەم بەدەست بێوەفاییەوە. ئەم شێوازە لە ژیان لە زۆر ڕووەوە و لە زۆر ئاستدا شێوازێکە دابڕاو لەبەرپرسیاریەت. ژیانێکی بێدەربەست و بێمەسەلە و بێبابەتە. مرۆڤ لێرەدا بەردەوام بەدوای ئازادییە کورت و کۆنکرێتەکاندا دەگەڕێت، بەبێ ئەوەی بیر لە ڕەهەندە ئەخلاقی و بەرپرسیارەکانی پیادەکردنی ئەم ئازادییانە بکاتەوە. وەک کیرکیگارد دەڵێت: ئەم جۆرە بوونەوەرە هەمیشە و هەردەم وەک وێڵگەردێک بەناو مەملەکەتی ئەگەرەکاندا دێت و دەچێت، بیر لە شتەکان دەکاتەوە و لەدەرەنجامەکانیان ورد دەبێتەوە، بەڵام هەرگیز ناتوانێت یان نایەوێت، هەڵبژاردنێکی بنەڕەتی و بنچینەیی لە ژیانیدا هەبێت و ئەنجام بدات.

شێوازی دووهەم شێوەژیانی ئەخلاقییە. ئەم شێوە ژیانە لای کیرکیگارد ئەو جۆرەیە کە مرۆڤ تیایدا هەستێکی گەورە بە بەرپرسیارێتی و بە جێبەجێکردنی ئەرک، ئاراستەی دەکات. ژیان لێرەدا ژیانە بە بوونی کۆمەڵێک مەرجەوە بۆ ئەنجامدان و ئەنجامنەدانی ئەم یان ئەو ئەرک و ئەم یان ئەو کار و هەڵسوکەوتی تایبەت. ژیانێکە هەم لەپاڵ هەستێکی گەورە بە بەرپرسیارێتی و هەم لەپاڵ هەستێکی قووڵ بە نادڵنیایی و گوماندا پیادە دەکرێت. ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە ژیانە هەڵدەبژێرن ئازایەتیی ئەوەیان تێدایە لەگەڵ گومان و دوودڵییەکانیاندا بژین، بەبێ ئەوەی گومان و دوودڵییەکانیان هەستکردنیان بە بەرپرسیارێتی کەم بکاتەوە. گومان و دوودڵی لەم جۆرە ژیانەدا گومان و دوودڵییەکی سادە نییە بەرانبەر بەم یان بەو هەڵوێست و بابەت و مەسەلەی تایبەت، بەڵکو گومانێکی وجودییانەی

قووڵە بەرانبەر بە بوون خۆی. تا ئەو شوێنەی ئەم گومانە دەبێت بەو چوارچێوە سەرەکییەی ئینسان لەناویدا دەژی. ئەم نەبوونی دڵنیاییە ئینسان دەکاتە بوونەوەرێکی ناسک و بەرپرسیار لە یەک کاتدا.

شێوە ژیانی سێهەم شێوەژیانی دینییە. بە بۆچوونی کیرکیگارد هیچ یەکێک لەو دوو شێوە ژیانەی باسمان کردن ناتوانن تاکەکەس بەقووڵی تێر بکەن و بەدەم هاوار و پێداویستییە ناوەکییە زۆرەکانیەوە بچن. هیچ یەکێکیان وەڵامی بوونی ئینسانی وەک بوونێکی تایبەت نادەنەوە، کێشەی مردن و کێشەی گومان و کێشەی نەبوونی دڵنیای و لەتلەتبوونی ناوەکی لای مرۆڤ چارەسەر ناکەن. بۆیە کیرکیگارد شێوەژیانێکی تر پێشنیار دەکات کە پێی وایە دەتوانێت نوقسانییەکانی ژیانی ئیستاتیکی و ژیانی ئەخلاقیی پڕ بکاتەوە، ئەو شێوەژیانەش "شێوەژیانی دینی"یە. بە بۆچوونی کیرکیگارد تەنها لە شێوەژیانی دینیدا ئەخلاق و دین بەیەکتری تێکەڵ دەبن و ئینسان دەتوانێت بەسەر وەسوەسە و گومان و پارپارچەبوون و ترسەکانیدا سەر بکەوێت، بەتایبەتی ترسی مردن و ترسی کورتبوونی ژیان لە سەرزەمیندا. باوەڕبوون بە خودایەک دەتوانێت ئینسان بەرەو ئەودیوی مردن ڕابکێشێت و ڕەهەندێکی ئەبەدیی بێبڕانەوە بە ژیان ببەخشێت. بە بۆچوونی کیرکیگارد دروستکردنی پەیوەندییەکی پڕ خۆشەویستی و ناسکیی لەگەڵ خودادا تاقە ڕێگایەکە بۆ سەرکەوتن بەسەر مەسەلەی مردن و کورتی و کۆتاییهاتنی ژیاندا.

کیرکیگارد دیوارێکی ئەستوور لەنێوان ئەم سێ شێوازە لە

بووندا دروست ناکات، چونکە ئینسان دەتوانێت تێکەڵێک لەم شێوازانە بەیەکەوە هەڵبژێرێت و هەرسێکیان بەیەکەوە بژی. بۆ نموونە مرۆڤ دەتوانێت لە یەک کاتدا هەم ئەخلاقی و دینی و هەم ئیستاتیکی بێت، یان ئیستاتیکی و ئەخلاقی بێت بەبێ دین، یان دینی و ئیستاتیکی بێت، بەبێ ئەخلاقی. مەسەلەکە پەیوەستە بە هەڵبژاردنی ئینسان خۆیەوە.

**دین و ڕەسەنایەتی**

کیرکیگارد پێی وایە ئینسان تەنها لە شێوازی سێهەمدا دەتوانێت ژیانێکی "ڕەسەن" بژی، تەنها ژیانێکی دینی ئینسان دەکاتە بوونەوەر و خاوەن ژیانێکی ڕەسەن. چەمکی "ڕەسەن" لای کیرکیگارد یەکێکە لە چەمکە فەلسەفییە گرنگەکان. ئەم چەمکە هێما بۆ ئینسان دەکات وەک بوونەوەرێکی دەگمەن و هێما بۆ ژیانیش ژیان دەکات وەک حیکایەتێکی شەخسیی تایبەت و چڕی پڕ گەرمی و هەڵبەزودابەزی قابیلی کۆپینەکردن. چەمکی ڕەسەن پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەو پەیوەندییە ناوەکی و شەخسییانەی ئینسانەوە هەیە کە لەگەڵ بوون و واقیع و دەوروبەریدا دروستیان دەکات، پەیوەندیی بە بوونی ئینسانەوە هەیە وەک بوونەوەرێک کە بەبەردەوامی پرسیار لە خۆی دەکات و سەربەخۆیانەش بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا بگەڕێت.[1] ئەمانە وا دەکەن ئینسان لە هەوڵی ئەوەدا بێت بوونی خۆی لە یەک کاتدا هەم بکات بە گشتێکی

---

١ - بڕوانە:
Golomb, Jacob (1995).In Search of Authenticity: Existentialism from Kierkegaard to Camus. Routledge.

گەورە و مانادار و هەم بە تاکەکەسێکی کامڵ.

بە گەڕانەوە بۆ ئەو سێ شێوازە ژیانەی کیرکیگارد لە یەکتریان جیا دەکاتەوە، ژیانی ڕەسەن و کەسایەتیی ئینسانی ڕەسەن، سەر بە شێوەژیانی ئیستاتیکی و ئەخلاقی نییە، چونکە لە یەکەمیاندا ئینسان ناتوانێت هەڵبژاردنێکی بنەڕەتیی هەبێت و بچێتە پاڵ ئەم یان ئەو مەسەلە و ناتوانێت بوونەوەرێکی بەرپرسیار بێت، لە کاتێکدا لە دووهەمیاندا وەڵامێکی بۆ نادڵنیای و گومان و ترسولەرزەکانی مردن نییە، ئەگەرچی بشتوانێت ژیانێکی ئەخلاقیی ڕەسەنانە بژی. لای کیرکیگارد ئەوەی سەرزەمینی ژیانی ڕەسەنە شێوەژیانی سێهەمە، واتە شێوەژیانی دینییە. ئینسان لەم شێوە ژیانەدا دەتوانێت ژیانی بەقەناعەتەوە بۆ یەک باوەڕ و بۆ خزمەتکردنی یەک مەسەلەکە باوەڕێکی قووڵی پێیەتی، تەرخان بکات. لەم شێوەژیانەدا زانیاری و مەعریفە بە مانا بابەتییەکانیان گرنگ نین، بەڵکو بەو مانا شەخسی و تایبەتانە گرنگن کە بە ئەزموونی شەخسیی تاکەکەسەکانەوە گرێ دراوە. هەقیقەت لێرەدا گرنگ نییە، لەبەر ئەوەی هەقیقەتێکی بابەتییە، ئەم یان ئەو لقی زانست دەیسەلمێنێت، بەڵکو هەقیقەت کاتێک گرنگە کە بتوانێت ببێت بە "هەقیقەتێکی شەخسیی." کە مانایەکی تایبەت و ناوەکیی شەخسی لای ئینسان پەیدا بکات. بە بۆچوونی کیرکیگارد ئەم مانا تایبەتی و شەخسییەی هەقیقەتە وا دەکات ئینسان بڕیار بدات بەرگری لەم یان لەو مەسەلە بکات و خۆی بۆ ئەم یان ئەو بابەت تەرخان بکات، یان بەرگری لەم کێشە بکات و دژی ئەوی تریان بوەستێتەوە. لای کیرکجارد بنەما و ژێرخانی ئەم شێوەیە

لە ژیان و کەسایەتیی ڕەسەن، دینە. دینە وا دەکات ئینسان لە دۆخی گەڕانەوەیەکی بەردەوامدا بێت بۆ ناوەوەی خۆی و لەوێشەوە پەیوەندیی بە دونیا و دیاردە و زانیارییەکانەوە دروست بکات. بالاترین فۆرمی هۆشیارییش لای کیرکیگارد هۆشیارییە بە خودا، کە وا لە مرۆڤ دەکات لە یەک کاتدا خۆی هەم وەک تاوانبار و هەم وەک بوونەوەرێک ببینێت کە دەتوانێت قەداسەتی خوداوەند وەر بگرێت و ئامێزی بۆ بکاتەوە. ئەم ڕێگایەش ڕێگایەکە مرۆڤ بە ئازادیی ڕاستەقینە دەگەیەنێت، بەلام هاوکات ڕێگایەکە پێویستی بە ئیرادەیەکی بەهێز و بە خەیاڵ و بە بڕوا و بە خۆشەویستی و تۆبە و سەبر و سادەبوون هەیە. ئەم ڕێگایە لە یەک کاتدا مرۆڤ هەم لە ئیرادە بەتاڵ دەکاتەوە، هەم دەیکاتە هەڵگری خودا و خوداوەند. لای کیرکجارد ئینسان بوونەوەرێکە پڕە لە گومان و نادڵنیایی و دوودڵی، ئەوەی وا دەکات ئینسان بتوانێت لەگەڵ ئەم ڕووبەرە گەورەیەی گومان و نادڵنیایی و دوودڵیدا بژی و ئەوەی وا دەکات ئینسان بەو هەموو گومانانەوە ببێتە بوونەوەرێکی ڕەسەن، باوەڕە. بەبێ باوەڕ ئینسان ناتوانێت ئینسانبوونی خۆی بە مانا قووڵەکانی بژی.

بەکورتی، کیرکیگارد دین و باوەڕ نەک ناخاتە هیچ پەیوەندییەکەوە لەگەڵ عەقڵ و عەقلانیەتدا، نەک بە زمانی سیحر و خورافەت قسە لەسەر دین و باوەڕی دینیی ناکات، نەک دین بە بەشێکی کاتی و ناپێویستی ژیانی تاکەکەسی و دەستەجەمعیی نازانێت، نەک باوەڕی بەوە نییە کە شوێنی دین بە زانست و عەقلانیەتی نوێ بگیرێتەوە، بەڵکو دین و باوەڕ دەخاتە دەرەوەی هەموو داوەریکردنێکی عەقلانییەوە

و وەک شتێکی جەوهەریی ژیانی ئینسانی دەیناسێنێت. لەم ڕوانینەدا دین دەکەوێتە شوێنێکەوە لە دەرەوەی تواناکانی عەقڵدا بۆ پشکنین و دۆزینەوەی مانا نادیار و قووڵەکانی بوونەوە. بەم شێوەیە کیرکیگارد مانایەکی دەروونی و ڕۆحی و تاکەکەسی بە دین دەبەخشێت، کە دەیخاتە دەرەوەی هەموو ئەو شێوازانە لە فیکر و بیرکردنەوە و تێڕامانەوە کە بەدوای زانیاریی بابەتی و بەدەستهێنانی دڵنیاییەوەن لەسەر بنەمای ئەو زانیارییە بابەتییانە. دین یان باوەڕ لێرەدا پەیوەندیی بە سەلماندن و پاسادانی زانستی و لۆژیکییەوە نییە، پەیوەندیی بە گریمانە و ئەگەر و ئیحتیمالیەتی عەقڵییەوە نییە، قبووڵکردنێکی عەقڵانییانەی ئەم یان ئەو بیروبۆچوون و بیردۆز نییە، لە ڕاستیدا دین هەر پەیوەندیی بە عەقڵەوە نییە، لەباتیی ئەمانە دین پەیوەندیی بە بوونی متمانەیەکی ریشەییەوە هەیە، متمانەیەکی ڕیشەیی وا کە ئینسان بە شێوەیەکی شەخسی لەگەڵیدا دەژی و لە ناوەوە ئینسان دەکاتە بوونەوەرێکی ئەخلاقی و بەرپرسیار و دڵنیا.

بەم مانایە دین لای کیرکیگارد دیاردەیەکی تاکەکەسییە، پەیوەستە بە پەیوەندیی مرۆڤ بە خودی خۆیەوە، جۆرێکە لە سوفیزم کە ڕووی لە کۆمەڵگا و ئینسانەکای تر نییە، بەڵکو ڕووی لە تاکەکەس و لە دونیای ناوەوەی مرۆڤەکانە، بەڵام سوفیزمێک کیرکیگارد بە بەشێکی هێجگار گرنگ و سەرەکیی ژیانی ئینسانی دەزانێت لە هەموو سەردەمەکاندا. سوفیزمێک کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا، بەو شێوەیەی لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسمان کرد، توانای بینین و لێتێگەیشتنی نییە. بەم جۆرە ئەو دینەی کە هیگڵ و نیتشە

و فیورباخ و مارکس دەیانەویت وەک بیکردنەوەی هەڵە و خورافەت وێنای بکەن، یان تیزەی بەعەلمانیبوونی دونیا پێی وایە پەراویز دەبێت و ڕۆڵێکی لە ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا نامێنێت، لای کیرکیگارد دەبێت بە کۆڵەکەی سەرەکیی دروستبوونی ئینسانێکی کامڵ و بەرپرسیار. لە ڕاستیشدا ئەو وێنەیەی کیرکیگارد بۆ مرۆڤی هەیە ئاڵۆزترە لەو وێنەیەی کە هیگڵ و مارکس و فیورباخ هەیانە، ئەگەرچی گۆڕینی دین بۆ پێداویستییەکی غەریزیی یان نیمچەغەریزیی لای مرۆڤ تیزێکی تەواو پڕ کێشە و ڕەها و جەوهەرگەرایە.

# سەرچاوەکان

Bernier، Mark (2015). The task of hope in Kierkegaard. Oxford University Press P. 163-164

Golomb, Jacob (1995).In Search of Authenticity: Existentialism from Kierkegaard to Camus. Routledge.

Hanson, Jeffrey A. (2017).Kierkegaard and the Life of Faith: The Aesthetic, the Ethical, and the Religious in Fear and Trembling . Indian University Press.

Stewart, Jon (2003). Kierkegaard's relation to Hegel reconsiderd. Cambridge University Press.

Stweart, Jon (2012). Kierkegaard's Influence on Philosophy: German and Scandinavian

Philosophy. London: Ashgate. P. 135.

Tepelevich, Lawrence S. (1983). The Young Hegelians: An Anthology. Cambridge

# ڕەخنە لە نادین (٢)
# ئالێکسی دی تۆکفیل و پەیوەندیی نێوان دین و دیموکراسیەت

**سەرەتا**

وەک لە بەشەکانی پێشوودا نیشانم دا لە سەدەی نۆزدەهەمەوە تێزێک لە فیکری کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەلسەفیدا بالادەستە کە باس لە کەمبوونەوەی ڕۆڵی دین لە ژیانی گشتی و پاشەکشەکردنی بۆ ناو ژیانی تایبەتیی تاکەکەسەکان دەکات. باس لەوە دەکات دین نەک هیچی ئەوتۆی نەماوە لەسەر ئینسان و دونیای مۆدێرن بیڵێت، بەڵکو بەرەو ئەوەش دەچێت کۆتایی پێ بێت و شوێنی بیرکردنەوەی زانستی و میتۆدی عەقڵانی بگیرێتەوە. لە فیکری کۆمەڵایەتیدا ئەم تێزە بە تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" ناسراوە و لەگەڵ خۆشیدا ئایدیۆلۆژیایەکی گەورەی دروست کردوە کە "ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەتە"، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەگوترێت "سیکیولاریزم". ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت، بە پشتبەستن بە تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا"، داوای ئەوە دەکات دین هیچ ڕۆڵێکی سیاسیی نەمێنێت و بەشێک نەبێت لە بەرخورد و

ململانێ و موناقەشەکانی ناو "ژیان" و"ڕووبەری گشتی." لە ڕاستیدا داوای ئەوە دەکات دین بەتەواوی کورت ببێتەوە بۆ پەیوەندییەکی شەخسی لەنێوان ئیماندار و خوداوەندا. وەک وتم ئەم ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنە، پشت بەو تێزی "بەعەلمانیبوونی دونیا"یە دەبەستێت کە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە بووە بە بەشێکی گەورەی فیکری کۆمەلایەتی و فەلسەفی، بەتایبەتی بووە بە هێلە هەرە سەرەکی و گشتییەکانی زانستی "کۆمەڵناسی." بەتایبەتی زانستی "کۆمەڵناسیی دین". کۆمەڵناسە بەناوبانگ و گەورەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم ڕۆڵێکی گەورە دەبینن لە بڵاوکردنەوەی تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا"و ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت خۆشیدا. هێلە گشتییەکانی تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" باس لە کەمبوونەوەی ڕۆڵی دین لەسەر ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی دەکات و پێ لەسەر لاوازبوونی بەردەوامی هێزی دەزگا دینییەکان دادەگرێت و هەوڵ ئەدات ئەوە بسەلمێنێت کە کاریگەریی دین لەسەر ئەخلاق و هەڵسوکەوتی ئینسانی بەبەردەوامی بەرەو لاوازبوون و کەمبوونەوە دەچێت.

لە بەشی پێشوودا هەوڵم دا فیکری کیرکیگارد وەک نموونەی ئەم شێوازە لە بیرکردنەوە نیشان بدەم کە لە ئاستی فیکری فەلسەفیدا ئامادەیە و لە دەرەوەی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا باس لە گرنگیی دین بۆ ژیانی مرۆڤەکان دەکات، واتە لە سەدەی نۆزدەهەم و لە ئاستی فەلسەفیدا، فیکرێکی دینیی گرنگ لەپاڵ فیکری دژەدینیی فیورباخ و مارکس و نیتشەدا ئامادەیە. ئەم فیکرە لە نموونە کیرکیگاردییەکەیدا نەک

دژەدین نییە، بەڵکو دین بنەمای سەرەکیی بیروبۆچوون و تێڕوانینەکانیەتی بۆ ژیان و دونیا و شوێنی ئینسان لەناویاندا کە دواتر لە سەدەی بیستەمدا فەلسەفەی بوونگەرایی لێ دەکەوێتەوە. هاوکات ڕۆڵی دین لە ئەدەبیاتی کەسانێکی وەک دیستۆفسکی و تۆڵستۆی و هێرمان هێسە و چەندانی تریشدا بەئاشکرا دیارە کە هەموویان لە دەرەوەی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا بیر دەکەنەوە و دەنووسن و شوێنێکی گرنگ بۆ دین لە دونیای هاوچەرخدا دەهێڵنەوە. ئەوەی لەم بەشەدا لێک ئەدرێتەوە و باس دەکرێت، هەندێک لە دید و بۆچوونەکانی کۆمەڵناسی فەرەنسی: ئەلێکسی دی تۆکفیل (١٨٠٥ -١٨٥٩)ە، تۆکفیل نیشانی ئەدات هەموو کۆمەڵناسەکانی سەدەی نۆزدەهەم باوەڕیان بە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا نەبووە و باسیان لە ئەزموونی سیاسی و کۆمەلایەتیی تر کردوە، ئەزموونی کرمەڵگای ئەمەریکی، کە تیایدا دین کاریگەرییەکی گەورە و بەردەوامی هەبووە. تۆکفیل نموونەی ئەو کۆمەڵناسانەیە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە زمانی خوارافەت و سیحر و کەنارگیربوون و پاشەکشەکردنی دین بۆ سنوورەکانی "ژیانی تایبەت"، قسە ناکات. بە پێچەوانەوە لە کتێبی "دیموکراسیەت لە ئەمەریکا"دا باس لە تێگەیشتن و ڕۆڵێک بۆ دین لەکۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەکات، تەواو پێچەوانەی ئەو تێگەیشتن و ڕۆڵەیە کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا گریمانی دەکات. تۆکفیل باس لە گرنگیی ڕۆڵی دین لە دروستبوونی ئەزموونی دیموکراسیەت لەئەمەریکادا دەکات و بەمەش ڕۆڵی کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و سیاسیی گرنگی دین لە کۆمەڵگایەکی مۆدێرن و دیموکراسیدا

نیشان ئەدات، کە پێچەوانەی کورتکردنەوەی ئەو دیدەیە کە دین بۆ پەیوەندییەکی شەخسی و تایبەت لەنێوان خوداوەند و تاکەکەسدا، کورت دەکاتەوە.

**تۆکفیل کێیە؟**

ئەم پیاوە فەرەنسییە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا لەدایک دەبێت و لە ناوەڕاستی سەدەکەدا و لە تەمەنی پەنجاوچوار ساڵیدا دەمرێت. تۆکفیل بە کۆمەڵناس و فەیلەسوفێکی سیاسی ناسراوە، یەکێکە لە تیوریستە گرنگ و سەرەکییەکانی دیموکراسییەت و لیبرالیزمی سیاسی لە دونیای مۆدێرندا. بڕێکی زۆری کەسوکاری تۆکفیل دژی شۆڕشی فەرەنسی بوون و لە هەوادارانی لویسی چواردەهەم بوون، بۆیە زۆربەیان لە کاتی ڕووداوەکانی شۆڕشەکەدا دەگیرێن و دەکوژرێن، دایک و باوکی تۆکفیل بە ڕێکەوت لە کوشتن ڕزگاریان دەبێت.[1] بەلام سەرەڕای ئەو هەموو کارەساتە شەخسییانە کە شۆڕشی فەرەنسی بۆ تۆکفیل و خێزانەکەی دروستی دەکات، کەچی ئەو ئەو دووربینییە فیکری و سیاسییە لەدەست نادات کە سیستمی دیموکراسی تازەدامەزراو وەک سیستمێکی کاتی ببینێت و چاوەڕوانی ئەوە بێت بکەوێت و هێزە ئەرستۆکراتییە کۆنەکان دەسەلات بگرنەوە دەست. تۆکفیل سیستمی دیموکراسیی دوای شۆڕشی فەرەنسیی وەک سیستمێکی تازە، سیستمی ئایندە دەبینێت

١ - بڕوانە:
Jacob P. Mayer (1960). Alexis de Tocqueville: A Biographical Study in Political Science. Gloucester, Mass. : P. Smith,

و پێشی وایە فەرەنسا ناتوانێت چیتر بۆ دواوە بگەڕێتەوە و ئەرستۆکراتیەت زیندوو بکاتەوە. بە بۆچوونی تۆکفیل هەر هەوڵێکی لەو بابەتە دژ بە ویستی سەردەمەکەیە و جەنگ و کارەسات دروست دەکات و خوێنێکی زۆریش دەڕێژێت. ئەمە وا دەکات بەشێکی گرنگی فیکری ئەم پیاوە تەرخان بێت بۆ دۆزینەوەی وەڵام بۆ پرسیارگەلێکی لەم بابەتە: چۆن ئەو بیرۆکەی یەکسانییەی کە شۆڕشی فەرەنسی دەیهێنێت و چۆن ئەو قازانج و مەسڵەحەتانەی کە هێزە ئەرستۆکراتەکان لەدەستیان داوە، بە شێوەیەک ڕێک بخرێن و بڕۆن بەڕێوە، کە ئازاری زۆر بە کۆمەڵگای فەرەنسی نەگەیەنێت؟ لە دۆزینەوەی وەڵامدا بۆ ئەم پرسیارە ئەزموونی دیموکراسییانەی ئەمەریکا و چۆنیەتیی کارکردنی ئەو سیستمە، دەبێتە ئەو ڕوانگەیە کە تۆکفیل پەنای بۆ دەبات بۆ ئەوەی وا بکات ئەزموونی بونیادنانی دیموکراسیەت لە فەرەنسادا سەر بکەوێت و زیانێکی کەمی بۆ کۆمەڵگای فەرەنسی هەبێت.

بە باوەڕی تۆکفیل سیستمی دیموکراسی، سیستمی ئایندەیە و ڕێگرتن لێی کارێکی زەحمەت و توندوتیژ و پڕ پشێوی و ناڕەحەتیی گەورە دەبێت، بەڵام ئەمە وا ناکات تۆکفیل هێما بۆ ڕەهەندە خراپ و ترسناکەکانی دیموکراسیەت نەکات و باس لەوە نەکات کە دەبێت چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە، لەوانەش بۆ نموونە چۆنیەتیی ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان بیرۆکەی یەکسانی و بیرۆکەی ئازادی، کە دوو بیرۆکەی گرنگی ناو سیستمی دیموکراسین، چونکە دەشێت ئازادیی زۆر زیان بە مەسەلەی یەکسانی بگەیەنێت و سەپاندنی یەکسانییش بەزۆر، دەشێت زیانی زۆر بە

مەسەلەی ئازادیی بگەیەنێت. بۆیە دۆزینەوەی پەیوەندییەکی هاوسەنگ لەنێوان یەکسانی و ئازادیدا یەکێکە لە تەحەدا گەورەکانی سیستەمی دیموکراسیەت. مەترسییەکی هێجگار گەورەی تر، کە تۆکفیل لە سیستەمی دیموکراسیەتدا دەیبینێت، دروستبوونی "دیکتاتۆریەتی زۆرینە"، یان "ستەمگەری زۆرینە"یە، واتە ستەمگەریی ئەو هێزەی کە دەتوانێت لە هەڵبژاردندا زۆرینەی دەنگەکان بهێنێت، بەرانبەر بە هەموو ئەوانەی کە کەمینەن یان دەبن بە کەمینە لە کۆمەڵگادا. لای تۆکفیل "دیکتاتۆریەتی زۆرینە" مانای بێنرخکردن و بێمافکردن و ئیهانەکردنی بەردەوامی کەمینەکان، ئیتر لە کەمینە سیاسییەکانەوە بیگرە بۆ کەمینە ئەتنی و دینی و کولتوورییەکان. ئەمەش لە دیدی تۆکفیلدا نوقسانییەکی گەورەی ناو سیستەمی دیموکراسییە و پێویستە ئەم سیستەمە لە گەشەکردنیدا بەسەریدا سەر بکەوێت. مەترسییەکی تری دیموکراسیەت لە دیدی تۆکفیلدا بریتییە لە مەترسیی گوێشلکردنێکی نارەخنەییی هێزە دەسەڵاتدارەکان بۆ کۆمەڵگا و دووبارەکردنەوەی ئەو شتانەی کە زۆرینە بەدڵیانە، با ئەو شتانەش خراپ و زیانبەخش بن و لەسەر بێمافکردنی ئەم یان ئەو لایەن و هێزی کۆمەڵایەتیی تر دروست بووبن.[1] ئەمەش ئەو مەترسییە گەورەیەیە کە لە زمانی سیاسیی ئەمڕۆدا بە مەترسیی دروستبوونی پۆپۆلیسم ناو دەبرێت. بۆ ڕێگرتن لە برێکی زۆری ئەم مەترسییانە تۆکفیل باس لەگرنگیی بوونی

١ - بڕوانە:
Welch, Cheryl B (2006). The Cambridge Compnion to Tocqueville. Cambridge.

کۆمەڵگای مەدەنیی دەکات، کۆمەڵگایەکی مەدەنیی بەهێز و قسەکەر کە بتوانێت لەسەر مەسەلە سەرەکی و بنەڕەتییەکان ببێتە دەنگ. تۆکفیل لەم ئاستەدا باس لە گرنگیی بوونی ڕێکخراوی سەربەخۆی مەدەنی و باس لە ئازادیی میدیا و لە بوونی دەزگای داوەریی سەربەخۆش دەکات. تۆکفیل خۆی بە شێوەیەکی چالاک بەشداریی لە ژیانی سیاسیی کۆمەڵگای فەرەنسیی سەردەمەکەی خۆیدا دەکات و بۆ ماوەیەکیش وەک ئەندامی پەرلەمان دەستبەکار دەبێت. هاوکات ڕۆڵێکیش بە دین لە سیستمی دیموکراسییەتدا دەبەخشێت کە جیاوازە لە دیدی کۆمەڵناس و خوێندەوارەکانی سەردەمی خۆی و ئەم ڕۆڵەی دینیش وەک هەوڵێک بۆ سەرکەوتن بەسەر برێک لە کێشەکانی سیستمی دیموکراسیدا وێنا دەکات. تۆکفیل دوای سەفەرکردن بۆ ئەمەریکا و تێبینیکردنی چۆنیەتیی ئیشکردنی سیستمی سیاسیی ئەمەریکی و پەیوەندیی ئەو سیستمە بە کۆمەڵگای ئەمەریکییەوە بەو قەناعەتە دەگات کە دین دەتوانێت ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ لە کۆمەڵگایەکی دیموکراس و مۆدێرندا ببینێت.[1]

## تۆکفیل و دین

تۆکفیل لە ساڵی ١٨٣١ بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە سیستمی زیندان لە ئەمەریکادا سەفەر بۆ ئەو وڵاتە دەکات، لەو ڕۆژگارەدا فەرەنسا دەیویست سیستمی زیندانەکانی خۆی

---

١ - بڕوانە:
Mansfield, Harvey (2016). "Tocqueville on Religion and Liberty." *American Political Thought*, Spring.

ڕیفۆرم و دەستکاری بکات و لەسەر مۆدێلی زیندانە ئەمەریکییەکان دایبرێژێتەوە. لەدوای کۆتایی سەفەرەکەی و گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا، تۆکفیل لە ساڵی ١٨٣٥ بەرگی یەکەمی کتێبی "دیموکراسیەت لە ئەمەریکا" دەنووسێت و بڵاوی دەکاتەوە و بەرگی دووهەمی دوا دەکەوێت بۆ ساڵی ١٨٤٠. یەکێک لە مەبەستەکانی نووسینی ئەم کتێبە لای تۆکفیل ئەوەیە ئەوە نیشانی کۆمەڵگای فەرەنسی بدات کە کۆمەڵگای دیموکراسی چۆن دروست دەکرێت و چۆن کار دەکات. ئەوەی لە ئەمەریکا سەرنجی تۆکفیل ڕادەکێشێت مەسەلەی یەکسانییە، بەتایبەتیی یەکسانیی نێوان ژن و پیاو و یەکسانیی نێوان گروپە دینییە جیاوازەکان. یەکسانی بە مانای ئەوە نا هەموو کەس بە هەمان بڕ پارە و دەسەڵاتی مادیی هەبێت، بەڵکو بە مانای ئەوەی هەموو پۆستە سیاسی و دەزگاییە گرنگەکانی ئەو وڵاتە لەبەردەم هەمووانددا بە هەمان بڕ کراوە بێت. هاوکات مەسەلەی یەکسانبوونێکی تەواو بۆ هەمووان لەبەردەم یاسادا، ئەمە جگە لە بوونی یەکسانییەکی گەورە بۆ هەر کەس و لایەنێک بیەوێت ڕا و بۆچوون و تێڕوانینەکانی خۆی دەر ببڕێت و ئاشکرا بکات، هاوکات بوونی یەکسانیی لەمافی خۆڕێکخستن و دروستکردنی دەزگا و گروپ و ڕێکخراوی تایبەتدا. لای تۆکفیل هەموو ئەم یەکسانییانە یەکسانیی کۆمەڵایەتین، نەک یەکسانیی ئابووری و مادی. ئەمەش مانای ئەوەیە کەس لەسەر بنەمای حەسەب و نەسەب و ئینتیما بۆ ئەم یان ئەو خێزان و ناوچە و دین و گروپی سیاسی لە کەسی تر خاوەنمافتر و بەرزتر یان نزمتر نییە. تۆکفیل بەشێک لەم ڕۆحی یەکسانخوازییەی ئەمەریکا

دەبەستێتەوە بە ئایینی پرۆتستانیزمەوە لەو وڵاتەدا و پێی وایە لەو وڵاتانەدا کە پرۆتستانیەت دینی باڵادەستە، ئینسانەکان بەگشتی و ئافرەتان بەتایبەتی، زیاتر ئازادن تا لەوانەدا کە کەنیسەی کاتۆلیک باڵادەستە. تۆکفیل سەبارەت بە ئەمەریکا دەنووسێت: "ئەخلاق و دین و نیزام" مەرج نییە ناکۆک بێت بە "ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ لەبەردەم یاسادا".[1] بەمەش تۆکفیل پەیوەندییەکی پۆزەتیڤ و ئیجابی لە نێوان دین و دیموکراسیەتی ئەمەریکیدا پێشنیار دەکات. یەکێکی تر لەو دیاردانەی کە لە ئەمەریکا سەرنجی تۆکفیل ڕادەکێشێت مەسەلەی بەتاکەکەسبوونە، واتە بوونی ئینسان بە تاکەکەسێکی ئازاد و سەربەخۆ. بە بۆچوونی تۆکفیل دین لە ئەمەریکادا هەم لەگەڵ بیرۆکەی یەکسانی و هەم لەگەڵ دیاردەی بەتاکەکەسبووندا گونجاوە و خۆیشی بەشدارە لە بەهێزکردن و قووڵکردنەوەی ئەو دوو دیاردەیەدا. بەمەش دین لەو وڵاتەدا ڕیکادا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە دروستکردن و پایەدارکردنی سیستمی دیموکراسی لەو وڵاتەدا. تۆکفیل لە کتێبی: "*دیموکراسیەت لە ئەمەریکا*"دا بەوردی لە ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگای ئەمەریکیدا ئەدوێت. بۆ تۆکفیل کە خۆی وەک فەرەنسییەک لە سیستمێکی سیاسیدا ژیاوە کە دوژمنایەتییەکی گەورە لەنێوان دین و سیستمەکەدا لەئارادا بووە، مەبەستم سیستمی سیاسیی فەرەنسای دوای شۆڕشی فەرەنسییە، ڕۆڵی جیاوازی دین لە ئەمەریکادا نەک تەنها سەرنجی ڕادەکێشێت، بەڵکو تووشی سەرسوورمانیشی

1 - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.٢٥٠

دەکات. تۆکفیل دەبینێت دین چ شوێن و جێیەکی گەورە و بەرچاوی لەژیانی گشتی و دەزگایی کۆمەڵگای ئەمەریکیدا هەیە و لەم ڕووەوە چ ڕۆڵێکی گەورە و گرنگ لەو کۆمەڵگایەدا دەبینێت. لەم ڕووەوە تۆکفیل لە کتێبەکەیدا دەنووسێت: "لە دونیادا شوێنێکی تر بوونی نییە وەک ئەمەریکا، کە تیایدا دینی مەسیحی ئەو کاریگەرییە گەورەیەی لەسەر ڕۆح و دەروونی ئینسانەکان هەبێت". بێگومان تۆکفیل لەوێ بە چاوی خۆی دەبینێت کە دەوڵەتی ئەمەریکی دەوڵەتێکی دینی نییە و دین و دەوڵەت لە ئەمەریکادا بەوردی لە یەکتری جیا کراونەتەوە، بەڵام مەسەلەکە لای تۆکفیل جیاکردنەوەی دین و دەوڵەت نییە لە یەکتر، بەڵکو ڕۆڵی دینە لە ژیانی گشتی و دەزگایی ئەو کۆمەڵگایەدا. ئەوەی تۆکفیل دەیبینێت و تێبینیی دەکات؛ ئامادەگیی کۆمەڵگایەکی دینیی ئیماندارە، کە دین بەشێکی گرنگی ژیانی گشتیی ئەو کۆمەڵگایەیە، کەچی دین نەچۆتە ناو سیستەمە سیاسییەکەوە، بەڵام کورتیش نەکراوەتەوە بۆ پەیوەندییەکی شەخسی لەنێوان ئیماندار و خوداکەیدا. بەڵکو دین بە شێوازی جیاواز لەناو کۆمەڵگای مەدەنی و لەناو پەیوەندیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا و لەناو سیستمی بەها و نرخە ئەخلاقییەکاندا ئامادەیە. بەڵام هاوکات سەرەڕای دینیبوونێکی گەورەی کۆمەڵگای ئەمەریکیی، دەستووری وڵاتەکە بێدوودڵی "ئازادیی ویژدان" و ئازادیی عەقیدە و ئازادیی دروستکردنی ڕێکخراو و گرووپی دینی و نادینیی قبووڵ کردوە. ئەمەش مانای ئەوەیە سیستمە سیاسییە دیموکراسییەکەی ئەمەریکا هاوشانە بە سیستمێکی

کۆمەڵایەتیی پلورال و کراوە بە ڕووی بیروبۆچوونی جیاواز و دروستکردنی گروپ و دەزگای دینی و نادینیی جیاوازدا. ئەوەی تۆکفیل لەم دۆخەدا تێبینیی دەکات پەیوەندییەکی قووڵ و بونیادییە لەنێوان "ڕۆح"ی ئازادی و "ڕۆح"ی دیندا. تۆکفیل پێی وایە بیرۆکەی ئازادی لە ئەمەریکادا لەسەر بنەمایەکی دینی دامەزراوە و نیشتەجێیە، واتە دین بەشێکە لە پرۆژەی ئازادیی ویژدان و باوەڕ و عەقیدە، نەک بەشێک لە دۆخی سەپاندنی موقەدەسێک بەسەر کۆمەڵگادا، یان سەپاندنی تێگەیشتنێکی دینی بەسەر سەرجەمی تێگەیشتنەکانی دیکەدا. تۆکفیل تا ئەو شوێنە لە پەیوەندیی نێوان دین و ئازادیدا دەڕوات کە بڵێت: "ستەمگەری دەتوانێت بەبێ دین حوکم بکات، بەڵام ئازادیی ناتوانێت بەبێ دین حوکم بکات."[1] وەک ئاشکرایە ئەم دیدە تەواو ناکۆکە بەو دیدەی ماکس ڤێبەر کە دین بە سیستەمی "شەرعیەتی تەقلیدی"یەوە گرێ ئەدات و باس لە داماڵینی سیحر لە دونیا و کەنارگیربوونی ڕۆڵی دین لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەکات.

## بێلایەنیی دەوڵەت

ئەو خاڵەی کە تۆکفیل لە چۆنیەتیی دارشتنی دەوڵەتی ئەمەریکیدا تێبینیی دەکات، ئەوەیە کە دەوڵەت خۆی بێلایەنە لە بەرانبەر دیندا، واتە دەوڵەتی ئەمەریکی دەوڵەتێک نییە بەرگری لەم دین یان لەوی تریان بکات، یاخود یاساکانی

١ - بڕوانە:
Alexis de Tocqueville (1990). Democracy in America. New York: Vintage, 1:307.

لەسەر بنەمای دینێک لە دینەکان دەر بکات، یان ئەم لێکدانەوەی دین بەسەر ئەوی تریاندا بسەپێنێت، بەلام هاوکات رێ لە کۆمەڵگاش ناگرێت پڕ بێت لە گروپی دینیی جیاواز و رێکخراو و رێکنەخراو و پڕبێت لە ئۆرگان و دەزگای دینی، ئەم دەزگا و گروپانەش رۆڵی بەرچاو لە ژیانی گشتیی ئەو کۆمەڵگایەدا ببینن. تۆکفیل پێی وایە ئەم دۆخە تایبەتەی ئەمەریکا وای کردوە دین لەو کۆمەڵگا مۆدێرنەدا نەک لاواز نەبێت، بەڵکو زۆر بەهێز و ئامادەش بێت، ئەرک و وەزیفە کۆمەلایەتییەکانی زیادی کردبێت، نەک کەمی کردبێت، بەشێک بێت لە چوارچێوە رۆحییەکانی ژیانی تاکەکەسی و دەستەجەمعی، نەک شتێک بێت یەکسان بێت بە "منالیی فیکر" و "منالیی ئینسان"و "خورافەت"، یان بە شتێک چاوەڕوانی ئەوە بکەیت رۆژێکیش بێت بپووکێتەوە و لەناو بچێت. نەک هەر ئەمە بەڵکو تۆکفیل دین وەک چارەسەر بۆ بڕێک لە کێشە و گرفت و نوقسانییەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن و کۆمەڵگای دیموکراسی دەبینێت، لەپێش هەمووانیشەوە بەگژاچوونەوەی تاکگەراییەکی بێسنوور کە نارسیزمێکی ناتەدروست و کۆنترۆڵنەکراو دروست بکات، یاخود رێ بە هەندێک لە فۆرمەکانی ستەمگەری بگرێت، یاخود لە رێگای پێداگرتن لەسەر رۆحانیەت لە ژینگەیەکەدا کە قەبەبوونێکی گەورەی ژیانی مادیی ئامادە بێت، وێنەیەکی مرۆڤ سەرووەر بکات گەورەتر لە بەرخۆر.[1]

---

١ - بڕوانە:
Mansfield, Harvey (2016). "Tocqueville on Religion and Liberty."
ل.٢٥٠

بەکورتی، تۆکفیل کە باس لە ڕۆڵی دین لە ژیانی کۆمەلایەتی و فەرهەنگیی کۆمەڵگای ئەمەریکیدا وەک کۆمەڵگایەکی مۆدێرن دەکات، بە شێوەیەکی تەواو جیاواز لە تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا"و لەعەلمانیەت خۆشی وەک ئایدیۆلۆژیا، قسە دەکات. تۆکفیل بە پێچەوانەی بەشێکی زۆر لە خوێندەوار و زانا و فەیلەسوفەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە دین وەک دوژمنی ئازادی نابینێت، وەک چۆن بە پێچەوانەی بەشێکی زۆری پیاوە دینییەکانی ئەو سەردەمەشەوە ئازادی بە دوژمنی دین نازانێت. بە بۆچوونی ئەم کۆمەڵناسە ئەو ئازادییە سیاسی و کۆمەلایەتییەی لە ئەمەریکادا لەئارادایە، دین ژێرخانە ئەخلاقی و ڕۆحییەکەیەتی. تۆکفیل تا ئەو شوێنە دەڕوات کە بڵێت بەبێ ئەم ژێرخانە ئەخلاقییە، دیموکراسیەتی ئەمەریکی ناتوانێت بژی. لەم ڕووەوە تۆکفیل باوەڕی وایە بەشداریی دین لە دروستکردنی دیموکراسیەتی ئەمەریکیدا کەمتر نییە لە بەشداریی سیستمی خوێندن و پەروەردەی مۆدێرن و لە بەشداریی سیستمی یاسا لەو وڵاتەدا. بەم مانایە تۆکفیل نەک دیموکراسیەت و دین وەک دوو دوژمنی سەرسەختی یەکتری وێنا ناکات، بەڵکو بە تەواوکاری یەکتریان دەزانێت.[1]

### دەرەنجام

تێزەی سەرەکیی بەعەلمانیبوونی دونیا باس لەوە دەکات کە دین ڕۆڵی لە ژیانی کۆمەلایەتیدا کەم دەبێتەوە و ئازادیی بیرکردنەوە و ئازادیی ویژدانیش تەواو ناکۆکن

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٠

بـە ئامادەگییەکـی بەهێـز و هەمەلایەنـەی دیـن لـە کۆمەڵگادا. ئەمـە جگـە لـەوەی ئـەم تێزە پێی وایـە بڵاوبونـەوەی زانسـت و مەعریفـەی مۆدێرن دەبێتـە هـۆکاری لاوازبوونی دین و ئەگەری نەمانیشـی زیـاد دەکات. ئـەوەی تۆکفیـل لـە ئەمەریکادا دەیبینێت، ڕێـک پێچەوانـەی پێدراوەکانـی ئـەم تێزەیـە و ئـەوەشـی تۆکفیـل دەینووسـێت گێڕانـەوەی حیکایەتـی گونجانـی ئـازادی و دینـە بەیەکـەوە لـە ئەزموونـی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگیـی کۆمەڵـگای ئەمەریکیـدا. لـەم بۆچوونانـەدا تۆکفیـل پێچەوانـەی سـەرجەمی ئـەو نووسـەر و زانـا و فەیلەسـوفانەی سـەدەی نۆزدەهـەم ئەدوێـت، کـە بـاس لـە ناکۆکیـی نێـوان ئـازادی و دیـن، پێشـکەوتن و دیـن، تازەبوونـەوە و دیـن، بڵاوبوونـەوەی فیکر و مەعریفـەی نـوێ و دیـن، دەکەن. تۆکفیل لـە ئەزموونـی ئەمەریـکادا پێکەوەگونجانـی دیـن و کۆمەڵگایەکـی مۆدێـرن و دیموکراسـی، بەیەکـەوە دەبینێت. تۆکفیـل تـا ئەو شـوێنە دەڕوات کـە دیـن و دیموکراسـیەت بـە شـێوەیەکی قـووڵ بەیەکـەوە گـرێ بـدات، چونکـە کۆمەڵـگای دیموکراسـی ئـەو کۆمەڵگایەیـە کـە لەقەب و پاشـخانی ئەرسـتۆکراتی و خێڵەکـی و ناوچەیـی لەنـاو دەبـات و ئینسـانەکان وەک هاوڵاتیـی یەکسـان مامەڵـە دەکات. ئـەم ڕۆحـی یەکسـانییەش دەشـێت هۆکارێـک بێـت بـۆ ئـەوەی ئینسـانی ئـەم کۆمەڵگایانـە ببن بـە بوونـەوەری ماتریالیـی ڕووت و بیـر لـە هیـچ شـتێکی تـر نەکەنـەوە جگـە لـە سـوود و قازانجـی تایبەتیـی خۆیـان، بـە بۆچوونـی تۆکفیـل دیـن دەشـێت ڕێگـر بێـت لەبـەردەم ئـەم پرۆسـەی بەماتریالیبـوون و بەئەنانیبوونـەی ئینسـان لـە کۆمەڵگا مۆدێرنەکانـدا. هـاوکات دیـن، بـە بۆچوونـی تۆکفیـل، دەشـێت یەکێـک بێـت لـەو ئامرازانـەی کـە بتوانێـت

بـە گـژ دیـاردەی تاکگەرایـی پەرگیـردا بچێتـەوە و سـنوورێک بـۆ ئـەو ڕۆحـی ئێرەیـی و خودپەرسـتییە دابنێت کـە دەشـێت لەگـەڵ پرۆسـەی بەتاکەکەسـبووندا بێتـە کایـەوە. تۆکفیـل ڕای وا بـوو دین ڕێگرە لـەوەی دونیـای مۆدێرن کورت ببێتـەوە بۆ بازاڕێکـی گـەورە و بـۆ گەڕانێکـی بـەردەوام و بێماندووبـوون بـەدوای پـارەدا. بۆیـە تۆکفیـل لەباتیـی ئـەوەی دیـن بکاتـە دەرەوەی "مەجالـی گشـتی" و ڕۆڵەکـەی کـورت بکاتـەوە بـۆ ئامادەبوونـی لە ژیانی شەخسیی تاکەکەسـەکاندا بەتەنها، باس لە گرنگیی بوونـی دین بە بەشـێک لە ژیانی گشـتیی نـاو کۆمەگا مۆدێرنـەکان دەکات، بـەڵام بـەو مەرجـەی ئـەم ڕۆڵـەی دیـن نەبێتـە هـۆی گۆڕانـی "مەجالـی گشـتی" بۆ "مەجالێکـی دینـی" و دەوڵـەت بـەزۆر ئـەم یان ئەو دین بەسـەر کۆمەڵگادا نەسـەپێنێت. ئـەوەی بـەلای منـەوە گرنگـە، مەسـەلەی ڕاسـتی و دروسـتیی ڕەهـای ئـەم دیدانـەی تۆکفیـل نییـە بـۆ شـوێن و جێـی دیـن و ڕۆڵـی لـە ژیانـی گشـتیی کۆمەڵگادا، ئـەوە نییـە ئایـا دیـن و ئـازادی بەیەکـەوە دەگونجێـن یـان نـا، بەڵکـو ئەوەیـە تۆکفیـل دیدێک بۆ ڕۆڵی دین لـە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا نیشـان ئەدات کـە تـەواو ناکۆکـە بـەو دیـدەی کـە تێـزەی "بەعەلمانیبوونـی دونیـا" پێشـنیاری دەکات. دیدێک پشتئەسـتوور بە ئەزموونێکی سیاسـی و دینیـی کۆنکریـت لـە کۆمەڵگای ئەمەریکیـدا کـە مۆدێرنتریـن کۆمەڵگای جیهانـە لـە سـەدەی نۆزدەهەمـدا. ئـەم دیدەی تۆکفیل، کە دوای شیکردنەوەیەکی کۆمەڵناسانەی وردی کۆمەڵگای ئەمەریکـی دروسـت دەبێـت، نیشـانی ئـەدات مـەرج نییـە دیـن و دیموکراسـیەت بەیەکـەوە نەگونجێـن، مـەرج نییـە لەدایکبوونـی زانسـت و مەعریفـەی نـوێ مانـای کەمکردنـەوەی

قورسایی دین بێت لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیدا، مەرج نییە دین و ئازادیی ویژدان نەتوانن بەیەکەوە بژین. تۆکفیل دیدێک پێشنیار دەکات کە دەکەوێتە دەرەوەی دۆگما تیۆرییەکانی تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا"وە.

ئەم بەشە لەسەر دید و ڕوانینەکانی تۆکفیل و بەشی پێشوو لەسەر دید و ڕوانینەکانی کیرکیگارد نیشانی داین کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا دید و ڕوانینی تر لەسەر پێگەی دین لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیدا ئامادە بووە، کە پێچەوانە یان ناکۆک بوون بەو شتانەی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا گریمانیان دەکات. بەڵام وەک وتم لەبەر هەیمەنەی تەواوی ئەم تێزە، ئەم دەنگانە: یان بەتەواوی نەبیستراوان، یان بوون بە ژێر زەخمی ئەو هەیمەنەیەوە. لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا باس لە ڕەخنەکردنی هەمەلایەنی ئەم تێزە دەکەین لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا.

# سەرچاوەکان

Mansfield, Harvey (2016). "Tocqueville on Religion and Liberty." American Political Thought, Spring.

Mayer, Jacob P. (1960). Alexis de Tocqueville: A Biographical Study in Political Science. Gloucester, Mass. : P. Smith.

Tocqueville, Alexis de (1990). Democracy in America. New York: Vintage.

Welch, Cheryl B (2006). The Cambridge Compnion to Tocqueville. Cambridge.

# دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (١)

## تالکۆت پارسۆنس و داڤید مارتین

# دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (١)
# تالکۆت پارسۆنس و داڤید مارتین

**سەرەتا**

وەک لە بەشەکانی پێشووتری ئەم نووسینەدا باسم کرد، لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە پارادایمی "بەعەلمانیبوونی دونیا" لەناو زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دەکەوێتە بەردەم شەپۆلێکی گەورەی ڕەخنەی هەمەلایەنەوە. هێماشمان بەوە کرد کە ڕەخنەکردنی ئەم پارادایمە بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ بە کتێبێکی کۆمەڵناسی بەریتانی: داڤید مارتن بە ناونیشانی *"دین و عەلمانیبوون: کۆمەڵێک لێکۆڵینەوە لەسەر بەعەلمانیبوون"*، دەست پێ دەکات، کە لە ساڵی ١٩٦٩دا دەینووسێت.[1] بەڵام بەر لەوەی بێینە سەر باسکردنی بۆچوونەکانی داڤید مارتن، بە پێویستی دەزانم باس لە کۆمەڵناسێکی گرنگی تری سەدەی بیستەم بکەم، کە تێگەیشتنی بۆ دین و باسکردنی لە ڕۆڵ و ئەرکەکانی دین لە دونیای مۆدێرندا دەخاتە دەرەوەی پارادایمی

---

١ - بڕوانە:
Martin, David (1969). The Religious and the Secular: Studies in Secularization. Schocken Books

بەعەلمانیبوونەوە، بە شێوەیەکیش لە شوێن و جێی دین لە دونیای هاوچەرخدا دەدوێت، کە جیاوازە لەوەی پارادایمی بەعەلمانیبوون پێشنیاری دەکات. مەبەستم لەو کۆمەڵناسە: تالکۆت پارسۆنسی (١٩٠٢-١٩٧٩) ئەمەریکییە. لە بواری کۆمەڵناسی و زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا تالکۆت پارسۆنس بە یەکێک لە پەیرەوکەرانی ڕێبازی "فەنکشنالیسم"، واتە وەزیفگەرایی، ناسراوە. وەک سەرەتاش با بە شێوەیەکی کورت هێڵە گشتییەکانی ئەم ڕێبازە بە خوێنەران نیشان بدەین.

## وەزیفەگەرایی چییە؟

وەزیفەگەرایی ئاراستەیەکی تایبەتی ناو زانستی کۆمەڵناسییە و کۆمەڵناسی ئەمەریکی: تالکۆت پارسۆنس یەکێک لە نوێنەرە سەرەکییەکانیەتی. بیرۆکەی سەرەکی لێرەدا ئەوەیە کە بەشە جیاوزەکانی کۆمەڵگا پشت بەیەکدی دەبەستن و کار لە یەکتری دەکەن. وەک چۆن دڵ لە لەشی مرۆڤدا وەزیفەکەی ئەوەیە خوێن بەسەر بەشەکانی تری لەشدا دابەش بکات و ژیان وەک گشتێک دەستەبەر بکات، ئاوا دەزگا و ڕەگەزە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگاش هەریەکەیان ئەرک و وەزیفەیەکی تایبەتیان هەیە و بەسەریەکەوە ئەو گشتە گەورە و هارمۆنی و هاوسەنگە دروست دەکەن کە ناوی کۆمەڵگا و ژیانی کۆمەڵایەتییە.[1] شێوازی سەرەکیی

---

١ - بڕوانە:
Abercrombie, Hill and Turner (1994). Dictionary of sociology. The Penguin. p. 176

کارکردنی کەسانی سەر بەم قوتابخانەیە تەماشاکردن و لێکدانەوەی کردە کۆمەڵایەتییەکانە لە ڕێگای سەیرکردنی ئەو دەرەنجامانەوە کە هەیانە بۆ کردە کۆمەڵایەتییەکانی تر، یان بۆ دەزگاکان، یان بۆ کۆمەڵگا وەک گشتێک. بە مانایەکی دیکە دەیانەوێت بزانن وەزیفەی هەر چالاکییەک لە کۆمەڵگادا چییە و ئەم وەزیفەیەش چ کاریگەری و دەرەنجامێکی بۆ چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی تر هەیە. واتە خاڵی سەرەکی لێرەدا دۆزینەوەی ئەرک و وەزیفەی ئەو چالاکییانەیە کە ڕوو دەدەن و دۆزینەوەی چۆنیەتیی دروستبوونی ئەو شتەیە کە ناوی کۆمەڵگایە. لە تێگەیشتنی کۆمەڵناسەکانی سەر بەم قوتابخانەیەدا ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیانەی کە ڕوو دەدەن دیاردەی بێمەبەست و بەتاڵ نین، بەڵکو وەزیفەی تایبەتیان لە کۆمەڵگدا هەیە و ڕۆڵێکی تایبەت پڕ دەکەنەوە، کە هەرە سەرەکییەکەیان بریتییە لە دروستکردنی هاوسەنگی و جێگیریی کۆمەڵایەتی. لەمەشدا جۆرێک لە هاوشێوەیی و لێکچوون گریمان دەکەن لەنێوان شێوازی کارکردنی ئۆرگانە بایۆلۆژییە زیندوەکان و شێوازی کارکردنی کۆمەڵگادا. واتە کۆمەڵگا وەک ئۆرگانێکی زیندووی پڕ پارچە و بەشی جیاواز دەبینن کە هەریەکەیان ئەرک و وەزیفەیەکی تایبەت پیادە دەکات و بەسەریەکیشەوە وا دەکەن کۆمەڵگا وەک گشتێکی گەورە دروست ببێت و بژی. لەم ڕوانینەدا دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تەنها نین، بەڵکو پەیوەندیی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیان بە یەکتریەوە هەیەو بەسەریەکەوە گشتێکی گەورەی هاوپەیوەندی دروست دەکەن کە لە فۆرمی "سیستم"دا دەر دەکەون. ئەگەر کۆمەڵگا بیەوێت وەک کۆمەڵگا بمێنێتەوە و

بەردەوام بێت و نەمرێت، ئەوا کۆمەڵێک پێداویستیی هەیە کە دەبێت دابین بکرێن، دەزگاکان و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان ئەرکیان ئەوەیە ئەو پێداویستییانە دابین بکەن.[1]

بە حوکمی ئەوەی ئەم قوتابخانەیە کۆمەڵگا وەک سیستمێکی گەورە وێنا دەکات، بۆیە پرسیاری سەرەکی لای ئەم شێوازە لە کۆمەڵناسی ئەوەیە: ئایا کۆمەڵگا و هێزە کۆمەڵایەتییەکان چۆن خۆیان بەرهەم دەهێننەوە و چۆن خۆیان تازە دەکەنەوە؟ "سیستم"ی کۆمەڵایەتی چۆن درێژە بە بوونی خۆی ئەدات و هاوسەنگییەکانی دەپارێزێت و خۆی بەرهەم دەهێنێتەوە؟ هۆکاری مانەوە و هۆکاری تازەبوونەوەی کۆمەڵگا و بکەرەکان لەم قوتابخانەیەدا دەبەسترێنەوە بەو وەزیفە و ئەرکانەوە کە هەر بکەر و چالاکییەک لە کۆمەڵگادا ئەنجامی ئەدەن. بەکورتی: شێوازی سەرەکیی کارکردنی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بریتییە لە گەڕان بەدوای ئەو وەزیفانەدا کە چالاکییەک لە چالاکییەکان ئەنجامی ئەدات و ڕۆڵی ئەو وەزیفەیەش لە مانەوە و ڕاگرتنی هاوسەنگیی ناوەکیی سیستمە کۆمەڵایەتییەکەدا. پێداگرتنی ئەم ڕێبازە تایبەتەی ناو زانستی کۆمەڵناسی لەسەر ئەرکی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان وەک ئەرکی دروستکردنی هاوسەنگی و هاریکاریی کۆمەڵایەتی، وای لە ڕەخنەگرانی ئەم ڕێبازە کردوە باس لەوە بکەن کە وەزیفەگەرایی ناتوانێت هۆکاری دروستبوونی ململانێ و کێشە و پێکدادان و جەنگەکانی ناو کۆمەڵگاکانی بۆ لێک بداتەوە. هەروەها ناتوانێت پێمان بڵێت گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەکوێوە دێت.[2]

---

١ -هەمان سەرچاوی پێشوو ل ١٧٦.

٢ -هەمان سەرچاوی پێشوو ل ١٧٧.

**تالکۆت پارسۆنس و وازهێنان لە پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا**

لە پەیوەندیدا بە دینەوە وەک دیاردەیەکی کۆمەلایەتی، پرسیاری تالکۆت پارسۆنس ئەوە نییە ئایا دین لاواز بووە یان لاواز نەبووە، یاخود ئایا دین بەرەو ئەوە دە چێت لاواز ببێت یان نا؟ بەڵکو ئەوەیە ئایا دین کام وەزیفە و چ ئەرکێک لە دونیای مۆدێرندا ئەنجام ئەدات؟ ئایا ڕۆڵی هەیە لە پاراستنی هاوسەنگی و هاریکاریی کۆمەلایەتیدا یان نا؟ پارسۆنس شارەزاییەکی گەورەی لە کۆمەڵناسیی دورکهامیدا هەبوو، هەروەها بەتوندی لەژێر کاریگەریی لێکدانەوەکانی دورکهایمدا بوو بۆ مەسەلەی هاریکاریی کۆمەلایەتی، چ لە فۆرمە میکانیکیەکانیدا لە کۆمەڵە بچووکەکانی بەر لە لەدایکبوونی دونیای مۆدێرندا، چ لە فۆرمە ئۆرگانییەکانیدا لەناو دونیای مۆدێرندا. ڕوانینی پارسۆنس بۆ دین لەم دیدگا دورکهایمییەوە سەرچاوە دەگرێت. بە مانایەکی دیکە پارسۆنس لەباتیی قبووڵکردنی تێزەی بەعەلمانیبوونی حەتمییانەی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان و لەوێشەوە بەرگریکردن لە گریمانەی ئەوەی کە دین بەرەو لاوازبوون دەڕوات، سەیری ئەوە دەکات ئایا دین چ وەزیفەیەک لە کۆمەڵگا مۆدێرنانەدا ئەنجام ئەدات؟ هەر لەم پرسیارە تایبەتەوە پارسۆنس واز لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەهێنێت کە پێ لەسەر لاوازبوونی بەردەوامی دین لە دونیای مۆدێرندا دادەگرێت و ڕۆڵەکەشی کورت دەکاتەوە بۆ ئەوەی پەیوەستە بە ژیانی تاکەکەسیی ئینسانەکانەوە. پارسۆنس پێی وایە دین لە کۆمەڵگادا، بە کۆمەڵگا مۆدێرنەکانیشەوە،

وەزیفەیەکی گرنگی هەیە کە بریتییە لە بەخشینی "بنەمایەکی ئاسمانی بە بەها سەرەکی و بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگا". واتە بەخشینی چوارچێوەیەکی گشتیی گەورە و یەکگرتوو بەو نۆرم و بەهایانەی لە کۆمەڵگادا وەک نۆرم بەهای سەرەکی دەبینرێن.[1] پارسۆنس لە شیکردنەوەیدا بۆ مەسەلەی پلورالیزم و سیستمی بەهاکان و تاکگەرایی لە کۆمەڵگای ئەمەریکیدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە هەردوو دیاردەکە ژێرخانێکی دینیی پرۆتستانییان هەیە و ئەوەی لە ئەمەریکادا دەیبینین لاوازبوونی دین نییە، بەڵکو بەدەزگاییبوونی دینی و فەرهەنگیی پرۆتستانیزمە.[2] بە بۆچوونی پارسۆنس هەموو بەهاکانی ناو کۆمەڵگا و هەموو نرخە کۆمەلایەتییەکان و هەموو فەرمایشتە ئەخلاقییەکان، لە دوالێکدانەوەدا، ڕەگوڕیشەکانیان لەناو دیندایە. بە باوەڕی ئەم کۆمەڵناسە دین لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، بێگومان مەبەستی ئەو: مەسیحیەتە لە کۆمەڵگای ئەمەریکیدا، نەک لاواز نەبووە، بەڵکو قورسایی و گرنگییە کۆمەلایەتییەکەی زیادی کردوە. لەم ڕووەوە پارسۆنس ئەو دیدە ڤێبەرییە بە ڕاست نازانێت کە باس لە لاوازبوونی ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەکات، لە ڕێگای پرۆسەی "داماڵینی سیحر لە دونیا"وە. هەر

---

١ - بڕوانە:

Vanderstraeten, Raf (2012). Talcott Parsons and the enigma of secularization. European Journal of Social Theory 16(1). p 70.

٢ - بڕوانە:

Turner, BYAN S. (2005). Talcott Parsons's Sociology of Religion and the Expressive Revolution: The Problem of Western Individualism. Journal of Classical Sociology. Vol 5(3). P 304.

لێرەدا دەبێت هێما بۆ ئەو ڕاستییە بکەین کە پارسۆنس شارەزاییەکی زۆر قووڵ و وردی لە نووسینەکانی ماکس ڤێبەردا هەبوو، ئەو خۆی وەرگێڕی کتێبەکانی ماکس ڤێبەرە لە ئەڵمانییەوە بۆ ئینگلیزی و ئەو ئەم کۆمەڵناسە ئەڵمانییە بە دونیای ئینگلیزییزمان دەناسێنێت. هاوکات یەکێک لەو کەسانە بوو کە نووسینێکی زۆری لەسەر کارەکانی ڤێبەر و دۆرکهایم بە زمانی ئینگلزی نووسیوە.[1]

پارسۆنس نکوڵی لەوە ناکات کە دین کۆمەڵێک وەزیفەی زۆر و گرنگی لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا لەدەست داوە، لەوانە ڕۆڵی دین لە سیستمی خوێندن و فێربووندا، ڕۆڵی لە سیستمی یاسا و تەنانەت لە سیستمی سیاسییشدا، بەڵام هەموو ئەمانە لە قازانجی دیندا بوون نەک زیانیان لێ دابێت. چونکە ئەمانە دەستی دین ئازاد دەکەن بۆ هەستان بەو وەزیفە سەرەکییەی دین، کە بریتییە لە "ئەرکی خۆخەریکردن بە کێشەی ماناوە لە ژیانی ئینساندا و ئەرکی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە سەرەکییانەی کە بوونی ئینسانی دەیانخاتەوە، لەوانەش پرسیار دەربارەی مانا عەقڵانی و مەعریفییەکانی بوون، ماناکانی بەختەوەری و بەدبەختی، مەسەلەی چاکەکاری و خراپەکاری، تا بە مەسەلەی مردن ئەگات". بە بۆچوونی پارسۆنس ئەرکی دین لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا ئەوەیە خۆی بەو مەسەلە سەرەکییانەوە سەرقاڵ بکات. باوەڕیشی وایە تا ئەم ساتە هیچ سیستمێکی کۆمەڵایەتی دروست نەبووە بتوانێت هەموو چاوەڕوانییە

---

١ - بڕوانە: هەمان سەرچاوە:

Vanderstraeten, Raf (2012). Talcott Parsons and the enigma.....

ڕەواکانی ئینسان پڕ بکاتەوە، بۆیە دین دەتوانێت پارێزگاری لە مانەوەی خۆی بکات و ئەرکە سەرەکییەکانی خۆی پیادە بکات. نەک هەر ئەوە، پارسۆنس باوەڕی وایە کە لیبرالیزمی ئەمەریکی پەیوەندییەکی قووڵ و پتەوی بە دیدی تاکگەرانەی ئایینی پرۆتستانیزمەوە هەیە و بەم مانایە کاریگەریی پرۆتستانیزم لەسەر دروستبوونی سیستمی پلورالیستی دینی و فەرهەنگی لە ئەمەریکادا و کاریگەریی لەسەر دروستبوونی سیستمی بەها لیبرالەکان لەو وڵاتەدا، کاریگەرییەکی گەورەیە. بە باوەڕی پارسۆنس پرۆتستانیزم یەکێکە لە دەرکەوت و ڕەهەندە سەرەکییەکانی پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵگای ئەمەریکی.[1] جگە لەمە پارسۆنس باوەڕی وایە کە ئاکار و هەڵسوکەوتی ئینسان بە شێوەیەکی گشتیی هەم بنەمایەکی عەقڵانی و هەم بنەمایەکی ناعەقڵانیی هەیە، دین یەکێکە لە بنەما ناعەقڵانییە سەرەکییەکانی هەڵسوکەوت و ئاکاری ئینسانی. بۆیە وەک بەشێک لە پاڵنەر و هۆکارەکانی دروستبوونی کردەی مێژوویی هەر دەمێنێتەوە. "ناعەقڵانیەت" لێرەدا بە مانای بێعەقڵی و خورافەت و سیحر نایەت، بەڵکو بە مانای ئەو هۆکار و پاڵنەرانە دێت کە عەقڵ سەرچاوەکەیان نییە و لە عەقڵەوە نایەنە دەر، بەڵکو لە باوەڕ و عەقیدە و هەست و سۆزەوە دێن. بەکورتی، پارسۆنس باوەڕ و عەقیدە وەک یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی کردە و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی دەبینێت و نمایشیان دەکات. وەک دەبینین پارسۆنس لە دەرەوەی تێزەی لاوازبوون و

---

١ -هەمان سەرچاوە:

BRYAN S. (2005). Talcott Parsons's Sociology of Religion

پووکانەوەی ڕۆڵی دین لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی ئینسانیدا قسە دەکات و بەمەش شێوازی بیرکردنەوەی لە ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا دەخاتە دەرەوەی گریمانەکانی پارادایمی بەعەلمانیبوونەوە.[1] لەم دیدەدا مەرج نییە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی یەکسان بێت بە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیاوە، واتە مەرج نییە بۆ ئەوەی کۆمەڵگا و سیستمێکی سیاسیی مۆدێرن دروست ببێت، دین ڕۆڵی لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا نەمێنێت و پاشەکشە بکات بۆ ناو سنوورەکانی ژیانی تایبەتی تاکەکەسەکان. لە دیدی پارسۆنسدا دین دەتوانێت ڕەهەندێک، یان دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی تازەبوونەوەی کۆمەڵگا بێت، بەشێک بێت لە پرۆسەی مۆدێرنە خۆی. ئەوەی گرنگە لێرەدا هێمایەکی خێرای پێ بکەم، ڕاستی و دروستیی بۆچوونەکانی تالکۆت پارسۆنس نییە وەک کۆمەڵناسێک، بەڵکو گومانکردن و وازهێنانیەتی لە پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا بۆ قسەکردن لەسەر کۆمەڵگا تازەکان و بۆ خوێندنەوەی ڕۆڵی دین لەو کۆمەڵگایانەدا. ئەگەرچی پارسۆنس واز لە پارادیمی بەعەلمانیبوونی دونیا دەهێنێت بۆ شیکردنەوەی ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگای مۆدێرندا، بەڵام خۆی بە ڕەخنەکردن و پەلاماردانی پارادایمی بەعەلمانیبوونەوە سەرقاڵ ناکات، ئەوەی ئەم کارە ئەنجام ئەدات کۆمەڵناسی بەریتانی: داڤید مارتینە و هێرش بۆ سەر ئەم پارادایمە لە نووسینەکانی ئەم کۆمەڵناسە بەریتانییەوە دەست پێ دەکات.

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**با بزانین داڤید مارتین چی لەسەر تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەڵێت**

داڤید مارتین و ڕەخنەکردنی پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا بەر لە هەموو شتێک، داڤید مارتین، تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" وەک تێزەیەکی ئایدیۆلۆژی وێنا دەکات، نەک وەک وەسفێکی زانستی و بابەتییانەی چۆنیەتیی دروستبوون و لەدایکبوونی دونیای مۆدێرن.[1] بە بۆچوونی ئەو ئەرکی سەرەکیی ئەم تێزەیە وەسفکردنێکی بێلایەن و بابەتییانەی دونیای تازە نییە، بەڵکو بەگژاچوونەوەی ئایدیۆلۆژیا دینییەکان و بەگژاچوونەوەی ڕۆڵ و ئامادەگیی دینە لەو دونیایەدا.[2] هەر لە بنەڕەتیشەوە دینی و عەلمانی دوو چەمکی دژبەیەک نین، ئەمیان لەسەر لەناوبردن و لاوازکردنی ئەوی تریان بژی، بەڵکو بەناویەکدا چوون و کاریگەرییان لەسەر یەکتری هەیە. وەک چۆن موقەدەس شتێکی سادە و یەکلایەنە نییە و پڕیەتی لە ناکۆکی و پارادۆکس، ئاواش عەلمانی دەستەواژەیەکی سادەی یەکمانا نییە و پڕیەتی لە ناکۆکی و پارادۆکس. لەم ڕووەوە داڤید مارتن پێی وایە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا بە ڕادەیەک هەڵە و ناڕاست و دۆگمایی و ئادیۆلۆژییە، کە پێویستە فڕێ بدرێتە دەرەوەی فەرهەنگی زانستی کۆمەڵناسییەوە. لە دیدی ئەودا ئەم تێزە نەک یارمەتیمان نادات بتوانین لە دیاردەکانی دونیای مۆدێرن تێبگەین، بەڵکو وەک ڕێگرێکی مەعریفی کار دەکات و ناهێڵێت چڕی و ئاڵۆزییەکانی

١ - بڕوانە:
Martin, David (1969). The Religious and the Secular: Studies in Secularization. Schocken Books. p. 15-16

٢ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩.

نـاو ڕەوتـە مێژووییـە ئاڵۆزەکانـی دونیـای مۆدێـرن ببینیـن. داڤید مارتین سێ ڕەخنەی سەرەکی لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەگرێت.[1]

یەکەمیـان ئەوەیـە ئـەم تێزەیـە وێنەیەکـی پڕ موبالەغـەی دەسـەڵاتی دیـن و بەرفراوانیـی دیاردەی دینـداری لـە کۆمەڵـگا سـوننەتییەکانی بـەر لـە لەدایکبوونـی مۆدێرنـەدا گریمـان دەکات. وای نیشـان ئـەدات کـە دیـن سـەرەتا و کۆتاییـی ژیانـی تاکەکەسـی و ژیانی دەسـتەجەمعیی مرۆڤ و کۆمەڵگاکانی بـەر لـە دونیای مۆدێرنـە و کەسـانی نـاو ئـەو کۆمەڵـگا سـوننەتییانە "بەڕاسـتیی" دینـدار بوون. بـە بۆچوونـی ئـەم کۆمەڵناسـە نیشـاندانی کۆمەڵـگا سـوننەتییەکان وەک کۆمەڵـگای دینـی، یـان وەک کۆمەڵگایـەک دیـن لـە هەمـوو ڕەهەندەکانـی ژیانـی کۆمەڵایەتیـدا ئامـادە بێت و نیشـاندانی مرۆڤی ئـەو کۆمەڵگایانـە وەک مرۆڤێکـی دینـدار، گریمانەیەکـی ناڕاسـتە کـە داتـا و زانیـاری و پێـدراوە مێژووییەکانـی کۆمەڵـگا سـوننەتییەکان نایسـەلمێنێت. ئەو گریمانەیـەی کـە دەڵێـت دیـن هەمـوو ژیانـی بـەر لـە دونیـای مۆدێرنـی داگیرکـر دووە، گریمانەیەکـی نەسـەلمێندراوە و پشـتی بـە لێکۆڵینـەوەی زانسـتیی کۆمەڵـگا سـوننەتییەکان نەبەسـتوە. واتە هیـچ لێکۆڵینەوەیەکـی ورد لەبەردەسـتدا نییـە بتوانێـت بـە شـێوەیەکی زانسـتی بیسـەلمێنێت کـە کۆمەڵگاکانـی بـەر لـە مۆدێرنـە کۆمەڵـگای دینیتـر و مرۆڤەکانیشـی ئیماندارتـر بن لـە کۆمەڵـگا و مرۆڤەکانـی ئەمڕۆ یـان هـەر کاتێکـی دیکە، ئەوەی هەیە تەنهـا گریمانەیەکە و بەس. ڕەخنـەی دووهەمـی داڤیـد مارتیـن لـە تێـزەی بەعەلمانیبوونـی

---

[1] -هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دونیا، بریتییە لە کێشانی وێنەیەکی پڕ موبالەغە بۆ نادینیبوونی ئینسان و کۆمەڵگا مۆدێرنەکان. لەم ڕووەوە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا موبالەغەیەکی هێجگار گەورە دەکات کاتێک پێ لەسەر لاوازبوونی شوێن و جێ و ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا، دادەگرێت. ئەم کۆمەڵناسە باوەڕی وایە کە مرۆڤی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان بەو ڕادەیە عەقڵانی و نادینی نییە کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا گریمانی دەکات، لەم کۆمەڵگایانەدا بەردەوامییەکی گەورەی دید و بۆچوونە ناعەقڵانی و سیحری و خورافییەکانی کۆمەڵگاکانی بەر لە مۆدێرنە لەئارادایە و ئەوە ڕاست نییە کە ئینسانی ئەم کۆمەڵگایانە ئینسانی عەقڵانی و نادینین. بە بۆچوونی داڤید مارتین کۆمەڵگا هاوچەرخەکان، وەک کۆمەڵگا تەقلیدییەکان، پڕن لە بیرکردنەوەی خورافی و میتافیزیکی. ڕەخنەی سێهەم پەیوەستە بە دەسەڵاتی سیاسیی دینەوە، داڤید مارتین پێی وایە دەسەڵاتی سیاسیی دین لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا بە بڕ و بە شێوەی جیاواز ئامادەیە و پێوەرێکی یەککگرتوو و هاوشێوە نادۆزینەوە پێمان بڵێت دین چ دەسەڵاتێکی لە دونیای مۆدێرندا دەبێت. بۆ نموونە دەسەڵاتی سیاسیی دین لە ئەمەریکادا و لەپاڵ پلورالیزمی دینیدا، جیاوازە لە دەسەڵاتی سیاسیی دین لە ئیرلەندای باکووردا، کە ناکۆکیی نێوان کاتۆلیکەکان و پرۆتستانەکان لەوپەڕیدایە، هەروەها ئەم دەسەڵاتە لە ئەمەریکادا جیاوازە لەو دەسەڵاتە گەورەیەی کاتۆلیکیەت لە ئیتالیادا هەیەتی، تا ئەو ڕادەیەی دەکرێت بگوترێت کە کایەی کولتوور لە

ئیتالیـادا لەلایـەن کاتۆلیکیەتـەوە مۆنۆپۆڵ کراوە. جگە لەمانـە لـە هەمـوو ئـەو شـوێنانەدا کـە دیـن بەشـێکە لـە ناکۆکییـە سیاسـی و کولتوورییـەکان و پەیوەندیی بـە شوناسـەوە هەیـە، وەک لـە ئیرلەنـدا و پۆڵەنـدادا، دەسـەڵاتی سیاسـیی دیـن دەسـەڵاتێکی بەهێـزە و بـە هیـچ مانایـەک ئـەم دەسـەڵاتە لاوەکـی و لاواز نەبـووە.

بەکورتی؛ داڤید مارتین دەڵێت گەر پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا لە کۆمەڵگاکانیشدا هەبێت، ئەوا هەرگیز پرۆسەیەکی یەکشێوە و لێکچوو نەبووە و نییە و بەردەوامیش نەبۆتە هۆی لاوازکردنی دەسەڵاتی دین. بە مانایەکی تر، پرۆسەی بەعەلمانیبوون پرۆسەیەکی گەردوونیی نییە و بەشێکی حەتمیش نییە لە هەموو پرۆسەیەکی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی. پرۆسەی بەعەلمانیبوون لە هەر شوێنێکدا هەبێت، دەچێتە پەیوەندییەکی تایبەت بە پێدراوەکانی ئەو ڕەوتە سیاسی و کولتووری و ڕەمزییەوە کە لەو شوێنەدا ئامادەیە. واتە مێژووی نەتەوەیی و ڕەوتی ناوچەی و کەلەپوری تایبەت مانای تایبەت و دەرکەوتی تایبەت بە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەبەخشن. نەک ئەوەی ئەم پرۆسەیە یاسایەکی گەردوونی بێت و وەک لۆژیکی ناوەکیی پرۆسەی تازەبوونەوە ئامادە و دەستبەکار بێت. هەموو ئەم خاڵانە وا دەکات داڤید مارتین باوەڕی بەوە نەمێنێت کە چەمکی عەلمانیەت، یان تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا، چەمکێک بێت بەکەڵکی لێکۆڵینەوەی زانستیی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆکە بێت و بتوانێت شتێکی ڕاستمان لەسەر ئەم کۆمەڵگایانە و تەنانەت لەسەر کۆمەڵگا تەقلیدییەکانیش پێ بڵێت. لەڕاستیدا

داڤید مارتین تا ئەو شوێنە دەڕوات کە تێزەی بەعەلمانییبوونی دونیا تەواو پێچەوانە بکاتەوە و بڵێت: دین، لەم دۆخەدا مەسیحیەت، هەرگیز لە ڕابردوودا ئەو هێزەی نەبووە وەک ئەوەی ئەمڕۆ لە دونیای هاوچەرخدا هەیەتی، بە بۆچوونی ئەم کۆمەڵناسە هێزی مەسیحیەت لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا هێزێکی گەورەترە لەوەی لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا هەیبووە.[1] دە ساڵ دوای نووسینی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە، داڤید مارتین لە کتێبێکی نوێدا بە ناوی: "*تیورەیەکی گشتی دەربارەی بەعەلمانییبوونی دونیا*"، هەوڵ ئەدات مۆدێلی جیاواز بۆ پرۆسەی بەعەلمانییبوونی دونیا بدۆزێتەوە. ئەم مۆدێلانە دەشێت هەندێک خاڵی هاوبەش لە پرۆسەی بەعەلمانییبوونی دونیادا لەنێوان کۆمەڵگا جیاوازەکاندا، نیشان بدەن، بەڵام هەرگیز ناتوانین قسە لە بوونی یەک مۆدێل بۆ پرۆسەی بەعەلمانییبوونی دونیا بکەین.[2] کە باس لە بڕ و ڕادەی بەعەلمانییبوون لە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکاندا دەکات؛ سێ پێوەر لە یەکتری جیا دەکاتەوە. یەکەمیان ئەوەیە: ئایا دینی باڵادەست کاتۆلیکە یان نا؟ دووهەم: ئایا دین لەو وڵاتەدا مۆنۆپۆڵ کراوە یان نا؟ سێیهەمیش: ئایا لەو کۆمەڵگایەدا ململانێیەک هەیە لەگەڵ هێزێکی چەوسێنەری دەرەکی، یان ناوەکیدا؟[3]

ئەمەش مانای ئەوەی کە مۆدێلی جیاواز بۆ ڕێکخستنی

1 - Martin, David (1967). *A Sociology of English Religion. New York: Basic Books*,

2 - Martin, David (1978). A general theory of secularization. Gregg Revivals

٣ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٧.

پەیوەندیی نێوان دین و دەوڵەت، دین و سیاسەت، دین و ژیانی گشتی هەیە. بۆ نموونە لەسەر بنەمای بوون یان نەبوونی پلورالیزمی دینیی داڤید مارتین باس لە "مۆدێلی لاتینی"، یان "مۆدێلی ئۆرگانی"ی بەعەلمانیبوونی دونیا دەکات. لە دیدی ئەم کۆمەڵناسەدا ئەم مۆدێلە لەو وڵاتانەدا دروست دەبێت کە کاتۆلیکیەت شێوە دینی باڵادەستە و لە دۆخی مۆنۆپۆڵیکردنێکی تەواوی هەموو کایەی دینیدایە، بۆ نموونە لە وڵاتانی وەک ئیتالیا، ئیسپانیا، پورتگال و فەرەنسادا. لەم مۆدێلەدا هەم سیاسەتی دژایەتیکردنی دین و هەم عەقلیەت و سایکۆلۆژیای بەگژاچوونەوەی دین زۆر زاڵە، هەم ڕێگری زۆر گەورەش لەبەردەم پرۆسەی بەسیاسیکردنی دین و دروستبوونی هێزی سیاسی دینیدا، دروستدەکرێت. هۆکەشی ئەوەیە دین بەر لە پرۆسەی بەعەلمانیبوون هێجگار بەهێز بووەوە و دەستی لەناو زۆر ڕەهەندی ژیانی کۆمڵایەتیدا بووە. هاوکات لەم مۆدێلەدا دینێک لەئارادا بووە کە دەسەڵاتی سیاسیی بەزۆر سەپاندویەتی یان ویستوویەتی بیسەپێنێت بەسەر کۆمەڵگادا و دین و دەسەڵات بەتوندی بەیەکەوە گرێدراو بوون. ئەمە وای کردوە دین ببێت بە یەکێک لە لایەنە سەرەکییەکانی ململانێی کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئەمەش وای کردوە داواکردنی جیاکردنەوەی دین و سیاسەت، یان دەرکردنی دین بۆ دەرەوەی کایەی سیاسەت، یان ڕێگرتن لە دین بۆ پیادەکردنی ڕۆڵی ئاشکرا و بەهێز لە ژیانی گشتیدا، دێتە کایەوە. لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا و لە کردەی بەگژاچوونەوەی دیندا بە شێوەیەکی فراوان باوەش بۆ ئایدۆلۆژییە عەلمانییەکانی وەک کۆمۆنیزم و ئەنارشیزم دەکرێتەوە، هاوکات ڕووبەری

گەورەش بۆ ئەو مەیلە سیاسییانە دروست دەبێت کە دژ بە پرۆسەی بەدیموکراسیکردن و پلورالیزمی ڕاستەقینەن. بەڵام لە هەندێک شوێندا ئەم باوەشکردنەوە گەورەیە بۆ ئایدۆلۆژیا عەلمانییەکان لەسەر حیسابی چەپاندن و دوورخستنەوەی دین لە ژیانی گشتی، نابێتە هۆی لەناوچوونی دین، بەڵکو وا دەکات دین بە شێوەیەکی بەهێز لەناو کۆمەڵگادا ئامادە بێت و بکەوێتە ململانێکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە، داڤید مارتین لێرەدا نموونەی پۆڵەندا و ڕوسیا دەهێنێتەوە. مۆدێلێکی تر کە داڤید مارتین باسی دەکات "مۆدێلی پلورالیزم و نیمچەپلورالیزم"ە. بە بۆچوونی ئەم کۆمەڵناسە ئەم مۆدێلە لەو وڵاتانەدا دادەمەزرێت کە پرۆتستانیەت شێوازی باڵادەستی دینە تیایاندا، بۆ نموونە بەریتانیا، ئوسترالیا، کەنەدا، نیوزلەندا. لەم وڵاتانەدا ئەو دژایەتیکردنەی دین و دژایەتیکردنی هێزی ڕێکخراوی دینیی لە ئارادا نییە وەک لە وڵاتە کاتۆلیکییەکاندا هەیە. لە ڕاستیدا لەم وڵاتانەدا نەک تەنها دژایەتیی سیاسیی دین نەکراوە، بەڵکو دژایەتیی کۆمەڵایەتیشی نەکراوە و کۆمەڵگاکانیش مەیلی گەشەکردن و هەنگاونان بەرەو پیادەکردنی سیستمی تۆتالیتاریان تیادا دروست نەبووە. بە بۆچوونی ئەم کۆمەڵناسە لە کولتووری ئەم جۆرە وڵاتانەدا ئەو ڕۆحیەتی دژایەتیکردنەی دین، کە لە مۆدێلی یەکەمدا هەبوو، بوونی نییە یان لاوازە. بە شێوەیەکی گشتییش گروپە دینییە جیاوازەکان ئامێزانی ناو ئەو چوارچێوە نەتەوەیی و نیشتیمانییە گەورانە کراون کە پرۆسەی دروستکردنی نەتەوە دەیانهێنێتە پێشەوە. لەم ئەزموونانەدا سەرەڕای ئەوەی کە دەشێت

پەیوەندیی لەنێوان دینێکی تایبەت و دەوڵەتدا هەبێت، بەڵام بە هۆی ئەو ڕۆحە پلوراڵەی کە لەم کۆمەڵگایانەدا ئامادەیە، سیستمی دیموکراسی توانیویەتی دروست و پایەدار ببێت. بەکورتی داڤید مارتین لەسەر بنەمای جیاکردنەوەی کۆمەڵێک مۆدێلی جیاوازی ئامادەگیی دین لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا و شێوازی جیاوازی پرۆسەی بەعەلمانیبووندا، دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە شێوازی ئامادەبون و ئەرک و ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگادا و چۆنیەتیی مامەڵەکردنی کۆمەڵایەتی و سیاسیی دین، لە ئەزموونێکەوە بۆ ئەزموونێکی تر دەگۆڕێت. بۆ نموونە ئەوەی لە ئەمەریکادا هەیە جیاوازە لەوەی لە فەرەنسادا هەیە و ئەوەی لە پۆڵەندا و ئیرلەندادا هەیە جیاوازە لەوەی لە هۆڵەندادا ئامادەیە. لە وڵاتێکدا یەک دین هەبێت و سەپێندرابێت بەسەر کۆمەڵگادا دۆخێک دروست دەبێت جیاوازە لەوەی لە وڵاتێکدا دوو دین هەبێت، ئەمەشیان جیاواز دەبێت لەوەی لە وڵاتێکدا زیاد لە دوو دین بوونی هەبێت. هەموو ئەم جیاوازییانە وا دەکەن شوێن و جێی دین لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا جیاواز بێت و نەکرێت لە ڕێگای تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا"وە هەموویان بە یەک شێوە ڕاڤە بکرێن و لێک بدرێنەوە.

خاڵێکی تر کە داڤید مارتین باسی دەکات، مەسەلەی پەیوەندیی نێوان و دین و ناسیۆنالیزمە، ئەگەرچی ئەم خاڵە بە شێوەیەکی سیستامتیک لە کتێبەکەیدا شی ناکاتەوە، بەڵام هەندێک بۆچوونی گرنگ نیشان ئەدات. بە بۆچوونی ئەم نووسەرە لەکوێدا "ئەفسانە نەتەوەییەکان" پەیوەندییەکی پتەو و ڕاستەوخۆیان بە دینەوە

هەبێت، یان ئەفسانە نەتەوەییەکان خۆیان ئەفسانەی دینی بن، لەو شوێنانەدا مانەوەی دین وەک بەشێکی گرنگ لە شوناس و سیاسەتی نەتەوەیی بەهێز دەبێت. بەڵام لە کوێدا ناکۆکی دروست بوو لەنێوان حیکایەتەکانی نەتەوە و حیکایەتەکانی دیندا، لە کوێدا نەتەوە دینێک لە دینەکانی بە ڕێگر لەبەردەم گەشەی نەتەوەییی خۆیدا بینی، لەوێدا جۆرێکی جیاواز لە شوێن و جێی دین لەناو کۆمەڵگا و پرۆسەی تازەبوونەوەدا دروست دەبێت. لە دۆخی دووهەمدا دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتیی دین لاوازتر دەبێت لەوەی لە دۆخی یەکەمدا دەشێت دروست ببێت. بۆ نموونە لە شوێنێکی وەک سکۆتلەنداد‌ا شوناسی نەتەوەی و شوناسی دینی بە شێوەیەکی قووڵ و ڕاستەوخۆ بەناو یەکدا چوون، لە ڕوسیادا مەسیحیەتی ئەرتۆدەکسی بەشێکی گەورەی شوناسی نەتەوەییی ڕوسیایە و تا ئەمڕۆش ڕوسیبوون بەزەحمەت لە ئەرتۆدۆکسیبوون جیا دەکرێتەوە. لە هەموو ئەو شوێنانەشدا کە دین بەشێک بووە لە خەباتی نەتەوەیی دژ بە هێزێکی دەرەکی، ڕۆڵی دین لە دروستبوونی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەیدا هێجگار بەهێز بووە، بۆ نموونە ڕۆڵی دین لە دروستبوونی یۆنان و قوبرس و پۆڵەندا و بەلجیکا و ئیرلەندا و کرواتیای تازەدا.

بە مانایەکی تر ئەوەی داڤید مارتین دەیەوێت بیڵێت؛ نیشاندانی پەیوەندییەکی دیالێکتیکی و دینامیکتر و کراوەتر و ئاڵۆزترە لەنێوان دینی و عەلمانی و موقەدەس و ناموقەدەسدا، لەوەی کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا پێشنیاری دەکات. دەشێت یەکێک لە دەرەنجامەکانی ئەم پەیوەندییانە دەرکردنەدەرەوەی دین

بێت لە کایەی سیاسەت و لە بەشێکی زۆری ژیانی گشتید بەڵام مەرج نییە ئەمە یاسایەکی حەتمی بێت، یان لۆژیکی ناوەکیی هەموو تازەبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بێت. خاڵێک کە داڤید مارتین لەم کتێبەدا بۆ نیشاندانی شوێنی دین لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا بە گرنگی دەزانێت، سروشتی ئەو شۆڕشە کۆمەڵایەتی و سیاسییانەیە کە لەو کۆمەڵگایانەد ڕوو دەدەن. بۆ نموونە شۆڕشی ئەمەریکی شۆڕشە دژ ب داگیرکەرێکی دەرەکی، کە ئینگلتەرەیە، بۆیە شۆڕشێکە ڕووی لە یەکگرتنی کۆمەڵگایە دژ بەو دوژمنە دەرەکییە. هەروەه شۆڕشی هۆڵەندی شۆڕشێکی درێژ بوو دژ بە دەسەڵاتدارانی ئیسپانیا. لە هەردوو دۆخەکەدا هەلومەرجێک دروست دەبێت وا دەکات هێزە دینی و نادینییە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگای ئەمەریکی و هۆڵەندی، بۆ بەرەنگاربوونی ئەو دوژمنە دەرەکییە، لە یەکتری نزیک ببنەوە. داڤید مارتین دەڵێت لەم جۆرە ئەزموونانەدا ڕۆڵی دژایەتیکردنی دین و ڕۆحی دژایەتیکردنی ئەم هێزی دینی بۆ ئەوی تریان لاوازە ئەمەیان ئەو مۆدێلە پلورالیزمەیە کە باسی دەکات. بەڵام لە شۆڕشی فەرەنسیدا، کە شۆڕشێک نییە دژ بە دوژمنێکی دەرەکی، بەڵکو شەڕی بەشێکی کۆمەڵگای فەرەنسییە دژ ب بەشێکی تر، دۆخەکە تەواو جیاوازە. ئەم جیاوازییە وا دەکات دژایەتیکردنی ناوەکیی لەم شۆڕشەدا بەهێز ببێت و شەڕ دژ بە دین‌و دەسەڵاتی دینیی بەشێکی گرنگی ئەو جەنگ ناوەکییە بێت کە دروست دەبێت. لە ئەزموونی فەرەنسید چونکە دین ڕاستەوخۆ گرێ دراوە بە یەکێک لە گەمەکەر

سیاسییە گەورەکان و بە یەکێک لە پرۆژە سیاسییەکانی ناو ململانێکەوە، دەبینین دۆخێکی دژەدینیی قووڵ و فرەلایەن دروست دەبێت. [1]

**دەرەنجام**

لەم بەشەدا زۆر بەکورتی لەسەر دید و ڕوانینەکانی دوو کۆمەڵناسی گرنگی سەدەی بیستەم وەستاین، کە لە دەرەوەی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا بیر لە پێگە و شوێن و ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا دەکەنەوە. یەکەمیان، تالکۆت پارسۆنس، باوەڕی وایە کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا تێزێکی ناڕاستە و ناتوانێت ئاڵۆزیی دیاردەیەکی وەک ئامادەگیی دین لە دونیای مۆدێرندا لێک بداتەوە. بۆیە خۆی، وەک کۆمەڵناسێکی سەر بە قوتابخانەی وەزیفەگەرایی، لە دەرەوەی تێزەی لاوازبوون و پووکانەوەی ڕۆڵی دین لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی ئینسانیدا قسە دەکات و بەمەش جۆرێک لە بیرکردنەوە لە پێگە و ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا دەهێنێتە کایەوە لە دەرەوەی گریمانەکانی پارادایمی بەعەلمانیبوونەوە. ئەو خاڵەی ئەم کۆمەڵناسە ئەمەریکییە بەرگریی لێ دەکات ئەوەیە؛ مەرج نییە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی یەکسان بێت بە پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیا، واتە مەرج نییە بۆ ئەوەی کۆمەڵگا و سیستمێکی سیاسی مۆدێرن دروست ببێت، دین ڕۆڵی لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا نەمێنێت و پاشەکشە بکات بۆ ناو سنوورەکانی ژیانی تایبەتیی

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٦

تاکەکەسەکان. نەک هەر ئەمە، لە دیدی پارسۆنسدا دین تەنانەت دەتوانێت ڕەهەندێک، یان دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی تازەبوونەوەی کۆمەڵگا بێت، بەشێک بێت لە پرۆسەی مۆدێرنە خۆیشی. وەک پێشتریش هێمامان پێ کرد، پارسۆن ئەگەرچی واز لە پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا دەهێنێت بۆ شیکردنەوەی ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگای مۆدێرندا، بەڵام خۆی بە ڕەخنەکردن و پەلاماردانی ئەم پارادایمەوە سەرقاڵ ناکات، ئەوەی ئەم کارە ئەنجام ئەدات کۆمەڵناسی بەریتانی داڤید مارتینە و ڕەخنەکردنێکی ڕاستەوخۆی ئەم پارادیمە لە نووسینەکانی ئەم کۆمەڵناسە بەریتانییەوە دەست پێ دەکات.

لای داڤید مارتین تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا هەم لەسەر کۆمەڵێک گریمانەی ناڕاست دەربارەی کۆمەڵگا تەقلیدییەکان و کۆمەڵگا مۆدێرنەکان دروست بووە، هەم ئەو هەموو فۆرمە جیاوازییانەش نابینێت کە دەشێت پرۆسەی بەعەلمانیبوون لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا بیگرێتە خۆی، کە دەشێت لە یەکێکیاندا تەواو دژەدین بێت و لەوی تریاندا هاوکار و هاومەبەست و هاوڕێگا بێت لەگەڵ دیندا. لە کۆتایی سالانی شەسەتەوە و لەدوای ڕەخنەکانی داڤید مارتینەوە لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا، کایەیەکی نوێ لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بۆ لێکۆڵینەوە لە دین دەکرێتەوە، بەتایبەتی لە سۆسیۆلۆژیا و ئەنترۆپۆلۆژیای دیندا، کە هەم پشتئەستوورە بە لێکۆڵینەوەی کۆنکرێت و تەجریبی و مێژوویی، هەم لەسەر بنەمای ئەو لێکۆڵینەوانە هەڵگری کۆمەڵێک گریمانەی تیوری و تێزی تازەیە سەبارەت بە

پێگە و ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا. لەدوای نووسینەکانی ئەم کۆمەڵناسەوە نەوەیەکی تازە لە زانای کۆمەلایەتی دروست دەبن کە لە دەرەوەی پێدراوە چەسپاوەکانی تیزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا بیر دەکەنەوە و دەنووسن. باس لە ڕۆڵی دین لە ژیانی تاکەکەس و کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەکەن و تێبینی دەکەن کە دین ڕۆڵی بەهێز لە زۆر بەش و پارچەی جیاوازی دونیا و لەناو زیاد لە کۆمەڵگایەکی مۆدێرندا دەبینێت. لە ئاستی نۆرم و بەها و ئەخلاقیاتەوە بیگرە، بۆ ئامادەبوونی دەزگایی لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا، تا بە تێکەڵبوونی بە چەندان بزووتنەوەی سیاسیی جیاواز بە ئەجێندا و خەونی سیاسیی جیاوازەوە. لە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا باس لە خوێندنەوە ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا لای پێنج فەیلەسوف و زانای کۆمەلایەتیی تر دەکەم، کە بریتین لە کۆمەڵناسی ئیسپانی: جۆزێف کازانۆڤا، ئینسانناسی هۆڵەندی پیتەر ڤان دێر ڤێر، ئینسانناسی ئەمەریکی: تەلال ئەسەد، فەیلەسوفی ئەڵمانی: یۆرگن هابرماز و فەیلەسوفی هۆڵەندی-ئەڵمانی: فایت بادەر.

## سەرچاوەکان

Abercrombie, Hill and Turner (1994). Dictionary of sociology. The Penguin.

Martin, David (1967). A Sociology of English Religion. New York: Basic Books.

Martin, David (1969). The Religious and the Secular: Studies in Secularization.

Martin, David (1978). A general theory of secularization. Gregg Revivals

Turner, Bryan S.(2005). Talcott Parsons's Sociology of Religion and the Expressive Revolution: The Problem of Western Individualism. Journal of Classical Sociology. Vol 5(3).

Vanderstraeten, Raf (2012). Talcott Parsons and the enigma of secularization. European Journal of Social Theory 16(1).69–84.

# دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٢)
# جۆزێ کازانۆڤا و ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا

## سەرەتا

جۆزێ کازانۆڤا (١٩٥١ - ...) پرۆفیسۆری بواری کۆمەڵناسییە لە زانکۆی جۆرج تاون لە ئەمەریکا و یەکێکە لەو کۆمەڵناسانەی لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەمەوە، بە یەکێک لە ڕەخنەگرە گەورەکانی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا، ناسراوە. ئەم پیاوە لە یەک کاتدا هەم شارەزای فەلسەفە و هەم شارەزای بواری خوداناسی و هەم کۆمەڵناسیشە. کازانۆڤا لە ساڵی ١٩٩٤دا کتێبێک بە ناونیشانی "دینە گشتییەکان لە دونیای مۆدێرن"دا دەنووسێت، ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە گرنگەکانی بواری کۆمەڵناسیی دین و تیایدا ڕەخنە لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەگرێت.[1] پازدە ساڵێک دواتر نووسینێکی تر بڵاو دەکاتەوە تیایدا هەم ڕەخنە لە هەندێک لە بۆچوونەکانی خۆی لە کتێبەکەی ساڵی ١٩٩٤ دەگرێت و هەم گەشە بە هەندێک تێزی نوێ ئەدات سەبارەت بە ڕۆڵی

---

1 -Casanova, José (1994) Public Religions in the Modern World. University of Chicago Press.

سیاسیی دین لە کۆمەڵگا دیموکراسییەکاندا.[1]

ئەوەی خوێنەر لەم بەشەدا دەیخوێنێتەوە کورتەیەکی بۆچوونەکانی ئەم کۆمەڵناسەیە لەو دوو نووسینەدا کە هێمامان پێ کردن.

**"دینە گشتییەکان" لە دونیای مۆدێرندا**

بەر لە هەموو شتێک چەمکی "دینی گشتی" لای کازانۆڤا بەو دینە دەوترێت کە لە ژیانی گشتیدا ئامادەیە و کورت نەبۆتەوە بۆ ئیمانی تاکەکەسی لەناو ژیانی تایبەتدا. کازانۆڤا ئەم گشتیبوونە بە دەستەواژەی de-privatized religion باس دەکات، واتە ئەو دینەی کە لە شەخسییبوون کەوتوە، کە شەخسی نییە. دینێک کە لاواز و پەراوێزخراوە نییە و لەناو زیاد لە رووبەرێکی ژیانی گشتیدا ئامادەیە و بەشێکیشە لە کردەی گشتی، collective action. بۆ شیکردنەوەی چەمکی "دینە گشتییەکان" کازانۆڤا دۆخی دین لە چوار وڵاتی خۆرئاواییدا بەیەکتری بەراورد دەکات، کە بریتین لە ئەمەریکا و ئیسپانیا و بەرازیل و پۆڵەندا. لە هەر چواریاندا پێگە و رۆڵی کەنیسەی کاتۆلیکی بەیەکتری بەراورد دەکرێت، بەڵام لە بەشێکی تری کتێبەکەدا باس لە کەنیسەی پرۆتستانی و چالاکیە ئایینییەکانی لە ئەمەریکادا دەکات.[2]

---

1 -Casanova, José (2010). Religion challenging the myth of secular democracy. In: *Religion in the 21st Century: Challenges and transformations*. Edited by Lisbet Christoffersen, Hans Raun Iversen, Hanne Petersen and Margit. Ashgate Publishing

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧٤-١٧٦

کازانۆڤا لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا باس لەوە دەکات کە دین لە سەرەتای ساڵانی هەشتاوە دەبێت بە دینێکی بەشدار لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگادا، دەبێت بە دینێک ڕازی نابێت کورت بێتەوە بۆ دیاردەیەکی ناو ژیانی تاکەکەسی و ژیانی تایبەتی ئیماندارەکان بەتەنها. کازانۆڤا ئەم گۆڕانە بەسەر شوێن و ڕۆڵی دیندا وەک دیاردەیەکی گەردوونی دەبینێت، واتە پابەستی ناکات بەم بەش یان بەو بەشی دونیاوە بەتەنها. بۆ دروستبوونی ئەم گۆڕانەش چوار هۆکاری سەرەکی دەستنیشان دەکات. یەکەمیان، بەرپابوونی شۆڕشی ئێرانی ساڵی ١٩٧٩. دووهەم، سەرهەڵدانی بزوتنەوەی "سۆلیداریتی"یە لە پۆڵەندا. سێهەم، ڕۆڵی کەنیسە و قەشە کاتولیکیەکانە لە شۆڕشی ساندینیستییەکانی نیکاراگوا لە ئەمەریکای لاتیندا. چوارەمیش، ڕۆڵی ئوسوڵیەتی پرۆتستانیەتە، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەڵێن Moral Majority لە ژیانی سیاسی ئەمەریکیدا. وەک ئاشکرایە ئەم ڕووداوانە بەسەر شوێنە جیاوازەکانی دونیادا دابەش بوون، لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و دونیای ئیسلامەوە بیگرە بۆ ئەوروپای خۆرهەڵاتی کۆمۆنیستی و لە ئەمەریکای لاتینی سەرقاڵ بە شۆڕشی سۆسیالیستییەوە، بۆ ئەمەریکا خۆی کە نەک تەنها کۆمەڵگایەکی هێجگار ئیمانداری دینیی هەیە، بەڵکو ڕۆڵی دین لە سیاسەتیشدا بەخەستی ئامادەیە. کازانۆڤا پێی وایە هیچ کێشە و ململانێیەکی سیاسیی گەورە لە ساڵانی هەشتادا نادۆزینەوە دین بە شێوەیەک لە شێوەکان لەپشتییەوە نەوەستابێت. لە سەرەتای هەشتاکاندا

لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئوسوڵەیتی ئیسلامی و مەسیحی و یەهودیی لە پێکداداندان، لە ئیرلەندای باکوور و یۆگۆسلاڤیا و هیندستان و یەکێتیی سۆڤیەتدا، بەریەککەوتنی دینی و تێکەڵبوونی ڕاستەوخۆی دین و سیاسەت و دین و ژیانی گشتی بەیەکتری دەبینین. هاوکات دین لە فۆرمی "خوداناسیی ئازادیخوازدا"، Libreration theology وەک بەشێک لەو هێزانەی بۆ ئازادی و دیموکراسیەت و مافپەروەریی خەباتیان دەکرد، لە زۆر شوێنی دونیادا ئامادەیە، ئەمەریکای لاتین ئەو نموونەیە کە کازانۆڤا باسی دەکات.

جگە لەم چالاکبوونە سیاسییەی دین، کازانۆڤا پێ لەسەر خاڵێکی تریش دەگرێت، کە پەیوەستە بە مەسەلەی لەشەخسیکەوتنی دینەوە. ئەم کۆمەڵناسە پێی وایە لە سەرەتای هەشتاکانەوە دین تەنها بەشداریی لە خەبات و پێکدادانە سیاسییەکاندا ناکات، بەڵکو دین بە ڕووخساری جیاوازەوە لە ژیانی گشتیدا ئامادەیە، هەم ئەو ڕوخسارانەی دین کە شەڕانی و دابەشکەر و پەراوێزخەر و تائیفییە ئامادەیە، هەم ئەو ڕوخسارانەش کە کۆکەرەوە و ئامێزانکار و هێمن و گەردوونییە. لە یەک کاتدا هەم ئوسوڵیەتێکی توندڕەو و چەپێنەری ترسناک دروست بووە و دروست دەبێت، هەم دینێک کە خەبات لە دژی چەوساندنەوە و سەرکوتکردن و بێمافیی دەکات. هاوکات دین لە هەندێک ئاستی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی تریشدا وەک بەشێک لە ژیانی گشتی ئامادەیە، لەوانەش لەدایکبوونی بزووتنەوە دینییەکانی وەک "سەردەمی نوێ"، New Age، پەیدابوونی قەشە و ئیمامی تەلەفیزۆنی،

دروستبوونی گرووپی دینیی داخراو بەدەوری سەرکردەیەکی کاریزمیدا، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەڵێن cult، هەروەها بەهێزبوونی سەرلەنوێی بزووتنەوەی تەبشیریی پرۆتستانی لە ئەمەریکای لاتین و لە بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش لە کۆمەڵگای ئەمەریکیدا. هەموو ئەمانە نیشانی ئەدەن کە دین لە سەرەتای هەشتاکانەوە بە هیچ مانایەک تەنها بەشێک نەبووە و نییە لە ژیانی تایبەتیی کەسە ئیماندارەکان بەتەنها، بەڵکو بەشێکە لە ژیانی سیاسی و گشتییش.[1]

## هاتنەدەرەوەی دین بۆ ناو ژیانی گشتی

تێزەی سەرەکیی کتێبەکەی کازانۆڤا ئەوەیە کە دین بەشێک نییە لە "ژیانی تایبەت" بەتەنها، بەڵکو بەشێکی گرنگی "ژیانی گشتی"یشە. وەک وتم، کازانۆڤا ئەم پرۆسەیە ناو دەنێت deprivatization، بە کوردی واتای پرۆسەی "بەگشتیبوون"، یان "لەشەخسیکەوتن"ی دین دەگەیەنێت، واتە دەرچوونی دین لە سنوورەکانی ژیانی تایبەتیی ئیمانداران و تێکەڵبوونی بە ژیانی گشتیی کۆمەڵگا. دروستبوونی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتیی دینی، یان تەحەداکردنی دەسەڵاتە عەلمانییەکان بە ناوی دینەوە. کازانۆڤا دەڵێت لە هەشتاکاندا دەزگا و ڕێکخراوە دینییەکان لە بەشێکی زۆری دونیادا بەوە ڕازی نابن ڕۆڵیان کورت بکرێتەوە بۆ مشورخواردنێکی ڕۆحیی تاکەکەسەکان بەتەنها، بەڵکو لە هەوڵی ئەوەدان ژیانی تاکەکەسی و ژیانی گشتیی کۆمەڵگاکان بەیەکەوە

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣، ٤، ٥.

گرێ بدەن و لەیەکتریان جیا نەکەنەوە. هەموو ئەمانەش بوونە هۆی بەسیاسیبوونی زیاتری دین و بەسیاسیبوونی خودی مەجالی تایبەت و بەسیاسیبوونی ژیانی ئەخلاقی و دینیی خۆشیان. ئەمە جگە لە داواکردنی دروستبوونی کۆمەڵێک نۆرم و بەهای دینی کە بتوانێت وەک پێوەرێکی ئەخلاقیی بەسەر ژیانی سیاسی و ئابوورییەوە ئامادە بێت.[١] کازانۆڤا ئەم گۆڕانە گەورانە لە ڕۆڵی دیندا بە پرۆسەی "بەگشتیبوونی دین" ناو دەبات. وەک پێشتریش وتم کازانۆڤا ئەم دیاردەی بەگشتیبوونەی دین، وەک دیاردەیەک تایبەت بەم یان بەو دین بەتەنها و بەم یان بەو بەشی دونیا بەتەنها نابینێت، بەڵکو وەک دیاردەیەک دەیبینێت لە یەک کاتدا هەم دینەکانی وەک ئیسلام و کاتۆلیکیەت و پرۆتیستانیزم و یەهودیەت و هیندویزم و بودیزم دەگرێتەوە، هەم بەشە جیاوازەکانی دونیاش، وەک ئەمەریکا و ئەمەریکای لاتین و ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقاش. ئەمەش ڕێک پێچەوانەی ئەم شوێن و پێگە و ڕۆڵەیە کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا بە دینی دەبەخشێت لە ژیانی کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا.

### کام بەشی تێزەی بەعەلمانیبوون ڕاستە؟

جۆزێ کازانۆڤا لە بەشە تیوریەکەی کتێبەکەیدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە پرۆسەی بەگشتیبوونی دین و بەشداریکردنی لە "ژیانی گشتی"ی کۆمەڵگادا، ناچارمان دەکات بە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا بچینەوە، بەڵام

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥، ٦.

ئەم پێداچوونەوەیە مانای ئەوە نییە واز لە سەرجەمی ئەم تێزە بهێنین. کازانۆڤا لێرەدا سێ ڕەگەزی سەرەکی تیورەی بەعەلمانیبوونی دونیا لەیەکتری جیا دەکاتەوە و پێی وایە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا گریمانی سێ شت دەکات.[1]

یەکەم، بەعەلمانیبوون مانای پرۆسەی لاوازبوون و بچووکبوونەوەی بەردەوامی دین و کەمبوونەوەی کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکانی لە دۆخی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتیدا. The Decline ofReligion.

دووهەم، بەعەلمانیبوون مانای پرۆسەی دروستبوون و لەدایکبوونی جیاوازیی زۆر لە کۆمەڵگادا کە نەکرێت یەک دین یان یەک ئایۆلۆژیای دینی هەموویان لەژێر سێبەری خۆیدا کۆ بکاتەوە، یان خۆی بەسەر هەمووااندا بسەپێنێت. The Differentiation and secularization o f society.

سێهەم، بەعەلمانیبوون وەک پرۆسەی بەتایبەتیبوون و بەشەخسیبوونی دین و پاشەکشەکردنی لە "ژیانی گشتی"یەوە بۆ "ژیانی تایبەتی" The privatization of religion.

کازانۆڤا ڕای وایە گریمانەی ئەوەی دین لە پرۆسەی تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتیدا بەردەوام لاواز دەبێت و دەشێت لە خاڵێکدا زانست شوێنی بگرێتەوە و بەمەش کۆتایی بە دین بێت، گریمانەیەکی هەڵەیە و هیچ پێدراوێکی مێژوویی و واقیعیی گۆڕان و تازەبوونەوەی جیهان لە سەدەی هەژدەهەمەوە بۆ ئەمڕۆ نایسەلمێنێت، ئەگەرچی ڕەنگە بکرێت لە هەندێک بەشی ئەورووپای خۆرئاوادا هەندێک دەرکەوتی ئەم تێزە بدۆزینەوە. سەبارەت بە خاڵی دووهەمیان، واتە

---

[1] - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠-٣٩.

مەسەلەی بەرهەمهێنانی بەردەوامی مۆدێرنە بۆ جیاوازیی فرەجۆر لە کۆمەڵگادا و دروستکردنی کایەی جیاواز و سەربەخۆ و لێرەشەوە پەکخستنی دین لەوەدا کە بتوانێت ببێت بە خاڵی هاوبەش لەنێوان هەموو کایە جیاوازەکاندا، کازانۆڤا ئەم گریمانەیە بە ڕاست دەزانێت و پێی وایە دەکرێت تا ئێستاش بەرگریی لەم خاڵە بکرێت. بەڵام هاوکات پێ لەسەر ئەوەش دائەگرێت کە دروستبوونی ئەم کایە جیاوزانە لە دونیای مۆدێرندا مانای ئەوە نییە وا دەکات دین بەحەتمی لاواز ببێت و پەراوێز بکەوێت. کازانۆڤا گریمانەی پاشەکشەی دین بۆ مەجالی تایبەت و دەرچوونی لە ژیانی گشتیدا، بە گریمانەیەکی هەڵە و ناڕاست دەزانێت و پێی وایە لەبەر تیشکی ئەوەی لە دونیادا ڕوو دەدات پێویستە سەرلەنوێ هەڵبسەنگێرێتەوە.

خاڵێک کە گرنگییەکی تایبەتی لە دیدی کازانۆڤادا هەیە و بەرگرییەکی گەورەشی لێ دەکات، ئەوەیە کە هاتنەدەرەوەی دین لە مەجالی تایبەتەوە بۆ مەجالی گشتی و تێکەڵبوونی بە سیاسەت و مەسەلە گرنگەکانی ژیانی گشتی و پێکەوەیی لە کۆمەڵگادا، نابێت سنوورەکانی کۆمەڵگای مەدەنی تێبپەڕێنێت و وا بکات دین و دەوڵەت بەیەکتری تێکەڵ ببن. واتە کازانۆڤا هێشتا بەرگری لەو دیدە عەلمانییە دەکات کە ڕۆڵی سیاسیی ڕاستەوخۆ لە دین دەسێنێتەوە و ڕۆڵی دین لەناو سنوورەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا سنووردار دەکات. هاوکات پێی وایە دین لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا، تەنها بەرگری لە دید و بۆچوونە دینییەکان ناکات، بەڵکو بەرگریی لە بەها ئینسانییە نادینییەکانیش دەکات. لەڕاستیدا کازانۆڤا تا ئەو

شـوێنە دەڕوات کە بڵێت دین لـە دۆخێکی لـەو بابەتـەدا نـەک دژ بـە پرۆسـەی تازەبوونـەوەی کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگـی نییـە، بەڵکـو یارمەتیـی لەدایکبوونـی پرۆسـەکانی مۆدێرنـە ئـەدات. بـەڵام دینێک بۆ ئـەوەی بتوانێت ببێت بـە بەشـێک لـە پرۆسـەکانی مۆدێرنـە، پێویسـتە پێشـوەخت دانـی تەواوەتیـی بـە توانـا مەعریفییەکانی زانستدا نابێت، وازی لـەوە هێنابێت خـۆی بـە سـەرچاوەی شـەرعیەتی کۆمەڵایەتـی بزانێـت، هەروەهـا هەوڵـی ئـەوە نـەدات ئینسـان بـە ژیانێکی پڕ زوهد و تەقەشـوفی دینـی مەحکـوم بـکات، بـە جۆرێـک ببێتـە هـۆکاری ڕێگرتـن لـە گەشـەدان بـە هێز و توانـا و بەهـرە ئینسـانییەکان. بـە مانایەکی دیکـە تەنهـا ئـەو دینـە گشـتییانە ڕەوایەتییـان هەیـە کـە ئازادییـە مۆدێرنەکانـی تاکەکـەس ناخەنـە مەترسـییەوە و یـان بـەر بـە پرۆسـەی دروسـتبوونی جیاوازیـی بونیـادی لە کۆمەڵگادا بگرن. بـۆ نموونـە ڕێ لـە گەشـەکردنی کایـە جیـاوازەکان بگـرن، بـۆ نموونـە بەگژاچوونـەوەی هونـەر و ئەدەبیات بـە نـاوی دینـەوە. بـە مانایەکـی دیکـە کازانۆڤـا بەرگریـی لـەوە دەکات کـە دیـن لـە یـەک کاتـدا هـەم گشـتی بێـت و هـەم مۆدێـرن بێـت. ئاشـکرایە ئـەم دیـدەی کازانۆڤـا بـۆ ڕۆڵـی دیـن لـە کۆمەڵـگا مۆدێرنەکانـدا تـەواو ناکۆکـە بـەو دیـدە ڕۆشـنگەرییە عەلمانییـەی کـە دیـن بـە سـیحر و خورافـەت و جەهـل یەکسـان دەکات و هیـچ ڕۆڵێکـی پۆزەتیڤـی لـە ژیانـی کۆمەڵایەتیـدا بـۆ ناهێڵێتـەوە.

### ڕەخنەکردنی هەمەلایەنەی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا

لـە کتێبێکـی گرنگـدا بـە نـاوی "دیـن لـە سـەدەی بیسـتویەکەمدا: تەحـەداکان و گۆڕانکارییـەکان"، کـە بەشـی یەکەمـی کتێبەکـە

جۆزێ کازانۆڤا نووسیویەتی لەژێر ناونیشانی: "*دین تەحەدای ئەفسانەی دیموکراسیەتی عەلمانیی دەکات*" ئەم کۆمەڵناسە هەم ڕەخنە لە هەندێک لە بۆچوونەکانی ناو کتێبەکەی پێشووتری خۆی، کە ساڵی ١٩٩٤ بڵاوی دەکاتەوە، دەگرێت و هەم هەندێک بۆچوونی نوێش دەربارەی ڕۆڵی دین لە دونیای ئەمڕۆدا نیشان ئەدات. ئەم کتێبە لە ساڵی ٢٠١٠دا چاپ و بڵاو کراوەتەوە.[١] لە سەرەتای نووسینەکەیدا کازانۆڤا باس لەوە دەکات کە لە دوو سەد یان سێ سەد ساڵی ڕابردوودا دین لە دۆخی بەرگریکردندا بووە، چونکە دین لەلایەن مۆدێرنەیەکی عەلمانییەوە بەردەوام تەحەدا کراوە، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ لە دونیادا ڕوو دەدات، بەوەی کە لەناو خودی خۆرئاوا خۆشیدا ڕوو ئەدات، پێچەوانەبوونەوەی دۆخەکەیە. ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین تەحەداکردنی دینە بۆ مۆدێرنەیەکی عەلمانییانە. ئەم تەحەدایەش هەم تەحەدایەکی ڕۆشنبیری و هەم تەحەدایەکی سیاسییە. ئەو چوارچێوەیەش کە ئەم تەحەدایانە دەگرێتە خۆی، چوارچێوەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوونە، کە هەم دەسکاریی ماناکانی دینی کردوە و هەم دەسکاریی ماناکانی عەلمانیەت. کازانۆڤا قسە لە سێ جۆر تەحەدا دەکات. یەکەمیان تەحەدای بەگشتیبوونی دینە، de-privatization، دووهەم تەحەدای بێنیشتیمانیبوونی دینە، de-territorialization، سێهەمیش تەحەدای

---

1 -Casanova, José (2010). Religion challenging the myth of secular democracy. In: *Religion in the 21st Century: Challenges and transformations*. Edited by Lisbet Christoffersen, Hans Raun Iversen, Hanne Petersen and Margit. Ashgate Publishing.

هەڵوەشاندنەوەی ئەفسانەگەرایی، de-.nominationalism[1] بۆ قسەکردن لەسەر تەحەدای یەکەمیان، کازانۆڤا لەم نووسینەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێزەی لە کتێبەکەی ساڵی ١٩٩٤دا بەرگریی لێ دەکرد، ئەو تێزەی کە دەڵێت ئەمڕۆ لە هەموو کات زیاتر بەڵگەی واقیعیمان لە بەردەستدایە کە دەیسەلمێنێت دین نەک تەنها پاشەکشەی نەکردوە بۆ "مەجالی تایبەت"، بەڵکو بووە بە بەشێکی گرنگی ژیان و بەشێکی گرنگی مەجالی گشتی لە هەموو دونیادا، لەناو خودی خۆرئاوا خۆشیدا. ئەو تێزەی کە وەک تێزەی بەناشەخسیبوون یان بەگشتیبوون ناساندمان The de-privatization. کازانۆڤا جارێکی تر گرنگیی ئەم تێزەیە دەسەلمێنێتەوە و دەڵێت: گرنگی ئەم تێزە تەنها لە ئاستە واقیعییەکەیدا نییە کە بەپێی داتا سەلماندوویەتی دین لە زۆر شوێنی دونیادا لەباتیی پاشەکشە لە پرۆسەیەکی بەرفراوانی بەگشتیبووندایە، بەڵکو لەو تەحەدادا تیوری و تەحلیلی و پێوانەییەشدایە کە ڕووبەڕووی ئەو بەشەی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیای دەکاتەوە کە پێی وایە دین لە دونیای مۆدێرندا ڕووی لەوەیە ببێت بە دیاردەیەک لە دیاردەکانی ناو ژیانی تایبەتی و داببڕێت لە ژیانی گشتی.[2] کازانۆڤا دەڵێت ئەم دیدە عەلمانییە بۆ ڕۆڵی دین لە دونیای ئەمڕۆدا بە هیچ جۆرێک قابیلی بەرگریلێکردن نییە، نە لە ڕووی تەجریبییەوە قابیلی بەرگریلێکردنە، چونکە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی بۆ ڕاستی و دروستیی ئەو تێزە نادۆزینەوە، نە لە ڕووی

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٩٠.

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٩

پێوانەیی و ئەخلاقییشەوە قابیلی بەرگریلێکردنە، چونکە هیچ پاساوێکی قابیلی قبوولکردن نادۆزینەوە بۆ کردنەدەرەوەی دین لە "ڕووبەری گشتی"ی ناو کۆمەڵگایەکی دیموکراس. دیموکراسی وەک چۆن شوێن بە نادین دەبەخشێت، پێویستە بتوانێت شوێن بە دینیش ببەخشێت.

لەم نووسینە تازەیەدا کازانۆڤا جارێکی تر ئەو خاڵە دووبارە دەکاتەوە کە ئەو ڕۆڵە تایبەتەی دین لە دونیای ئەمڕۆدا لە ژیانی گشتیدا دەیبینێت، ڕۆڵێک نییە تەنها تایبەت بێت بە کۆمەڵگاکانی دەرەوەی خۆرئاواوە، بەڵکو ڕۆڵێکە لە کۆمەڵگا هەرە سەرەکییەکانی ئەورووپای خۆرئاواشدا دەبینرێت. کازانۆڤا دەڵێت پرسیارەکە چیتر ئەوە نییە ئایا دین لە مەجالی تایبەتدا دەمێنێتەوە یاخود نا، بەڵکو ئەوەیە چۆن تێکەڵبوونی دین بە ژیانی گشتیی ڕێک بخرێت و وای لێ بکرێت نەبێت بە هەڕەشەیەکی گەورە بۆ سەر دیموکراسیەتی لیبرالی لە خۆرئاوادا.[1]

کازانۆڤا ئامادەگیی دین لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگاکانی ئەورووپای خۆرئاوادا تەنها بە ڕووداوەکانی ١١ سێپتمبەر و تەقینەوەکانی مەدرید و لەندەن لەلایەن ئیسلامییە جیهادییەکانەوە نابەستێتەوە، بێگومان ئەو ڕووداوانە کاریگەرییان لەسەر ئەوە هەبووە دین جارێکی تر ببێتەوە بە بەشێک لە بەرخورد و دیالۆگ و ڕاگۆڕکێکانی ناو ڕووبەری گشتیی کۆمەڵگا ئەورووپییەکان، هاوکات کازانۆڤا ئەم ئامادەگییە نوێیەی دین تەنها بەو دیالۆگانەشەوە نابەستێتەوە کە دوای تێزەکەی سامۆئێل هینتگتۆن لەسەر جەنگ و پێکدادانی شارستانیەتەکان هاتە کایەوە، هەروەها

---

١ - هەمان سەرچاوی پێشوو ل ٢٠

تەنها سیاسەتی "جەنگ دژ بە تیرۆر"ی سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا بۆ گەڕاندنەوەی دین بە بەرپرسیار نازانێت، کە خودی جەنگەکە، وەک کازانۆڤا دەڵێت: ڕەگەزێکی دینیی گرنگی هەیە و بە زمانێکی دینیی ململانێکان نمایش دەکات. کازانۆڤا بوونەوەی دین بە بەشێک لە فەزا و ڕووبەری گشتیی کۆمەڵگا ئەوروپییەکان، بە کۆمەڵێک هۆکار و گۆڕانکاریی ناوەکیی ئەو کۆمەڵگایانە خۆیانەوە گرێ ئەدات، نەک تەنها بەو کێشانەوە کە ئیسلامی جیهادیی لە دونیای دوای ١١ سێپتێمبەرەوە دروستیان دەکات. لەم ئاستەدا کازانۆڤا باس لە پرۆسە سەرەکی و گشتییەکانی بەجیهانیبوون دەکات وەک بەشێک لە پاڵنەرەکانی بەگشتیبوون و چالاکبوونەوەی دین لە ژیانی گشتیدا. لەوانەش بۆ نموونە: فروانبوونی مەودای کۆچکردنی جیهانی و بڵاوبوونەوەی کۆچبەرانێکی زۆر بە دونیادا، ئەمە جگە لە پرۆسەی یەکگرتنەوە و گەورەبوونی سنوورەکانی ئەوروپای یەکگرتوو خۆشی، بەتایبەتی ئەگەری بوونی تورکیا بە بەشێک لە ئەوروپا.[1] لە هەموو ئەو دۆخانەدا مەسەلەی سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی شوناسی ئەوروپا دەبێتە مەسەلەیەکی سەرەکی و پێویست بە دارشتنەوەیەکی نوێ دەکات. لە بەشێکی گەورەی ئەو موناقەشەتانەدا کە لە بیست ساڵی ڕابردوودا لەسەر شوناسی کۆمەڵگا ئەوروپییەکان کراوە، چ لە ئاستی دەوڵەتە ئەوروپییەکاندا بەتەنها و چ لە ئاستی ئەوروپا خۆشیدا وەک گشتێک، پێداگرتنێکی بەرچاو هەبووە لەسەر دینی مەسیحی و یەهودی وەک دوو ڕەگی گەورە و سەرەکیی ئەو شوناسە

---

١ - هەمان سەرچاوی پێشوو ل ٢١

**دین و سیاسەت**

لە درێژەی نووسینەکەیدا کازانۆڤا باس لەوە دەکات کە لە کتێبەکەی ساڵی ١٩٩٤دا بەرگریی لەو دیدە کردوە کە دین دەتوانێت تەنها لەناو فەزاکانی "کۆمەڵگای مەدەنی"دا ئامادە بێت و تەنها بەشێکیش بێت لە دیالۆگە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی ناو ڕووبەری گشتی، بەڵام نابێت بەشێک بێت لە کایەی سیاسەت. واتە دین دەکرێت بچێتە ناو "فەزای کۆمەڵگای مەدەنییەوە"، بەڵام نابێت بهێڵرێت بچێتە ناو "کۆمەڵگای سیاسییەوە".[1] کەچی لەم نووسینە تازەیەدا، کازانۆڤا باس لەوە دەکات کە ئەو دیدە دیدێکی ناڕاست و ئایدیۆلۆژییە. چونکە کاتێک دین فەزای تایبەت و شەخسی جێ دەهێڵێت و دەچێتە فەزای گشتییەوە، واتە کاتێک پرۆسەی بەگشتیبوونی دین دەست پێ دەکات، ئیتر ناتوانرێت و ناکرێت تەنها لە فەزای کۆمەڵگای مەدەنیدا بهێڵرێتەوە و تێکەڵبوونی بە سیاسەت ئەگەرێکی هێجگار گەورەیە. کازانۆڤا دەربارەی ئەمە دەنووسێت: "بۆ ئەوەی بتوانین قسە لە سیاسەتێکی دینیی دیموکراسییانە بکەین، دەبێت هەم ئەو گوتارە عەلمانییە تێپەڕێنین کە باس لە جیاکردنەوەی دین و سیاسەت دەکات و هەم ئەو گوتارەش کە باس لە سنووردارکردنی دین دەکات بە سنوورەکانی کۆمەڵگای مەدەنی".[2] بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بۆچوونە کازانۆڤا هێما بە تێزەی "لێبوردنی دووجەمسەر"ی نووسەری ئەمەریکی ئەلفرێد ستێپمان دەکات، کە باس لە پێداویستیی یەکترقبووڵکردنی دولایەنەی دەوڵەت و دین بۆ

١ - هەمان سەرچاوی پێشوو ل ٢١

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢١

یەکتری دەکات، دەوڵەت دەبێت ئەوە لە دین قبووڵ بکات کە ڕۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گشتی هەبێت و دینیش دەبێت ئەوە لە دەوڵەت قبووڵ بکات کە ئازادیی عەقیدە و مافی یەکسان بۆ دین و نادین و دژەدین مەیسەر بکات.[1] لە دۆخێکی لەو بابەتەدا هەم دین دەکرێت تێکەڵ بە سیاسەت ببێت و هەم سیاسەتیش بە دین.

کازانۆڤا لە درێژەی ڕەخنەکردنیدا بۆ تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا، دەڵێت: شوناسی ئەورووپا لەمڕۆدا لەسەر دوو ئەفسانە بونیاد نراوە. یەکەمیان ئەفسانەی ئەوەی دەوڵەت لە ئەورووپادا سروشتێکی عەلمانییانەی هەیە. دووهەم ئەفسانەی ئەوەی کە دیموکراسیەتی ئەورووپی دیموکراسیەتێکی عەلمانیانەیە. کازانۆڤا ئەفسانەی هەردوو حیکایەتەکە بەم شێوە تەنزئامێزە دەگێڕێتەوە: "هەبوو نەبوو لە سەدەکانی ناوەڕاستی مێژووی ئەورووپادا، وەک لە دۆخی هەموو کۆمەڵگاکانی بەر لە مۆدێرنەدا، دین و سیاسەت بە یەکدی تێکەڵ بووبوون. ئەم تێکەڵبوونەش بە هۆی چاکسازییەکانی پرۆتستانیزمەوە بووە هۆی دروستبوونی دابەشبوونی دینیی پەرگیر و دروستبوونی ململانێی توند، کە دەرەنجام جەنگێکی ئایینیی قێزەون و بەربەرییانەی درێژخایەنی لێ کەوتەوە، کە لە سەرەتاکانی لەدایکبوونی دونیای مۆدێرندا بووە هۆکاری وێرانبوونی کۆمەڵگا ئەورووپییەکان. بەعەلمانیکردنی دەوڵەت وەڵامێکی ورد و حیساببۆکراو بوو بۆ ئەم ئەزموونە کارەساتئامێزە. ئەم وێنەیەیە کە یاداوەریی گشتیی کۆمەڵگا ئەورووپییەکانی بە شێوەیەکی بەهێز ڕەنگڕێژ کردوە. دوای ئەمە ئیتر ڕۆشنگەری بەشەکانی تری ئەو

---

1 -Stepan, Alfred (2000). Religion, Democracy, and the "Twin Tolerations" http://muse.jhu.edu/article/17085.

مێژووەی ئەنجام دا. ئیتر ئەوروپییە مۆدێرنەکان فێر بوون دین و سیاسەت و زانست لەیەکتری جیا بکەنەوە (...) جگە لەمەش دینیان لە ڕێگای نەفیکردنەوە بۆ مەجالی تایبەتیی پارێزراو دەستەمۆ کرد، ڕێک لەو کاتەدا کە مەجالێکی گشتیی لیبرالی و عەلمانییان دروست کرد، کە تیایاندا ئازادیی ڕادەربڕین و بەکارهێنانی ئاشکرای عەقڵ بالادەست بوو"[1] کازانۆڤا لە درێژەی کێشانی ئەم وێنە سادەیەدا بۆ مێژووی ئەوروپا دەپرسێت: ئایا بەڕاستیی تا چەند دەوڵەتە ئەوروپییەکانی ئەمڕۆکەی سەدەی بیستویەکەم دەوڵەتی عەلمانین؟ ئایا ئەو دیوارانەی کە دەوڵەتی نەتەوەی و کەنیسەی نەتەوەیی لە لایەکەوە و دین و سیاسەت لە لایەکی ترەوە لە ئەوروپادا، لە یەکتر جیا دەکەنەوە چەند بەرز و جێگیرن؟ ئایا دامەزراندن و سەرکەوتنی سیستمە دیموکراسییەکانی ئەوروپا لەدوای جەنگی جیهانیی دووهەمەوە پەیوەندییان بە سەرکەوتنی عەلمانیەت بەسەر دیندا هەیە، وەک ئەوەی بەبەردەوامی باس دەکرێت، یان ئەم دیموکراسیەتە سەرچاوەی تری هەیە؟ کازانۆڤا لە وەڵامدا دەڵێت ئەگەر ئێمە تەماشای واقیعی دەوڵەتە دیموکراسییەکانی ئەمڕۆکەی ئەوروپا بکەین، نەک تەنها گوێ لەو حیکایەتە سادەیە بگرین کە گوتاری عەلمانیەت پێمان دەڵێت، ئەوەمان بۆ دەر دەکەوێت کە زۆربەی هەرەزۆری دەوڵەتە ئەوروپییەکان "بە هیچ جۆرێک نە عەلمانین، نە لەگەڵ ئەفسانەی بێلایەنبوونی دینیی عەلمانییانەدا دەگونجێن."[2] بە بۆچوونی کازانۆڤا فەرەنسا تاقە وڵاتێکی ئەوروپایە کە عەلمانییە بە مانا ڕەسمییەکەی عەلمانیەت. لە

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢١

٢ - هەمان سەرچاوی پێشوو ل ٢٢

کاتێکدا بە پێچەوانەی فەرەنساوە چەندان وڵاتی تری ئەورووپا هەن کە خاوەنی سیستمێکی دیموکراسیی تەمەندرێژ و دێرینن، بەڵام هاوکات خاوەنی کەنیسەی تایبەت بە خۆیانن، ئەمەش نەک لە سەدەکانی ڕابردوودا بەم شێوەیە بووە، بەڵکو تەنانەت لەمڕۆشدا بەم شێوەیەیە. واتە لەم ئەزموونە دیموکرسییانەدا دەوڵەت و کەنیسە لەیەکتری جیا نەکراونەتەوە، بەڵکو دەوڵەت کەنیسەی تایبەت بە خۆی هەبووە و هەیە. نموونەی ئەو دەوڵەتانەش کە کەنیسەی نەتەوەیی تایبەتیان هەیە: ئینگلتەرە و سکۆتلەندا، وڵاتە ئەسکەندەناڤییە لۆسەرییەکانی وەک: دانیمارک، نەرویج، ئایسلاند، فیلەندا و تا ساڵی دوو هەزاریش وڵاتی سویدە، ئەمانە هەموویان کەنیسەی نەتەوەییان هەبووە و هەیە و بە شێوەیەکی ڕەسمییش ئەو کەنیسانە وەک کەنیسەی دەوڵەت ناسراون. هەروەها ئەو وڵاتانەی کە سیستمە دیموکراسییەکەیان بە ڕادەی ئەوانی سەرەوە تەمەندرێژ نییە و خاوەنی دیموکراسیەتێکی نوێن، ئەوانیش دەوڵەت و کەنیسە تیایاندا لەیەکتر جیا نەکراوەتەوە، لەوانە یۆنان و پورتوگال و ئیسپانیا، هەروەها لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتیشدا پۆڵەندا و هەنگاریا و سلۆڤانیا و کۆماری چیک و کرواتیا دین و دەوڵەت لەیەکتری جیا نەکراوەتەوە. لە هەموو ئەو ئەزموونانەشدا بوونی دین بۆ دەوڵەت، یان تێکەڵبوونی دین بە دەوڵەت، ڕێگریی نەکردوە لەوەی ئەو دەوڵەتانە ببن بە دەوڵەتی دیموکراسیی تازە. کازانۆڤا دیوی ئەودیوی ئەم وێنەیەش نیشان ئەدات و باس لەوە دەکات لە ئەورووپادا دەوڵەت هەیە عەلمانییە، بەڵام دیموکراس نییە، واتە دەوڵەت هەیە تیایدا دین و دەوڵەت زۆر بەتوندی و بەوردی لە یەکتری جیا کراونەتەوە، بەڵام ئەم جیاکردنەوەیە نەبۆتە هۆی

ئەوەی ئەو دەوڵەتانە ببنە دەوڵەتی دیموکراس. لەوانەش یەکێتیی سۆڤیەتی جاران و وڵاتە سۆسیالیستییەکانی تر. دوای نیشاندانی ئەم وێنە ناکۆکە بە وێنەی عەلمانیبوونی دەوڵەتە ئەوروپییەکان، کازانۆڤا دەڵێت: "وەک دەر دەکەوێت لێکجیاکردنەوەیەکی عەلمانییانەی کەنیسە و دەوڵەت، نە مەرجی کامڵ و نە مەرجی پێشینیی دروستبوونی دیموکراسیەتە، ئەگەرچی ئەم جیاکردنەوەیە بەردەوام داوا دەکرێت و دووبارە دەکرێتەوە".[1]
بەکورتی، کازانۆڤا پێی وایە لێکجیاکردنەوەیەکی عەلمانییانەی کەنیسە و دەوڵەت لە یەکتری، نە مەرجی کامڵ و نە مەرجی پێشینیی دروستبوونی دیموکراسیەتە. وەک چۆن دەشێت دەوڵەتی دیموکراسی هەبێت خاوەنی کەنیسەی نەتەوەیی بێت، ئاواش دەشێت دەوڵەتی عەلمانیی دابڕاو لە دین و کەنیسە هەبێت، بەڵام نادیموکرات بێت. بەم مانایە عەلمانیبوون پێشمەرجی بوون یان نەبوونی دیموکراسیەت نییە.

### ئازادیی دینی، وەک پێشمەرجی دیموکراسیەت

بەڵام ئایا دیموکراسیەت پێشمەرجی تایبەتی نییە؟ کازانۆڤا لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا و لە پەیوەندیدا بە دینەوە دەڵێت: ئەوەی لە ئەزموونی ئەوروپادا پێشمەرجی دیموکراسیەتە عەلمانیەت نییە، واتە ئەوە نییە کە دەوڵەت دینی نەبێت یان دین لە کایەی سیاسەتدا ئامادە نەبێت، بەڵکو ئەوەیە دەوڵەت "ئازادیی دین" مەیسەر بکات.[2] ئازادیی ئەوەی ئینسان بتوانێت دینی هەبێت یان نەیبێت، بتوانێت ئەم دینەی

---

١ - هەمان سەرچاوی پێشوو ل ٢٢
٢ - هەمان سەرچاوی پێشوو ل ٢٢

هەبێت و ئەوی تری نەبێت، ئەم باوەڕی دینی وەر بگرێت و ئەوی تریان ڕەت بکاتەوە، لەم دینەوە بچێت بۆ ئەو دینی تر. بە بۆچوونی کازانۆڤا ئینسان ناتوانێت سیستمی دیموکراسیی هەبێت بەبێ بوونی ئازادیی دین، ئازادیی دین یەکێکە لە پێشمەرجە سەرەکییەکانی دیموکراسیەت. بەلاّم کازانۆڤا پێی وایە ئەم بۆچوونە مانای ئەوە نییە نابێت لە هیچ کۆمەڵگایەکەدا داوای جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت بکرێت. بە بۆچوونی ئەو پرنسیپی جیاکردنەوەی دین و دەوڵەت لەیەکتری، دەکرێت داوایەکی ڕەوا بێت، کاتێک دەوڵەت بیەوێت هەم دینێکی تایبەتی هەبێت و هەم ئازادیی دینی دەستەبەر نەکات. واتە دەوڵەت بیەوێت دینێک بەسەر کۆمەڵگادا بسەپێنێت و ئازادیی دینەکانی تر و ئازادیی نەبوونی دین دەستەبەر نەکات. لە دۆخێکی لەو بابەتەدا داواکردنی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، دەبێت بە هەوڵ و کۆششێک بۆ ناچارکردنی دەوڵەت بۆ دەستەبەرکردنی ئازادیی دینی و مافی یەکسان بۆ هەمووان، بە دیندار و بێدینەوە لە یەک کاتدا. ناچارکردنی دەوڵەت بۆ ئەوەی دەزگا و توانا مادی و مرۆییەکانی نەخاتە خزمەتی ئەم دین بەرانبەر بەو دینی تر، یان نەتوانێت بەرگری لە دین بەرانبەر بە نادین بکات. مەبەست لە ڕێگرتن لەوەی دین و دەوڵەت لەو دۆخانەدا بەیەکەوە ببەسترێنەوە: ئەوە پاراستنی عەلمانیەت نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە ڕێ لە ئازادیی دینی نەگیرێت و بە هەمووان، چ دیندار و چ بێدین، هەمان ماف ببەخشرێت.[1] داواکردنی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت کاتێک پێویستە کە دینی

---

١ - هەمان سەرچاوی پێشوو ل ٢٢

دەوڵەت ئامادە نەبێت دیموکراس بێت، کاتێک بیەوێت دینێکی مۆنۆپۆلکەر بێت، ڕێ لە ئازادیی دینی بگرێت و هەڕەشە لە مافی یەکسانی هاوڵاتیان بکات.[1]

وەک وتم کازانۆڤا تەنها لەو شوێنەدا پێ لەسەر جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت دادەگرێت کە یەکێک لە دینەکان بیەوێت لە ڕێگای دەوڵەتەوە هەموو کایەی دین مۆنۆپۆڵ بکات و خۆی بەسەر هەموو دینەکانی تر و بەسەر بێدینەکاندا بسەپێنێت. واتە جۆرێک لە سیاسەتی دینیی ئامادە بێت کە لەسەر بێمافکردنی دینەکانی تر و بێمافکردنی کەسە نادینییەکان کار بکات. بەکورتی ئازادیی دین، نەک دابڕانی دین لە سیاسەت، ئەو پرنسیپە پێوانەیی و ئەخلاقییەیە کە دیموکراسیەت پێویستی پێیەتی.

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢

# سەرچاوەکان

Casanova, José (1994) Public Religions in the Modern World. University of Chicago Press;

Casanova, José (2010). Religion challenging the myth of secular democracy. In: Religion in the 21st Century: Challenges and transformations. Edited by Lisbet Christoffersen, Hans Raun Iversen, Hanne Petersen and Margit. Ashgate Publishing

Stepan, Alfred (2000). Religion, Democracy, and the "Twin Tolerations" http://muse.jhu.edu/article/17085.

# دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٣)
# تەلال ئەسەد و ئەنترۆپۆلۆژیای عەلمانیەت

**سەرەتا**

لە دوو بەشی ڕابردووی ئەم کتێبەدا ڕەخنەکانی داڤید مارتین و جۆزێ کازانۆڤام لە عەلمانیەت نیشان دا، نیشانم دا ئەم ڕەخنانە بە پلەی یەکەم ئاراستەی تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" و دوای ئەوەش ئاراستەی عەلمانیەتە وەک ئایدیۆلۆژیا. داڤید مارتین نیشانی داین تێزەی بەعەلمانیبونی دونیا نە دەتوانێت شوێن و جێی دین لە دونیای تەقلیدیدا، کە گوایە دونیایەکە دین هەموو کونوقوژبنێکی داگیر کردوە، لێک بداتەوە، نە شوێن و جێی دین لە دونیای مۆدێرندا، کە گوایە دونیایەکە دین تیایدا نە لە ئاستی کۆمەڵایەتی و نە لە ئاستی سیاسی و نە لە ئاستی فەرهەنگیدا ڕۆڵ و کاریگەرییەکی ئەوتۆی ماوە و بەردەوامیش ڕووی لە لاوازبوون و پەراوێزکەوتنی زیاترە. جۆزێ کازانۆڤاش نیشانی داین کە ڕۆڵی سیاسیی دین، لە سەرەتای هەشتاکانەوە، لە بەشێکی گەورەی کۆمەڵگاکانی دونیادا بەهێزتر بووە لاوازنەبووە، هەروەها ئەوەشی نیشاندایین کە لە بەشێکی زۆری سیستەمە

سیاسییە دیموکراسییەکانی ئەوروپادا دین و دەوڵەت، بەو مانایەی ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت باسی دەکات، لەیەکتری جیا نین. نەک هەر ئەمە، بەڵکو کازانۆڤا ئەوەشی نیشان داین کە دیموکراسیەت دەکرێت لەگەڵ پرۆسەی بەسیاسیبوونی دیندا بژی و هێزە دینییەکان دەتوانن بەشێک بن لە سیستمێکی دیموکراسی، هەروەها ئەوەشی نیشان دا کە دەشێت سیستمی سیاسی هەبێت عەلمانی بێت، بەڵام مەرج نییە دیموکراس بێت. مەسەلەکە لە بنەڕەتەوە بەسیاسییبوونی دین نییە، بەڵکو بەدیموکراسیبوونیەتی. هیچ دینێکیش لەخۆیەوە ناتوانێت ببێت بە دینێکی دیموکراس، دین بۆ ئەوەی بتوانێت وەک هێزێکی سیاسیی دیموکراس ئامادە بێت و کار بکات، وەک کازانۆڤا دەڵێت، دەبێت نەبێتە هۆکاری سنووردارکردنی ئازادیی دینیی کەسانی خاوەن دین و باوەڕی دینیی جیاواز و نەبێتە هۆی سنووردارکردنی ئازادیی ویژدان و بیرکردنەوە، هەروەها نەشبێتە هۆکاری بێمافکردنی هەموو ئەوانەی کە بێدینن، یان دژە دینن، یان بەلایانەوە گرنگ نییە دین هەبێت یان نەبێت. واتە پرۆسەی بەسیاسیبوونی دین و ئەوەش کە دەوڵەت دینێکی تایبەتی هەبێت، تەنها لەو دۆخەدا کێشە نییە کە هیچ یەکێکیان نەبنە هۆی ئەوەی ئەو دەوڵەتە هەوڵی سەپاندنی ئەو دینە بدات بەسەر کۆمەڵگادا لە ڕێگای یاسا و دەزگا و بڕیاری سیاسییەوە. ڕاستە دەوڵەت دەشێت دینی هەبێت، بەڵام هەم دەبێت ئازادیی دین و ئازادیی ویژدان دەستبەر بکات، هەم ناشبێت یاسای دینە ڕەسمییەکە بەسەر هەمووان‌دا بسەپێنێت. ئەوەی لەم بەشەدا دەمەوێت بە خوێنەری نیشان بدەم ڕەخنەی دوو ئینسانناسی بەناوبانگە لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا

و لـە عەلمانیـەت وەک ئایدیۆلۆژیـا. ئـەم دوو ئینسانناسـە، کـە هەردووکیـان سـاڵانێکی درێژە لەسـەر دیاردەی بەعەلمانیبوونی دونیـا و ڕۆڵـی دیـن لـە دونیـای مۆدێرنـدا کار دەکـەن، لـە گۆشـەنیگایەکی تـرەوە ڕەخنـەی تیـزی بەعەلمانیبوونـی دونیـا دەکـەن و ناڕاسـتیی گریمانـە و پێدراوەکانـی دەسـەلمێنن. ئـەو دوو ئینسانناسـەش: تـەلال ئەسـەدی ئەمەریکـی و پیتـەر ڤـان دێـر ڤێـری هۆڵەندیـن.[1]

وەک لـە بەشـەکانی پێشـووی ئـەم کتێبـەدا وتـم مەسـەلەی عەلمانیـەت مەسـەلەیەکی دووجەمسـەرە، لـە سـەرێکەوە ئێمـە تێـزەی "بەعەلمانیبوونـی دونیا"مـان هەیـە، کـە بـاس لـە لاوازبوونـی شـوێن و ڕۆڵـی دیـن لـە دونیـای مۆدێرنـدا دەکات، هـاوکات تێزێکـە دەیەوێـت خـۆی وەک وەسـفکردنێکی بابەتـی و بێلایەنانـەی دروسـتبوونی دونیـای مۆدێـرن و پێکهاتـەی ئـەم دونیایـە نمایـش بـکات. لـە سـەرێکی دیکـەوە ئایدیۆلۆژیـای عەلمانیەتمـان هەیـە، کـە داوای جیاکردنـەوەی دیـن و سیاسـەت لـە یـەک و داوای کورتبوونـەوەی ڕۆڵـی دیـن بـۆ پەیوەندییەکـی شەخسـیی لەنێـوان خـودا و ئیمانـداردا دەکات. یەکەمیـان پێـی وایـە کۆمەڵگایـەک بـۆ ئـەوەی مۆدێـرن بێـت بەئۆتۆماتیکـی دەبێـت بـە عەلمانـی، دووهەمیشـیان دەڵێـت بـۆ ئـەوەی کۆمەڵگایـەک عەلمانـی، واتـە مۆدێـرن، بێـت، نابێـت دیـن ڕۆڵ لـە ژیانـی سیاسـیدا بگێڕێـت. ئەوەشـمان وت کـە عەلمانیـەت وەک ئایدیۆلۆژیـا پشـتی تـەواوی بـە تێـزەی "بەعەلمانیبوونـی دونیـا" وەک وەسـفکردنێکی تایبەتـی لەدایکبوونـی دونیـای

---

١ - پیتـەر ڤـان دێـر ڤێـر سەرپەرشـتیاری تێـزی دکتۆراکـەی مـن بـوو لـە زانکـۆی ئەمسـتردام.

مۆدێرن بەستوە. ئەوەی لە سالانی شەستەوە لە بواری زانستە کۆمەلایەتی و ئینسانییەکاندا رەخنە کراوە، هەردوو دیوەکەی عەلمانەیەتە، واتە هەم تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا"یە و هەم عەلمانیەت خۆشیەتی وەک ئایدیۆلۆژیا. کارەکانی تەلال ئەسەد و پیتەر ڤان دێر ڤێر بەشێکن لەم پرۆسە بەرفراوانەی رەخنەکردنی پارادایمی عەلمانیەت، ئەوەی ئەم دوو ئینسانناسە ئەنجامی ئەدەن، رەخنەکردنی ئەم پارادایمەیە لە رێگای نیشاندانی چۆنیەتیی دروستبوونی عەلمانیەت لە رووی مێژووییەوە. ئەوەی کاری ئەم دوو ئینسانناسە لە زۆرێکی تر جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە ئەوان هێما بۆ چۆنیەتیی دروستبوونی گۆڕان لە ماناکانی دین خۆیشیدا دەکەن، وەک بەشێک لە پرۆسەی تازەبوونەوەی دونیا، هەروەها لە رێگای چۆنیەتیی بەشداربوونی دین لە پرۆسەی دروستکردنی نەتەوە و دەولەتی نەتەوەدا، دین دەبێت بە بەشێک لە کۆلەکە سەرەکییەکانی دونیای مۆدێرن.

### تەلال ئەسەد و ئەنترۆپۆلۆژیای عەلمانیەت

رەنگە تەلال ئەسەد، کە لە سالی ١٩٣٢دا لەدایک بووە، ئەمرۆ بەناوبانگترین ئینسانناسی دونیا بێت، نووسینەکانی لە سالانی نەوەدەوە تا ئەمرۆ بەشێکی جێگیری ئەنترۆپۆلۆژیای دینە، بەتایبەتی ئەنترۆپۆلۆژیای عەلمانیەت. خۆشی پرۆفیسۆری ئینسانناسییە لە زانکۆی نیۆرک لە ئەمەریکا. تەلال ئەسەد باوکی دیپلۆماتێکی ئوسترالی بە رەگەز پاکستانییە و دایکیشی خەلکی سعودیەیە. خۆشی لە سعودیە لەدایک بووە. باوکی پێشتر جوولەکە بووە، بەلام لە سالانی بیستی سەدەی

بیستەمدا دینەکەی خۆی گۆڕیوە و بووە بە موسڵمان. یەکێک لە ئاکارە گرنگ و سەرەکییەکانی کارەکانی تەلال ئەسەد گواستنەوەی میتۆدی جینیالۆجیی فەیلەسوفی فەرەنسی: میشێل فوکۆیە بۆ بواری خوێندنەوەی دین و شیکردنەوەی دیاردەی بەعەلمانیبوونی دونیا. ئەم میتۆدە هاریکاریی ئەم ئینسانناسەی کردوە بتوانێت لە چۆنیەتیی دروستبوونی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و لە چۆنیەتیی لەدایکبوونی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا تێبگات. لەم ئاستەدا تەلال ئەسەد بە داهێنەری بوارێکی نوێ لە زانستی ئینسانناسی، واتە ئەنترۆپۆلۆژیا، دادەنرێت، کە بریتییە لە بواری ئەنترۆپۆلۆژیای عەلمانیەت Anthropology of Secularism. ئەسەد لەم بوارەدا جگە لە نووسینی دەیان وتاری گرنگ، خاوەنی دوو کتێبی هێجگار گرنگە، کە بە سەرەکیترین کتێبی بواری ئەنترۆپۆلۆژیای دین و ئەنترۆپۆلۆژیای عەلمانیەت دادەنرێن. ئەو دوو کتێبەش بریتین لە کتێبی: "*جینالۆجیاکانی دین*" کە لە ساڵی ۱۹۹۳دا چاپ کراوە.[1] هەروەها کتێبی: "*دروستبوونەکانی عەلمانیبوون*" بە ئینگلیزی Formations of of the secular.[2] ئەگەرچی زەحمەتە تێزە ئاڵۆزەکانی تەلال ئەسەد و چەمکە فیکرییە قورسەکانی لەم نووسینەدا کورت بکەینەوە، بەتایبەتی بە زمانی کوردی، کە تا ئێستا

---

1 -Asad, Talal (1993). Genealogies of Religion: Discipline and Reasons of Power in Christianity and Islam. Johns Hopkins University Press.

2 -Asad, Talal (2003). Formations of the Secular: Christianity, Islam, Modernity. Stanford University Press.

زمانی موناقەشەکردنی ئەو جۆرە بابەتانە نەبووە و نییە، بەڵام هەوڵ ئەدەم زۆر بەکورتی بەشێک لە بیر و بۆچوونەکانی ئەم زانا کۆمەڵایەتییە گرنگە بە خوێنەران بناسێنم. لە ناونیشانی کتێبی دووهەمدا، خوێنەر بە چەمکێکی تایبەت ئاشنا دەبێت، کە چەمکی "عەلمانی"ە، بە ئینگلیزییەکەی "The secular"، ئەم چەمکە دەشێت بە "دونیاییبوون"یش بۆ زمانی کوردیی وەر بگێڕدرێت، بەڵام ڕەنگە وا باشتر بێت کە چەمکی "عەلمانی"ی بۆ دابنێین، چونکە ناسراوترە. ئەم چەمکە نە هێمایە بۆ تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" نە یەکسانە بە چەمکی "عەلمانیەت"یش وەک ئایدیۆلۆژیا. چەمکی "عەلمانی" هێما بۆ جۆرێک لە بیرکردنەوە و هەڵسوکەوت و ئیحساسات و زەوق‌و چێژی تایبەت دەکات کە بە دونیا و دونیاییبوونەوە پەیوەستن، هێما بۆ دونیاییبوونی ئینسان دەکەن، دونیا دەکەنە ژینگەی دروستبوون و گەشەکردن و لەناوچوونیان. بەم مانایە چەمکی "عەلمانی" هێما بۆ دروستبوونی کۆمەڵێک هەست و مەزەنەکردن و زەوق و بیرکردنەوە و پراکتیکی نوێ دەکات کە هەموویان لەژێر دەستەواژەی "دونیاییبووندا" کۆ دەبنەوە. دونیاییبوون، واتە کردنی دونیا بە سەرچاوە و بێشکەی کردەوە و هەڵسوکەوت و چەمکەکان. دروستبوونی ئەم فۆرمە تازەش لە بیرکردنەوە و پراکتیک و ئیحساسات دەکەوێتە بەر لە دروستبوونی عەلمانیەتەوە وەک ئایدیۆلۆژیا. ئەم بە دونیاییبوونە، ئەم "عەلمانی" یان سێکیولەرە، تێکەڵێکی تایبەتە کە لە زیاد لە دید و بۆچوون و چەمکێک و لە زیاد لە جۆرێک لە هەڵوسەکەوت و پراکتیکێکی مێژوویی دروست

بووه. دین به مانا مۆدێرنەکەی، وەک چەمکێکی تیوری، خۆی بەشێکە لەم پرۆسەی دروستبوونە مێژووییە.

بەم مانایە دروستبوونی چەمکی "عەلمانی" بەدابڕاوی لە دین و لە پەیوەندییەکی دژ بە دیندا دروست نەبووە، بەڵکو دین خۆی بەش و ڕەگەزێک بووە لە پرۆسەی دروستبوونی چەمکی "عەلمانی"دا. لای تەلال ئەسەد "عەلمانی"the secular، نە بەردەوامیی دینە، نە دابڕانیشە لە دین، بەڵکو کۆمەڵێک پراکتیکی تایبەت و کۆمەڵێک شێوازی مەعریفە و کۆمەڵێک ئیحساسات و زەوقی تایبەت لە سەرەتاکانی دروستبوونی دونیای مۆدێرندا بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە.[1] لەم دروستبوونە تایبەتەدا دین و "عەلمانی" بە مانای بەدونیاییبوون، بەیەکەوە گرێ دراون و هەردووکیان بەشدارن لە دروستکردن و دارشتنی یەکتریدا. واتە هەم دین دونیاییبوونی دروست کردوە و دارشتوە، هەم دونیاییبوون دینی دروست کردۆتەوە و دارشتۆتەوە. بەم مانایە بەدونیاییبوون شتێک نییە دوای کۆتاییهاتن بە دینیبوون هاتبێت، بۆ نموونە بەو مانایەی کە دەگوترێت کۆمەڵگای مۆدێرن دوای کۆتاییهاتنی کۆمەڵگای بەر لە مۆدێرن دروست دەبێت. واتە پەیوەندیی نێوان دونیاییبوون و دینیبوون پەیوەندیی بەدواییەکداهاتن نییە، ئەوە نییە ئەمیان هاتبێت و کۆتایی بەوی تریان هێنابێت، بەڵکو ئەم پەیوەندییە پەیوەندییەکی مێژوویی ئاڵۆزە، تیایدا لەدایکبوون و دروستبوونی "عەلمانی" گۆڕان و سەرلەنوێ دارشتنەوەی

---

١ - بڕوانە هەمان سەرچاوە، بەتایبەتی پێشەکی و بەشی یەکەمی کتێبەکە ل ١-٦٦

ماناکانی بەدینیبوون و چەمکە دینییەکانی بەدوادا هاتووە، گۆڕانی ئەمانیش گۆڕانی ماناکانی بەدونیابوونیان خستۆتەوە. واتە پرۆسەکە هەر لە بنەڕەتەوە پرۆسەیەکی دیالێکتیکییە، نەک ئەوەی جێگرتنەوەی یەکێکیان بووبێت بۆ ئەوی تریان. ئەوەی تەلال ئەسەد لێرەدا دەیەوێت نیشانی بدات ئەوەیە: ئەگەر چەمکی "عەلمانی" بە مانای دونیاییبوون، واتە کردنی دونیا بە سەرچاوەی کردەوە و هەڵسوکەوت و چەمکەکان، لە بناغەی دروستبوونی دونیای مۆدێرندا بێت، ئەوا هەر لە بنەڕەتەوە دین بەشدارە لە دروستبوونی ئەو بناغەیەدا.

**عەلمانیەت و وێنەی ئینسان**

بە بۆچوونی تەلال ئەسەد لەدایکبوونی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا دوا دەکەوێت بۆ سەدەی نۆزدەهەم، دروستبوونی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا لەم سەدەیەدا هێمایە بۆ چەمکێکی سیاسی و شێوازێکی تایبەتی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی حوکمڕانی. مەبەستیش لەم ئایدیۆلۆژیایە ئەوەیە ئینسان بتوانێت خۆی وەک کەسایەتییەکی نوێ پێناسە بکات، کەسایەتییەک لەدەرەوەی پێناسەی ڕەگەز، واتە نێربوون یان مێبوون و لە دەرەوەی ئینتیما بۆ چینێکی دیاریکراو و لە دەرەوەی ئینتیمای دینییشدا بۆ ئەم یان ئەو دینی تر، واتە عەلمانیەت بە پلەی یەکەم ئایدیۆلۆژیای بەرهەمهێنانی دیدێکی ئەبستراکتە بۆ ئینسان لە دەرەوەی ڕەگەز و چین و دیندا، هەوڵدانە بۆ سەپاندنی وێنەیەکی ئینسان کە حیساب بۆ نێربوون و مێبوون و شوناسی چینایەتی و ئینتیمای

دینیی ئەو ئینسانە ناکات. لەباتیی ئەوانە خۆی وەک هەڵگری ئایدیۆلۆژیای عەلمانی بناسێت، کە پێی وایە نابێت دین و سیاسەت بەیەکتری تێکەڵ بکرێن. بەشێکی گەورەی فیکری تەلال ئەسەد سەرقاڵی نیشاندانی خورافەت و ئەفسانەی بوونی ئەم جۆرە ئینسانە ئەبستراکتەیە، هەروەها نیشاندانی سنووردارکردنی فراوانی ئازادیی ئینسانە لەوەدا بیەوێت چ جۆرە ئینسانێک بێت. ئەسەد پێی وایە ئەم وێناکردنە بۆ ئینسان بازدانێکی گەورەیە بەسەر شێوازی واقیعییانەی ئامادەگیی ئینسان لەناو کۆمەڵگا و لەبەردەم ڕەوتە سیاسی و کولتووری و ڕەمزییە جیاوازەکاندا. بەکورتی وێنەیەکی ئایدۆلۆژیی هەڵە و ناڕاستی ئینسانە. هاوکات عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا هەڵگری وێنەیەکی زۆر تایبەتە بۆ دین خۆیشی، عەلمانیەت دین وەک عەقیدە و باوەڕێکی تاکەکەسیی نماییش دەکات، باوەڕ و عەقیدەیەک کە بەشێکە لە دونیای ناوەکیی تاکەکەس و هەقی بەسەر چۆنیەتیی ڕێکخستنی دونیای دەرەوەی تاکەکەسەوە نییە. بە بۆچوونی ئەسەد ئەم وێنەیەی عەلمانیەت بۆ دینی هەیە وێنەیەکی تایبەتە و دەشێت بەشێک بێت لە شێوازی ئامادەبوونی دین لە دونیادا، بەڵام ناتوانێت هەموو شێوازەکانی دین و هەموو شێوازەکانی ئامادەبوونی لە دونیادا بگرێتەوە. ڕەنگە دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی دین بەو شێوەیە بێت کە ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت پێشنیاری دەکات، بەڵام دین هاوکات دەرکەوتی تر و فۆرمی جیاوازیی تری هەبووە و هەیە. خاڵی سەرەکیی لە فیکری تەلال ئەسەددا ئەوەیە

کە دین شێوە و مانایەکی جێگیری نییە، بەڵکو بەردەوام لە گۆڕان و سەرلەنوێ پێناسەکردنەوە و خۆڕێکخستنەوە و داڕشتەوەی نوێدایە. ئەوەی گرنگە بیزانین، ئەوەیە: چ گۆڕانێک لەناو ڕەوتە مێژووییە جیاوازەکان و لەناو پەیوەندییەکانی دەسەڵاتدا بەسەر شێوە و ناوەڕۆکی دیندا دێت، چ جۆرە هەڵسوکەوت و پراکتیکێکی دینیی نوێ دروست دەبێت، دین دەچێتە پەیوەندییەوە لەگەڵ چیدا، چ جۆرە گۆڕانێک بەسەر شێوازی ئامادەبوونی دەزگای و نادەزگاییدا دێت، چۆن بکەرە دینییەکان دەگۆڕێن و چ گۆڕانێک بەسەر پەیوەندیی دین و نادین، دین و دونیاییبووندا دێت. قسەکردن لەسەر ئەوەی دین لە دونیای مۆدێرندا لاواز و پەراوێز دەبێت جگە لەوەی قسەکردنێکی زۆر سادە و بێقووڵاییە، هاوکات بازدانیشە بەسەر سەرجەمی ئەو پرسیارە گرنگانەدا کە هەموو کۆمەڵناسی و ئینسانناسییەکی زانستییانەی دین پێویستی پێیەتی.

### ڕووبەری گشتی و دیموکراسیەت

تەلال ئەسەد لە ئاستێکی دیکەدا ئەو جیاکارییەی فیکری لیبرال و عەلمانی لەنێوان "ڕووبەری تایبەت" و "ڕووبەری گشتیی"دا پێشنیار دەکات و لەوێشەوە دین لە "ڕووبەری تایبەتدا" جێگیر دەکات، ڕەخنە دەکات. بە باوەڕی ئەسەد ئەم دابەشکردن و جیاکارییە لەنێوان "ڕووبەری تایبەت" و " ڕووبەری گشتیی"دا تەواو سادە و ناڕاستە، چونکە جیاکردنەوەی ئەو دوو ڕووبەرە لە یەکتری نەک زەحمەتە،

بەڵکو مەحاڵە. بە بۆچوونی ئەسەد هەموو ئەوانەی کە لە گفتوگۆ و موناقەشەکانی ناو " ڕووبەری گشتیی"دا بەشدارن و لەو مەجالەدا خەریکی ئاخاوتن و ڕاگۆڕکێ و دیالۆگن، پێشوەخت لە "ڕووبەری تایبەت"دا دروست و پەروەردە و گەورە بوون. هاتنی ئینسان لە ڕووبەری تایبەتەوە بۆ ڕووبەری گشتی، دایناماڵێت لەو زمان و زانیاری و وێنە و گریمانانەی لە ڕووبەری تایبەتدا فێری بووە. ئینسانەکان کە دەچنە ڕووبەری گشتییەوە، بە هەموو ئەو شتانەوە دەچنە ئەو ڕووبەرەوە کە پێشتر لە ڕووبەری تایبەتدا فێری بوون و پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون و بەتاکەکەسبوونیان بەناویدا تێپەڕیون. جگە لەمە لە تیورە لیبرال و عەلمانییەکاندا "ڕووبەری گشتی" وا نیشان ئەدرێت وەک ئەوەی ڕووبەرێکی ئازاد و بێلایەنی گفتوگۆکردن و ڕاگۆڕکێی عەقڵانی بێت، لە کاتێکدا تەلال ئەسەد لە ڕێگای ڕەخنەگرتن لە بۆچوونەکانی هابرمازەوە دەربارەی ڕووبەری گشتی، نیشانی ئەدات کە ئەم ڕووبەرە ڕووبەرێکی دروستکراو و سنووردارکراو و ئاراستەکراوە، نەک تەنها جێی هەموو دەنگێکی تێدا نابێتەوە، لەوانە ماوەیەکی زۆر جێی دەنگی ئافرەتان و کرێکاران و کۆچبەرانی تێدا نەبۆتەوە، بەڵکو ڕووبەرێکە کردەی هەرە گرنگ تیایدا خودی قسەکردنەکان نییە، بەڵکو توانا و ئامادەگیی گوێگرتنە. ئینسان دەتوانێت لە ڕووبەری گشتیدا هاوار بکات و بقریشکێنێت، واتە ئەوەی دەیەوێت لەو ڕووبەرەدا بیڵێت، بەڵام لەمە گرنگتر بوونی توانا و ئامادەگییە بۆ بیستن و گوێگرتن لەو دەنگانە و دواتر بوونی ئەم دەنگانە لە ڕێگای

بیستن و گوێلێگرتنیانەوە بە بەشێک لە پرۆسەی بڕیاردان لەو کۆمەڵگایەدا. واتە ڕووبەری گشتی بۆ ئەوەی ڕووبەرێکی گشتیی دیموکراسی بێت، نابێت تەنها شوێنی قسەکردنی جیاواز بێت، بەڵکو شوێنی ئامادەگیی گوێگرتنیش بێت لە قسەکردنی جیاواز، بە قسەکردنی دینییشەوە.[1]

## ڕەخنەکردنی چەمکی دین

یەکێک لە ڕەهەندە گرنگەکانی ئەنترۆپۆلۆژیای دین لای تەلال ئەسەد: لێکۆڵینەوەیە لە چەمکی دین خۆی. لە نووسینێکی گرنگی ناو کتێبی "*جینالۆجیاکانی دین*"دا، تەلال ئەسەد ڕەخنە لە تێڕوانینی ئینسانناسی ئەمەریکی: کلیفۆرد گێرتز بۆ دین، دەگرێت. کلیفۆرد گێرتز دین وەک سیستمێک لە ڕەمز دەناسێنێت، ڕەمزیش لای کلیفۆرد گێرتز مانای هەر بابەتێک، کردەیەک، ڕووداوێک، پەیوەندییەک کە بکرێت ببێت بە کەرەستە و ئامرازێک بۆ مانا. بە مانایەکی تر کلیفۆرد گێرتز دین وەک "سیستم"ێک لە "ڕەمز" دەبینێت کە کاری لێکۆڵەرەوە بریتییە لە کردنەوەی شفرەکانی ئەو ڕەمزانە و تێگەیشتن لە ماناکانیان. بەڵام تەلال ئەسەد دیدێکی تەواو جیاوازی بۆ دین هەیە، ئەو دین نەک تەنها وەک سیستم نابینێت و بەدوای کەشفکردنی مانا ڕەمزییەکانیاندا ناگەڕێت، بەڵکو ئەو سەرقاڵی ئەوەیە بزانێت چۆن تێگەیشتنێکی

---

1 - بڕوانە:

Aasd, Talal (2005). Reflections on secularism and public sphere. Social Science Research Council, Items and Issues Volume 5, Number 3,

تایبەت بۆ دین و چۆن کۆمەڵێک ڕەمز، لە هەلومەرجێکی مێژوویی دیاریکراودا دەبن بە تێگەیشتن و ڕەمزی باڵادەست. پرسیارەکەی تەلال ئەسەد ئەوە نییە ئایا دین هەقیقەتی کۆمەڵگایەک نیشان ئەدات یان نا، بەڵکو ئەوەیە چۆن دەسەڵاتی دینی هەقیقەتی دینی دروست دەکات؟ تەلال ئەسەد لە موناقەشەکردنی پێناسەکەی کلیفۆرد گیرتزدا ناڵێت دین سیستمێک لە ڕەمز نییە، بەڵکو دەپرسێت لە چ ساتەوەختێکی مێژووییەوە ئێمە دین وەک سیستمێک لە ڕەمز و بەها وێنا دەکەین؟ کەی دین بووە بە چەمکێکی جیاواز لە چەمکەکانی تری وەک مەعریفە و زانست و هەستی گشتی و هونەر و هتد... کەی"جەوهەر"ێکی جیاواز بە دین بەخشرا و جیا کرایەوە لە "جەوهەر"ی شتەکانی دەوروبەری، چۆن ئەم کارە کراو و بۆ کرا و کێ کردی؟ بەشێکی گرنگی کتێبی "جینالۆجیاکانی دین" تەرخانە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم جۆرە پرسیارانە. لەم کتێبەدا تەلال ئەسەد نیشانی ئەدات تێگەیشتنی ئەنترۆپۆلۆگە مۆدێرنەکان بۆ دین وەک چەمکێکی سەربەخۆ و جیاواز دەربارەی ئەخلاق و هەڵسوکەوتی ئینسانی، هەڵگری وێنەیەکە بۆ دین، کە تیایدا دین وەک ڕووبەرێکی تایبەت و سەربەخۆ و جیاواز لە دیاردەکانی دەوروبەری دەبینێت. ڕووبەرێکی جیاوازی پراکتیک و باوەڕی ئینسانی، کە ناکرێت بە ڕووبەرەکانی تری باوەڕ و پراکتیکی ئینسانی تێکەڵ بکرێت. بە بۆچوونی ئەسەد دروستبوونی ئەم وێنە تازەیە بۆ دین پەیوەندیی بە دروستبوونی گوتاری عەلمانیەتەوە هەیە، نەک بە پەیوەندییەکی حەتمیی لەنێوان مۆدێرنە و دیندا. ئەم وێنەیە پەیوەست نییە بە "هەقیقەت"ی دین یان "هەقیقەت"ی

مۆدێرنەوە، بەڵکو پەیوەستە بە ستراتیژێکی تایبەتی دەسەڵاتەوە، کە دەیەوێت لە ڕێگای جیاکردنەوەی جەوهەری دین لە جەوهەری شتەکانی تر، دین ناچار بکات پاشەکشە بکات بۆ "ڕووبەری تایبەت" و دای ببڕێت لە دەسەڵاتی سیاسی.[1] تەلال ئەسەد پێی وایە هەم کلیفۆرد گێرتز و هەم زۆرێک لە ئینسانناس و کۆمەڵناسەکانی تر دیدێکی هێجگار نامێژووییان بۆ دین هەیە، وێنەیەکیان بۆ دین هەیە گەردوونی و نەگۆڕ، گشتگیر و ناکۆنکریت، لە کاتێکدا هەم مانا و پێناسەکانی دین و هەم تێگەیشتن بۆ دین و هەم شێواز و پراکتیکە دینییەکان بەبەردەوامی لە گۆڕاندان. بە بۆچوونی ئەسەد هەموو هەوڵدانێک بۆ گەڕان بەدوای پێناسێکی گشتگیر و گەردوونیدا بۆ دین کارێکی بێسەمەر و ناڕاستە، چونکە شێوازی جیاوازی پەیوەندیی مێژوویی لەنێوان دەسەڵات و مەعریفەدا شێوازی جیاوازی تێگەیشتن و ڕوانین بۆ دین دروست دەکات، ئەمە وا دەکات نەکرێت دین بە شێوەیەکی گشتگیر و گەردوونیی پێناسە بکەین، نەک تەنها لە بەر ئەوەی ئەو ماتریال و وێنە و زمان و کەسانەی لە ساتەوەختێکی مێژووییی دیاریکراودا ماناکانی دین بەرهەم دەهێنن جیاوازن، بەڵکو خودی ئەو تێگەیشتن و پێناسانەش کە بەرهەم دەهێنرێن مێژوویین و پەیوەندییان بەو ڕەوتە مێژووییە تایبەتەوە هەیە کە ئامادەیە. دروستبوونی هەر تێگەیشتن و پێناسێکیش بەشێکە لە پرۆسەیەکی گوتاریی بەرفروان. بەم مانایە تەلال ئەسەد نە دین و نە دونیاییبوون،

1 - بڕوانە:
Asad, Talal (1993). Genealogies of Religion: ل ١٥-٢١

وەک دوو چەمکی جێگیر و نەگۆڕ نابینێت، بەڵکو وەک چەمکی پڕ گۆڕان و ناجێگیر و پڕ ناکۆکیی ناوەکی وێنایان دەکات، کە بەردەوام لە دۆخی داڕشتنەوە و سەرلەنوێ ناونانەوەدان. بەکورتی، ئەوەی تەلال ئەسەد داوای دەکات ئەوەیە، کە دین وەک شتێکی جێگیر و یەکشێوە و یەکمانا نەبینین. لە هەر شوێن و کات و سەردەمێکدا و لە هەر ڕەوتێکی مێژوویی و مەعریفی و زانستیی دیاریکراودا، کە باس لە دین کرا، وا نەزانین باس لە شتێک دەکەین یەک مانای هەیە و هەموو کەسێکیش ئەو مانایە دەزانێت. ئەوەی پێویستە نووسینەوەی مێژووی کۆمەڵایەتی و بەراوردکاریی دینە، بە پێداگرتن لەسەر ژینگەی کۆمەڵایەتیی جیاوازی ئەم یان ئەو گوتار و ئەم یان ئەو پراکتیک و ئەم یان ئەو شێواز لە کەسایەتی و دەزگا و ئایدیۆلۆژیای دینی.

## تەلال ئەسەد و جۆزێ کازانۆڤا

لە کتێبی: "*دروستبوونەکانی عەلمانی*"دا، تەلال ئەسەد ڕەخنە لە دیدی کازانۆڤا بۆ پرۆسەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" و مەسەلەی "بەکشتیبوونی" دین دەگرێت.[١] تەلال ئەسەد پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" بەکەڵکی خوێندنەوەی دونیای مۆدێرن نایەت و هاریکارمان ناکات بۆ تێگەیشتن لەم دونیایەدا. بە بۆچوونی تەلال ئەسەد لاوازیی ئەم تێزە لەوەدا نییە، وەک کازانۆڤا دەڵێت، دین لە سەرەتای هەشتاکانەوە بەگشتی بووە و بە شێوەیەکی

---

١ - بڕوانە:

Asad, Talal (2003). Formations of the Secular ل١٨١-١٨٢

بەرچاو هاتۆتە ناو ژیانی گشتییەوە و لە زۆر شوێنی دونیاشدا بەهێز بووە. واتە فەشەلی تیزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" بۆ تێگەیشتن لە دونیای مۆدێرن پەیوەست نییە بە بەهێزبوونی لەپڕی دینەوە، بەڵکو پەیوەستە بەوەوە کە ئەمڕۆکە ئەوەمان بۆ ئاشکرا بووە کە لە دونیای مۆدێرندا بە شێوەیەکی بەردەوام پەیوەندیی لەنێوان دین و سیاسەتدا هەبووە، کە دین لەم دونیایەدا بەردەوام پەیوەندیی بە دەسەڵات و هێزەوە هەبووە، کە دین بەشێک بووە لە پرۆژەی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی و بزوتنەوەی ناسیۆنالیزم. واتە مەسەلەکە پەیوەندیی بە گەڕانەوەیەکی لەپڕی دینەوە نییە بۆ ناو دونیای مۆدێرن لە ساڵانی هەشتای سەدەی بیستەمدا. ئەسەد هەنگاوێک زیاتر دەچێتە پێشەوە و دەڵێت هەم چەمکی دین و هەم چەمکی سیاسەت لە دونیای مۆدێرندا دوو چەمکن بە شێوازی جیاواز بەیەکدی تێکەڵن، ئەوەشی وای کردوە ئێمە ئەمڕۆ ئەم ڕاستییانە بزانین تێگەیشتنی زیاتر و قووڵترمانە بۆ دەسەڵاتی دەوڵەتی مۆدێرن و بۆ دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوە و بۆ هاتنەکایەی ناسیۆنالیزم.

**پیتەر ڤان دێر ڤێر: ناسیۆنایزم و دین**

باسکردنی ڕۆڵی دین لە پرۆسەی دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوە و ناسیۆنالیزمدا دەمانپەڕێنێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر کارەکانی پیتەر ڤان دێر ڤێر. ئەم پیاوە یەکێک لە ئەنترۆپۆلۆژە ناسراوەکانی دونیایە و خاوەنی کۆمەڵێک کتێبی گرنگە لەسەر ئەنترۆپۆلیای دین و ناسیۆنالیزم، بۆ بواری کارەکانی بۆ ماوەیەکی درێژ لە هیندستان بوو،

بەڵام لە پازدە ساڵی ڕابردوودا هەم خۆی و هەم گرووپێک لێکۆڵەرەوە خەریکی دۆخی دینە لە چیندا. ئەو دەروازەیەی کە ئەم ئینسانناسە هۆڵەندییە بۆ ڕەخنەکردنی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت دەیگرێتە بەر، کارکردنە لە بواری چۆنیەتیی دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەی مۆدێرن و ڕۆڵی ناسیۆنالیزم لەم پرۆسەیەدا. لە کۆمەڵێک کتێبی گرنگدا ڤان دێر ڤێر نیشانی داوین دین هەم بەشێکی گرنگی دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەی مۆدێرنە، هەم بەشێکی گرنگی بزوتنەوە ناسیۆنالیستەکانی دونیایە. ئەمە هەم لەناو ئەورووپا و هەم لە دەرەوەی ئەورووپاشدا.[1] تیوریستە باڵادەستەکانی بواری ناسیۆنالیزم، بۆ نموونە: بێندیکت ئەندرسۆن و ئێرنست گێلنەر و ئێریک هۆبزباوم، لەدایکبوونی نەتەوە و ناسیۆنالیزم وەک دوو دیاردەی گرنگی ناو دونیای مۆدێرن دەبینن. بەڵام ئەوان دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەی مۆدێرن و دروستبوونی نەتەوە وەک چوارچێوەی نوێی شوناسی تاکەکەسی و دەستەجەمعی و هاتنەکایەی ناسیۆنالیزمیش، وەک دیاردەیەکی عەلمانی دەبینن. لای ئەم نووسەرانە نەتەوە و ناسیۆنالیزم، بە شێوەیەکی گشتی، شوێنی چوارچێوە دینییەکانی شوناس دەگرنەوە و بەمەش پێگەی دین لە دونیای مۆدێرندا لاواز دەکەن. نەتەوە و ناسیۆنالیزم دوای هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتە گەورەکانی

---

١ - بەتایبەتی بڕوانە ئەم دوو کتێبە:

Van der Veer, Peter (1994). Religious Nationalism: Hindus and Muslims in India. University of California Press

Van der Veer, Peter (2001). Imperial Encounters: Religion and Modernity in India and Britain. Princeton University Press.

مێژوو لەدایک دەبن، کە ئیمپراتۆریەتی دینیی بوون و دین بنەمای شوناسی سیاسی و فەرهەنگیی ناو ئیمپراتۆریەتەکان بووە. نەتەوە و ناسیۆنالیزم لەسەر وێرانەی ئەو زمانە ئیمپراتۆرییە جیهانییانەش دروست دەبن کە قسەیان پێ کراوە. هەموو ئەمانەش شوناسێکی نەتەوەیی نوێ دروست دەکەن کە نادینی و نایونیڤێرساڵییە.[1]

لەم تیورانەدا هەموو ئەو گۆڕانە گەورانەی لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەت و نەتەوەی مۆدێرندا دروست دەبێت ئاکارێکی عەلمانییانەیان هەیە. هەم دەوڵەتی مۆدێرن، هەم نەتەوە خۆی و هەم ناسیۆنالیزمیش، دەرکەوتی جیاوازی پرۆسەی بەعەلمانیبوونی دونیان. لەم تیورانەدا دین هیچ ڕۆڵێک لە دروستبوونی نەتەوە و ناسیۆنالیزم و دەوڵەتی نەتەوەی مۆدێرندا نابینێت. نەک هەر ئەمە بەڵکو ناسیۆنالیزم وەک ئەلتەرناتیڤی دین و نەتەوە وەک ئەلتەرناتیڤی گروپە دینییەکان و دەوڵەتی نەتەوەیی وەک ئەلتەرناتیڤی ئیمپراتۆریەتە دینییە گەورەکان وێنا دەکەن. ئەوەی پیتەر ڤان دێر لە زیاد لە کتێبێکدا ئەنجامی ئەدات ڕەخنەکردنێکی هەمەلایەنی ئەم ڕوانینانە و نیشاندانی ناڕاستیی ئەم وێناکردنە تایبەتەیە بۆ بێڕۆڵیی دین لە دروستبوونی نەتەوە و ناسیۆنالیزم و دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرندا. لە زیاد لە کتێبێکدا ئەم ئینسانناسە نیشانی ئەدات کە دین ڕۆڵێکی گرنگی لە دروستبوونی شوناسی نەتەوەیی بەشە

---

١ - بڕوانە:
Anderson, Benedict (1991). Imagined Communities: Reflections on the Origin and Spread of Nationalism. Verso.

جیاوازەکانی دونیادا بینیوە. لە پرۆسەی دروستکردنی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەییدا چەمکە دینییەکان و سرووتە دینییەکان و کەلەپوورە دینییەکان ئامادەن و سەرلەنوێ پێناسە کراونەتەوە و وەک بەشێکی گرنگی دروستکردنی ئەو دونیا مۆدێرنە خراونەتە کار. ئەم کارەش لە زۆربەی وڵاتانی دونیادا ڕووی داوە بە خودی وڵاتە ئەوروپییەکان خۆیانەوە. لە بەریتانیا و هۆڵەندا و ئەڵمانیا و ئیسپانیا و ئەوانی تردا، دین ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە لە دروستبوونی شوناسی نەتەوەیی و لە چۆنیەتیی دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرندا. دروستبوونی نەتەوە و ناسیۆنالیزم نەک نەبۆتە هۆی نەمان و پووکانەوەی گروپ و هێز و کەلەپوورە دینییەکان، بەڵکو هەموو ئەمانە بەشدارییەکی ڕاستەوخۆیان کردوە لە پرۆسەی دروستبوونی نەتەوەدا.[1]

هاوکات ڤان دێر ڤێر پێی وایە دین بەشدارییەکی گەورە و ڕاستەوخۆی کردوە لە دروستبوونی ئەو "ڕووبەرە گشتییەدا" کە بەشێکی گرنگ و سەرەکیی دونیای مۆدێرنە. لەم ئاستەدا ڤان دێر ڤێر ڕەخنەیەکی قووڵ و فراوان لە دید و بۆچوونەکانی هابرماز دەربارەی دروستبوونی "ڕووبەری گشتی" لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەگرێت، لای هابرماز دروستبوونی ئەم ڕووبەرە گشتییە پرۆسەیەکی عەلمانی و عەقڵانییە و هیچ هێمایەک بۆ ڕۆڵی دین لە دروستبوونی

---

١ - بڕوانە:

Van der Veer, Peter (1994). Religious Nationalism.

بەتایبەتی بڕوانە بەشی یەکەمی کتێبەکە (ل١-٢٦) کە ڕەخنەیەکی هەمەلایەنە لە دیدی ئەندرسون و گێلنەر و هۆبزباوم بۆ چۆنیەتیی دروستبوونی نەتەوە و ناسیۆنالیزم.

ئەم ڕووبەرە گشتییەدا ناکات. ڤان دێر ڤێر نیشانی ئەدات کە گروپە دینییە ڕەسمی و نارەسمییەکان، کۆمەڵە دینییە خۆبەخشەکان، بەشێکی گرنگی ئەو ڕووبەرە گشتییە بوون کە لە ئینگلتەرە و هینددا و لەمیانەی پەیوەندییەکی ئیمپراتۆرییانەی کۆلۆنیالیدا دروست بوون.[1]

خاڵێکی گرنگ لە نووسینەکانی ڤان دێر ڤێردا ئەوەیە کە پەیوەندیی نێوان ناسیۆنالیزم و دین وەک پەیوەندییەکی ئامرازی نابینێت، واتە ناوەڕۆکی ئەم مەسەلەیە وا نابینێت کە هێز و بزووتنەوە ناسیۆنالیستییەکان دین وەک ئامرازی جۆشوخرۆشدان و کۆکردنەوەی خەڵک لەدەوری ئەم یان ئەو داواکاریی نەتەوەیی بەکار دەهێنن. بە بۆچوونی ڤان دێر ڤێر: دین زۆر قووڵتر لە پرۆسەی دروستکردنی نەتەوە و دروستبوونی بزوتنەوەی نەتەوەییدا بەشدارە. دین بۆ نموونە: بەشدارە لە دروستکردنی کەسایەتی و شوناسی نەتەوەیی و لە کردەی فانتازیای نەتەوەی و پێناسەکردنی دوژمنانی نەتەوەدا. بەکورتی، دین لەناو پرۆژەی دروستکردنی نەتەوە و لەگەڵ هاتنەکایەی ناسیۆنالیزمدا نەک لاواز و بێڕۆڵ ناکەوێت، بەڵکو ئەوەی ڕوو ئەدات پرۆسەی بەنەتەوەییکردنی دینە. گۆڕینی ئایینە بۆ بەشێک لە شوناسی نەتەوەیی. بەم مانایە دروستکردنی نەتەوە و هاتنەکایەی ناسیۆنالیزم دین ناکەنە دەرەوەی پرۆسە مێژووییەکانەوە، بەڵکو دین لە ڕۆحە گەردوونییەکەی بەتاڵ دەکەنەوە و دەیکەنە دینێکی نەتەوەیی،

---

[1] - بڕوانە بەشی یەکەمی کتێبی:
Van der Veer, Peter (2001. Imperial Encounters: Religion and Modernity in India and Britain.

دەیکەن بە یەکێک لە پایە سەرەکییەکانی شوناسی نەتەوەیی، نەتەوە بە دینداری ڕاستەقینە و دوژمنانی نەتەوە بە بێدین ناو دەنێن. ئەمەش دیسانەوە تەواو ناکۆکە بەو گریمانە سەرەکییەی تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" کە باس لە لاوازبوون و پەراوێزبوون و بەناسیاسیبوونی ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا دەکات.

# سەرچاوەکان

Anderson, Benedict (1991). Imagined Communities: Reflections on the Origin and Spread of Nationalism. Verso.

Asad, Talal (1993). Genealogies of Religion: Discipline and Reasons of Power in Christianity and Islam. Johns Hopkins University Press.

Asad, Talal (2003). Formations of the Secular: Christianity, Islam, Modernity. Stanford University Press.

Aasd, Talal (2005). Reflections on secularism and public sphere. Social Science Research Council, Items and Issues Volume 5, Number 3.

Van der Veer, Peter (1994). Religious Nationalism: Hindus and Muslims in India. University of California Press

Van der Veer, Peter (2001). Imperial Encounters: Religion and Modernity in India and Britain. Princeton University Press.

## دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٤)
# پیتەر بێرگەر و تیزەی بەناعەلمانیبوونی دونیا

### سەرەتا

پیتەر بێرگەر یەکێکە لەو کۆمەڵناسانەی لە ساڵانی شەست و هەفتادا بەرگرییەکی گەورە لە تیزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەکات، بەڵام دواتر و دوای ڕەخنەکردنی ئەم تیزە لەلایەن زۆر کۆمەڵناس و ئینسانناسی بواری دینەوە، ئەویش ڕای دەگۆڕێت و لە زۆرێک لە بۆچوونەکانی پێشووی پاشگەز دەبێتەوە. ئەوەی خوێنەر لێرەدا دەیخوێنێتەوە کورتەیەکی دیدی ئەم کۆمەڵناسەیە بۆ مەسەلەی ئامادەگیی دین لە دونیای مۆدێرندا.

### کێشەی دین لە دونیای ئەمڕۆدا

ئەم کۆمەڵناسە گرنگە لە یەکێک لە وتارەکانیدا سەبارەت بە خودا لە دونیای ئەمڕۆدا دەنووسێت: "کێشەی دین لە دونیای ئەمڕۆدا ئەوە نییە کە خودا مردوە، بەڵکو ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر خودا هەن".[1] ئەم ڕاستییەی پیتەر

---

١ - بڕوانە:

بێرگەر کە لە ساڵی ٢٠١٤ نووسیویەتی، دەربڕی ئەو دیدە سۆسیۆلۆژییەیە کە بە درێژایی ساڵانی هەشتا و نەوەد لە بواری سۆسیۆلۆژیای دیندا، کاری لەسەر دەکات لە دەرەنجامیشدا دوو کتێبی گرنگی لێ دەکەوێتەوە. یەکەمیان کتێبی "بەناعەلمانیبوونی جیهان: سەرهەڵدانەوەی دین و سیاسەتی جیهان" کە لە ساڵی ١٩٩٩دا بڵاوی دەکاتەوە.[١] دووهەمیان کتێبی "مەعبەدە جیاوازەکانی مۆدێرنە: بەرەو پارادیمێکی نوێ بۆ دین لە سەردەمێکی پلورالدا"، کە لە ساڵی ٢٠١٤ بڵاوی دەکاتەوە.[٢] کتێبی یەکەمیان کتێبێکی هاوبەشە و لەگەڵ کۆمەڵێک لەو زانایانەدا نووسراوە کە لەبواری کۆمەڵناسی و ئینسانناسیی دیندا کار دەکەن، کتێبەکە لە ڕووی تیورییەوە شتێکی تازەی تێدا نییە و بەشی زۆری ئەو بۆچوونانەی لەو کتێبەدا لەسەر پێگەی دین لە دونیای ئەمڕۆ و لەسەر ڕەخنەکردنی تیزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەدوێن، پێشتر زۆر نووسەر و زانای سیاسی و کۆمەڵایەتیی تر باسیان کردووە.

بەڵام ئەوەی پیتەر بێرگەر لەو کتێبەی تردا بە ناونیشانی

---

Berger, Peter (2014). The political management of pluralism. Society. Volume 51, Issue 6, p 602.

1 -Berger,Peter (1999). The desecularization of the world: resurgent religion and world politics. Washington, DC : Ethics and Public Policy Center ; Grand Rapids, MI : Eerdmans

٢ - بڕوانە:

Peter Berger (2014). The many altars of modernity. Toward a paradigm for religion in a pluralist age. De Gruyter Mouton

"*بەناعەلمانیبوونــی جیهــان: ڕوانگەیەکــی گلۆبالــی*"، دەیڵێت دیدێکی تـازەی تێدایـە بـۆ چۆنیەتیی شـیکردنەوە و ڕاڤەکردنی مۆدێرنـە. ئـەم کۆمەڵناسـە لـە پێشـەکیی کتێبەکـەدا پـێ لەسـەر ئـەوە دادەگرێت کە تێزەی "بەعەلمانیبوونـی دونیا" تێزەیەکی ناڕاسـتە و دونیـا لـە کۆتاییەکانـی سـەدەی بیسـتەمدا پـڕە لـە دیـن، چەنـد جێیەکـی کەمـی لـێ دەر چێـت، لەوانـەش هەندێـک کۆمەڵـگای ئەورووپـی، دەنـا لـە هەمـوو شـوێنێکدا دونیـا بـە هەمـان ڕادەی دونیـای کـۆن و لـە هەندێـک شوێنیشـدا زیاتـر لـە دونیـای کـۆن دینـی تێدایـە.[1] پیتـەر بێرگـەر دەڵێـت تێـزەی "بەعەلمانیبوونی دونیـا" وەک تێزە زۆر ئاسـان و سـادەیە، ئـەم تێـزە دەڵێـت: "بەمۆدێرنبـوون دەبێتـە هـۆکاری لاوازبـوون و کەمبوونـەوەی دیـن، هـەم لەنـاو کۆمەڵگادا و هـەم لـە زەینـی تاکەکەسـەکاندا". پیتـەر بێرگـەر دەڵێـت بەکۆنکریتـی ئـەم بۆچوونەیـە کـە بۆچوونێکـی ناڕاسـتە و دۆخـی دیـن لـە دوو سـەدەی ڕابـردووی جیهانـدا ڕاسـتیی ئـەم تێـزە ناسـەلمێنێت.[2]

بـەڵام بـۆ شـیکردنەوەی ڕوانینەکانـی پیتـەر بێرگـەر بـاس لـە هەندێـک مەسـەلەی تایبەتـی دەکات. یەکەمیـان پێـی وایـە نکوڵـی لـەوە ناکرێـت کـە چەنـدان ڕەهەنـدی تایبەتیـی ژیانـی کۆمەڵایەتیی بەعەلمانیبـوون، بـەڵام هـاوکات نیشانیشـی ئـەدات کـە لـە دونیـای مۆدێرنـدا هـەم کاردانـەوەی دینـی بـە ڕووی عەلمانیەتـدا هەبـووە و هـەم ئەمـەش بۆتـە هـۆی دروسـتبوونی

---

١ - بڕوانە:
Peter Berger (1999). The desecularization of the world:
بەتایبەتـی ل ٢-٣-٤

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣

بزوتنەوەی دینیی بەهێز. دووهەم، دەشێت مەسەلەی بەعەلمانیبوونی دونیا لە ئاستی کۆمەڵایەتی و دەزگاییدا ڕوو بدات، بەڵام مەرج نییە دابەزێت بۆ ئاستی هۆشیاریی تاکەکەس، واتە دەشێت تاکەکەس بوونەوەرێکی دینی بێت، بەڵام لەناو دونیایەکی کۆمەڵایەتی و دەزگایی عەلمانیدا بژی. ڕاستە لە دونیای مۆدێرندا کۆمەڵێک دەزگای دینیی ئەو دەسەڵات و هێزەی جارانیان نامێنێت و نەماوە، بەڵام باوەڕ و هەڵسوکەوتە دینییە کۆن و تازەکان بە شێوازی جیاواز لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی تاکەکەسەکاندا بەردەوام بوون. هەندێک جاریش ئەو باوەڕ و هەڵسوکەوتانە فۆرمی دەزگایی نوێ دەگرنە خۆیان و هەندێک جاریش فۆرمی حەماسەتێکی دینیی پڕ تەقینەوە. بەکورتی پەیوەندیی نێوان دین و مۆدێرنە بەو سادەییە نییە کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا باسی دەکات، بەڵکو پەیوەندییەکی ئاڵۆز و فرەشێوەیە.[1]

### مۆدێرنە و بەرهەمهێنانی گومان

پیتەر بێرگەر لەم نووسینەدا باس لە گەڕاندنەوەی بزووتنەوە ئوسوڵییە دینییە داخراو و کۆنەپارێزەکان دەکات و پێشی وایە یەکێک لەو هۆکارانەی وا دەکات ئەم بزوتنەوانە ڕەواج و کڕیاریان هەبێت: ئەو ڕاستییەیە کە مۆدێرنە بەردەوام پەیوەست بووە و پەیوەستە بە بەرهەمهێنانی "گومان و نادڵنیاییەوە". مۆدێرنە لای پیتەر بێرگەر ئەو هێزەیە کە "هەموو دڵنیاییە کۆن و تەقلیدییەکانی تەواو لاواز دەکات، لە

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣

کاتێکدا گومان و نەبوونی دڵنیایی دۆخێکە زۆر کەس بەلایانەوە زەحمەتە تیایدا بژین، لەبەر ئەوە هەر بزووتنەوەیەک، نەک تەنها بزووتنەوە دینییەکان، مژدەی ئەوە بدات کە دڵنیاییی تازە دەبەخشێت، بازاڕێکی حازر و گەرمی دەبێت."[1]

کتێبی دووهەمیان، "*مەعبەدە جیاوازەکانی مۆدێرنە: بەرەو پاراداێمێکی نوێ بۆ دین لە سەردەمێکی پلورالدا*"، کتێبێکی گرنگە و تیایدا پیتەر بێرگەر تێزێکی نوێ لەباتیی تێزی "بەعەلمانیبوونی دونیا" پێشنیار دەکات بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتن لە دونیای مۆدێرن. لە سەرەتای کتێبەکەدا پیتەر بێرگەر جارێکی تر ناکۆکبوونی خۆی بەرانبەر بە تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا"، Secularization theory, دەر دەبڕێت و بە تێزەیەکی ناڕاست یان تەواو نوقسانی دەزانێت بۆ تێگەیشتن لە مێژووی مۆدێرنە لە سەدەی هەژدەهەمەوە تا ئەمڕۆ. بێگەر تێزی "بەعەلمانیبوون" وەک تێزێک دەناسێنێت کە پێی وایە: "مۆدێرنە بەحەتمی دەبێتە هۆی لاوازبوون و پەراوێزکەوتنی دین."[2] ئەمەش مانای ئەوەی کۆمەڵگا چەندە تازە ببێتەوە، پایەکانی مۆدێرنە چەندە بەهێزتر ببنەوە، ئەوەندە کاریگەریی دین لەسەر ژیانی تاکەکەسی و ژیانی دەستەجەمعی کەم دەبێتەوە، دین پەراوێز دەکەوێت و هێز و دەسەڵاتی خۆی لەدەست ئەدات. بەکورتی، ئەم ڕوانینە پەیوەندییەکی پێچەوانە لەنێوان دین و مۆدێرنەدا گریمان دەکات. پیتەر بێرگەر پێی وایە ئەم ڕوانینە بۆ مۆدێرنە و بۆ

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧

2 -Peter Berger (2014). The many altars of modernity.١ ل

پێگەی دین لەناو مۆدێرنەدا گەرچی ماوەیەکی درێژ ڕوانینی باڵادەست بوو و وەک پارادایمێکی بەهێز بۆ لێکۆڵینەوەی دین لە دونیای مۆدێرندا کاری دەکرد، بەڵام ڕوانینێکی هەڵەیە. چونکە کاتێک سەیری دونیای ئەمرۆ دەکەین و لە دۆخی دین لەم دونیایەدا ڕادەمێنین، ناتوانین چیدی ئەم پارادایمە پەسەند بکەین. ئەوەی پێویستە داهێنانی "پارادایمێکی نوێ"یە، کە بتوانێت پایەکانی لەسەر ئەو دەرنجامانە دارشتبێت کە لە کردەی ئاڵۆزبوون و بەپلورالبوونی دونیاوە دروست بووبێت. پیتەر بێرگەر بە ئەرکی خۆی دەزانێت لەو کتێبەدا هێڵە گشتییەکانی ئەم پارادایمە نوێیە دەستنیشان بکات.[1]

## دونیایەکی پلورال نەک دونیایەکی عەلمانی

بە بۆچوونی ئەم نووسەرە ئەم پارادایمە تازەیە دەبێت سەروکاریی لەگەڵ ئەو دۆخی پلورالیزمەدا بێت کە دونیای ئەمڕۆی تێکەوتووە، بەتایبەتیی دوو شێوازی تایبەتیی پلورالیزم کە ئەم نووسەرە بە گرنگیان دەزانێت. یەکەمیان ئامادەبوون و پێکەوەبوونی زیاد لە دینێکە لەپاڵ یەکدا. دووهەم ئامادەگیی دینە لەپاڵ عەلمانیەتدا. پیتەر بێرگەر پێی وایە ئەم دۆخی پێکەوەبوونەی دینە جیاوازەکان لەپاڵ یەکدا و پێکەوەبوونی دین و عەلمانیەت بەیەکەوە هەم بەشێکە لە ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگاکانی ئەمرۆ، هەم بەشێکە لە زەین و هۆشیاریی تاکەکەسەکانی ناو ئەو

---

١ -هەمان سەرچاوە پێشوو ل ١

جیهانەش.[1] مرۆڤی ئەمڕۆ لە دونیایەکدا دەژی کە تەنانەت لەناو یەک کۆمەڵگاشدا هەم دینە جیاوازەکان لەپاڵ یەکدا دەبینێت و ئەزموون دەکات، هەم ئامادەگیی دینەکان لەپاڵ ڕوانین و ئەخلاقیاتە نادینی و دژەدین و فۆرمە جیاوازەکانی بەعەلمانیبوونی دونیادا، دەبینێت. واتە دۆخی دونیا ئەمڕۆ دۆخێکی تەواو پلورال و فرەجۆرە، هەم دینی فرەجۆری تێدایە، هەم شێوازی فرەجۆری نادین و ئەمانەش یان بەچڕی لەپاڵ یەکدا لەناو یەک کۆمەڵگادا ئامادەن، یان بەهۆی تەکنۆلۆژیای پەیوەندییەوە بوون بە بەشێک لە دونیایەکی بچووکی بەگلۆباڵبوو. پیتەر بێرگەر پێی وایە مێژووی مۆدێرنە خۆیشی بریتییە لە مێژووی دروستکردنی شێوازە جیاوازەکانی پلورالیزم. بەبێ ئەوەی بەدرێژی لەسەری بوەستێت، ئەم کۆمەڵناسە، باس لە دروستبوونی شار دەکات وەک ئەو ڕووبەرە کۆمەلایەتییە تازەیە کە پلورالیزمی تێدا دروست دەبێت، بەتایبەتی لە شارەکانی ناو دونیای مۆدێرندا. لەم شارانەدا دوو بکەری پلورالیزم لە فۆرمی "چاپخانە" و "ماشێنی هەڵمین"دا دەبینێت و وێنا دەکات، کە هەردووکیان بە شێوازی جیاواز پەیوەندیی نێوان ڕوانین و بەش و مرۆڤە جیاوازەکان پتەو و بەهێز دەکات.[2]

لە سەرەتای کتێبەکەیدا باسیش لەوە دەکات کە مەبەستی ئەو لە پلورالیزم ئەو ڕوانینە فەلسەفییە نییە کە فەیلەسوفەکان باسی دەکەن. پلورالیزم وەک دیاردەیەک مامەڵە ناکات کە

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥

لەناو زەین و خەیاڵی ئەم یان ئەو فەیلەسوفدا ئامادەیە، بەڵکو وەک واقیعێکی ئیمپیری، واتە واقیعێکی ئەزموونکراو لە کۆمەڵگادا، بەتایبەتی لەلایەن خەڵکە ئاسایی و سادە و گشتییەکانەوە، نەک لە زەینی چەند نووسەر و فەیلەسوف و ڕۆشنبیرێکدا. پلورالیزم وەک وەسفکردنێی سادەی ڕاستییە کۆمەڵایەتییەکان. مێژووی ئەم ڕوانینەش بۆ پلورالیزم لە فیکری هاوچەرخدا، واتە مێژووی ڕوانین بۆ پلورالیزم وەک هەقیقەتێکی کۆمەڵایەتی و وەک بەشێک لە هۆشیاریی تاکەکەسەکان، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم.[1]پیتەر بێرگەر پلورالیزم لە دیدە کۆمەڵناسییەکەوە بەم جۆرە پێناسە دەکات: "فرەشێوەیی ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەیە کە خەڵکانێکی سەر بە گروپی ئەتنیی جیاواز، خاوەنی دونیابینیی جیاواز، خاوەنی ئەخلاقیاتی جیاواز، لە ئاشتیدا بەیەکەوە دەژین و مامەڵەی دۆستانەی یەکتر دەکەن."[2] ئەم مەسەلەی "مامەڵەکردنە دۆستانەیە" مەسەلەیەکی گرنگە، چونکە ناکرێت باس لە پلورالیزم بکەین گەر خەڵکی جیاواز بەتەنیشت یەکەوە بن، بەڵام قسە لەگەڵ یەکتریدا نەکەن، یان وەک ئاغا و کۆیلە مامەڵەی یەکتر بکەن، هەندێک سەرقەربن و هەندێک کۆیلە، یان هەریەکێکیان لە گیتۆی تایبەت بە خۆیدا و بەدابڕاوی لەوانی تر بژی و تاقە مامەڵەیەکی هاوبەش لەگەڵ یەکتریدا هەیانبێت ئاڵوگۆڕی ئابووری بێت. بۆ ئەوەی پلورالیزم هەبێت و دینامیکیەتە

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١

ناوەکییەکەی تەواو بکەوێتە کار، پێویستە دیالۆگ و قسەکردنی بەردەوام هەبێت لەگەڵ یەکتریدا، لەسەر چەندەها بابەت و مەسەلەی جیاواز.[1] پلورالیزم دۆخێک دروست دەکات تیایدا ڕێژەگەرایی، هەستکردن بەوەی کە شێوازی تری ڕوانین بۆ واقیع و شێوازی تری ئەزموونکردنی واقیع بوونی هەیە، دەبێت بە ئەزموونکردنێکی بەردەوام.[2]

**پلورالیزمی هۆشیاری**

ئەو خاڵەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە پلورالیزم تەنها بەشێک نییە لە نەخشەی کۆمەڵایەتیی دونیای ئەمڕۆ، واتە تەنها کۆمەڵێک ڕووداو و پرۆسەی جیاواز نییە، تەنها بوون و ئامادەگیی چەندان دەزگا و سیستمی ڕێکخراوەیی جیاواز نییە، بەڵکو بەشێکیشە لە هۆشیاری و لە زەینی تاکەکەسەکاندا ئامادەیە، یان بەشێکە لە دۆخێکی عەقڵی و ویژدانی کە هێما بۆ بوونی بەها و نرخی جیاواز و ئامادەگیی دونیابینی و ڕوانینی جیاواز دەکات. بە مانایەکی دیکە هەستکردن و هۆشیاربوون بەوەی مرۆڤ نەک تەنها لە دونیایەکی تەواو پلورال و پڕ جیاوازیدا دەژی، بەڵکو گواستنەوەی ئەم پلورالیزم و جیاوازییانە بۆ ناو زەین و هۆشیاریی خۆی، بەشێکە لە ئاکارە سەرەکییەکانی مۆدێرنە. پیتەر بێرگەر پێی وایە تەنانەت لەناو زەینی دیندارترین مرۆڤیشدا چەندان پاناتیی عەلمانیی هەیە کە لە بوارە جیاوازەکانی ژیانیدا بەکاریان دەهێنێت. واتە زەینی

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣س

مۆدێرن زەینێکی پڕ جیاوازییە لە ناوەوەی خۆیدا، دین و نادین پێکەوە لەناو ئەو زەینەدا ئامادەن.

دوو تێزی سەرەکیی تری پیتەر بێرگەر لەم کتێبەدا، کە گرنگە هێمایەکی خێرایان بۆ بکەین. یەکەمیان ئەوەیە کە یەک ڕێگا بەرەو مۆدێرنە و بەرەو تازەبوونەوە لەئارادا نییە، بەڵکو زیاد لە ڕێگایەک هەیە. ئەمەش لە ڕێگای گەڕاندنەوەوە بۆ بۆچوونەکانی ئەلفرێد شوتز،Alfred Schutz باس دەکات، ئەلفرێد شوتز باس لە "فرەواقیعی" دەکات، "multiple realities"، واتە باس لە بوونی زیاد لە واقیعێک لەناو واقیعدا دەکات و بەمەش هێما بۆ بوونی هۆشیارییەکی تێکەڵ و ئاڵۆز دەکات کە تیایدا بۆ نموونە دین و نادین پێکەوە لەپاڵ یەکدا و لەناو زەیندا بونیان هەبێت.

نووسەرێکی دیکە کە پیتەر بێرگەر بۆی دەگەڕێتەوە "شموێل ئایسنستاد"ە Shmuel Eisenstadt. ئەم پیاوە خاوەنی ئەو تێزەیە کە پێی وایە ناکرێت لە دونیای هاوچەرخدا باس لە بوونی یەک مۆدێرنە بکەین، بەڵکو زیاد لە مۆدێرنەیەک هەیە و زیاد لە ڕێگایەکیش بۆ چوونە ناو دونیای مۆدێرنەوە لەئارادایە. ئەو چەمکەی کە لەم بوارەدا بەکاری دەهێنێت بریتییە لە چەمکی "فرەمۆدێرنەیی"" multiple modernities."، عەلمانیەت دەشێت یەکێک لە ڕێگاکان بێت بۆ تازەبووەوەی دونیا و تازەبوونەوەی کۆمەڵگا، بەڵام هەموو ڕێگاکان نییە. شێوازی تری مۆدێرنە و ڕێگای تری مۆدێرنبوون بوونیان هەیە، کە تیایاندا دین لاواز نابێت، یان ئەو ڕۆڵە پەراوێزییە نابینن کە

تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا باسی دەکات.[1] بەکورتی ئەوەی پیتەر بێرگەر باسی دەکات ئەوەیە ئەگەر تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا نەتوانێت دروستبوونی دونیای ئەمڕۆمان بۆ لێک بداتەوە، ئەوا تیوریەکی ترمان پێویستە و ئەو تیورەیەش ناو دەنێت: "تیورەی پلورالیزم."

**دونیای تەقلیدی و دونیای مۆدێرن**

پیتەر بێرگەر پێی وایە یەکێک لە جیاوازییە سەرەکییەکانی دونیای مۆدێرن و دونیای بەر لە مۆدێرن مەسەلەی ئامادەگیی عەلمانیەت لە یەکەمیاندا و غیابی لە دووهەمیاندا نییە، بەڵکو لەوەدایە پلورالیزم لە دونیای مۆدێرندا دیاردەیەکە زۆر بە فروانتر لەئارادایە، لەڕاستیدا پلورالیزم لەم دونیایەدا لە هەموو شوێنێکدایە. پرۆسەی تازەبوونەوەی دونیا پرۆسەیەکە بە پلەی یەکەم جیاوازی و پلورالیزم بەرهەم دەهێنێت کە ئەگەری هەڵبژاردنی ئازاد لەبەردەم تاکەکەس و گروپەکاندا دەکاتەوە. بەڵام وەک پیتەر بێرگەر دەڵێت هەڵەی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا لەوەدایە کە پێی وایە ئەو هەڵبژاردنانە هەمیشە هەڵبژاردنێکی عەلمانیانە دەبن، هەڵبژاردنێک دەبن نادینی یان دژ بە دین، لە کاتێکدا مێژووی ئەم دوو سەدەیەی دوایی نیشانی داوە کە بڕێکی گرنگی ئەو هەڵبژاردنانە هەڵبژاردنی دین بوون. بە جۆرێک مرۆڤەکان و کۆمەڵگاکان دیندارتر بوون، یان لانی کەم دین دەبێتە یەکێک لە هەڵبژاردنەکانیان. بەم جۆرە مەسەلەی دروستبوونی

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو لXI

جیاوازی و پلورالیزم، کە بە جۆرێک لە جۆرەکان پێدراوێکی حەتمیی هاتنی مۆدێرنەیە، دەشێت هەڵبژاردنی دین بەشێک بێت لە ئەگەرەکانی هەڵبژاردن.[1]

لەم ڕوانگەیەوە مۆدێرنە لە یەک کاتدا هەم هۆشیاریی دینی و هەم هۆشیاریی نادینی دروست و بڵاو دەکاتەوە، دونیا لە دەرکەوتێکیدا دینییە و بەڵام لە دەرکەوتێکی دیکەیدا عەلمانییە. ئەوەی بەلای بێرگەرەوە گرنگە چۆنیەتیی جێکردنەوەی ئەم دوو دونیا و دوو دونیابینییەیە لەناو یەک زەیندا، لەناو یەک هۆشیاریدا و لەناو یەک سیستمی سیاسییشدا. هۆشیاریی مۆدێرن بەم مانایە نە هۆشیارییەکی عەلمانیی سەد دەر سەدە، نە هۆشیارییەکی دینییە، بەڵکو تێکەڵێکە لە هەردووکیان. لەم ڕووەوە دەنووسێت: "تاکەکەسی مۆدێرن هەم توانای کۆکردنەوەی پێناسەی دینی و هەم پێناسەی نادینیی واقیعی بەیەکەوە و لەناو یەک هۆشیاریدا هەیە. بەپێی هەلومەرجی تایبەتیش هەر جارەی بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە."[2] پیتەر بێرگەر بۆ سەلماندنی ئەم بچوونە بەتایبەتی ئەو پەیوەندییە باس دەکات کە لەنێوان نەخۆشی و هەردوو شێوەکەی هۆشیاریدا دروست دەبێت. ئەوەی نەخۆش دەکەوێت دەیەوێت بچێتە لای باشترین دکتۆرەکان و تازەترین دەسکەوتەکانی زانست لەو بوارەدا تاقی بکاتەوە، بەڵام هاوکات نوێژیش دەکات و لە خودا دەپاڕێتەوە بۆ شیفا.

خاڵێکی تر کە پیتەر بێرگەر بەرگریی لێ دەکات لە مەسەلەی پلورالیزمدا ئەوەیە کە پلورالیزمی ناو واقیع،

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٠

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٧

گوتارە جیاواز و دەرکەوتە فرەجۆرەکانی، کاتێک شانسی ژیانی دەبێت کە لەناو زەینیشدا شوێنی خۆی کردبێتەوە، واتە زەینێکی پلورالیی دروست کردبێت. لای ئەم کۆمەڵناسە پەیوەندییەکی پتەو هەیە لەنێوان ئەوەی کە لە واقیعدا ڕوو دەدات و ئەوەش کە لە زەین و هۆشیاریی تاکەکەسەکاندا ڕوو دەدات، گوتارە دونیاییەکان بۆ ئەوەی بتوانن لە دونیادا بمێننەوە و کاریگەرییان هەبێت دەبێت ببن بە بەشێک لە زەینی تاکەکەسەکان. واتە پلورالیزم تەنها دەرکەوتی کۆمەڵایەتیی نییە، بەڵکو دەرکەوتی زەینی و هۆشیارانەشی هەیە. بۆ ئەوەی پلورالیزمی سیاسی بتوانێت بژی، پێویستە پلورالیزمێکی سایکۆلۆژی بوونی هەبێت، واتە پلورالیزم بووبێت بە بەشێک لە سایکۆلۆژیای تاکەکەس، لەناو هۆشیاری و دەروونیدا شوێنی خۆی کردبێتەوە.[1]

**دەرەنجام**

بەکورتی: پیتەر بێرگەر پێی وایە دونیای ئەمڕۆ دونیای بێدینی نییە، بەڵکو دونیای دوودڵی و گومانە، دونیایەکە بەشێکی زۆری ئەو دڵنیاییانەی کە لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا هەبووە لەدەستی داوە، زۆرێک لەو دەزگا و بونیادانەی کە جاران بێ هیچ پرسیارێک وەر دەگیران و قبووڵ دەکران، ئەمڕۆ لەبەردەم گوماندان. شێوازی نوێی زانیاری و شێوازی تری هەقیقەت هاتوونەتە پێشەوە کە لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا بوونیان نەبووە. ئەوەی ئەمڕۆ هەیە کۆمەڵگا و دونیای پلورالیزمە، دروستبوونی گومانیش یەکێکە لە دەرەنجامە

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٩-٦١

سـەرەکییەکانی بەپلورالبوونـی دونیـا. بۆیـە ئـەوەی ئەمـڕۆ پێوسـیتە: ڕێکخسـتن و ئیدارەدانـی گومـان و دوودڵییەکانـە، کۆمەڵگا دەبێت توانـای گرتنەئامێزی ئەو کەسـانەی هەبێت کە واقیـع و دونیـا بـە شـێوەیەک دەبینـن و پێناسـە دەکـەن لەگـەڵ بینیـن و پێناسـە باڵادەسـتەکاندا یـەک ناگرێتـەوە.[1]

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٦-٦٧

# سەرچاوەکان

Berger,Peter (1999). The desecularization of the world: resurgent religion and world politics. Washington, DC : Ethics and Public Policy Center ; Grand Rapids, MI : Eerdmans

Peter Berger (2014). The many altars of modernity. Toward a paradigm for religion in a pluralist age. De Gruyter Mouton

Berger, Peter (2014). The political management of pluralism. Society. Volume 51, Issue 6

# دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٥)

# هابرماز و کۆمەڵگای پۆست عەلمانیەت

# ڕۆڵی ئەخلاقی و سیاسییانەی دین

# دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٥)
# هابرماز و کۆمەڵگای پۆست عەلمانیەت
# ڕۆڵی ئەخلاقی و سیاسییانەی دین

**سەرەتا**

لـە پـازدە سـاڵی ڕابـردوودا فەیەلەسـوفی ئەڵمانـی: یورگـن هابرماز، گرنگییەکی تایبەت بە دین لە نووسینە فەلسەفییەکانیدا دەبەخشێت و لـە زیاد لـە بۆنـە و گوتارێکدا باس لـە ڕۆڵـی دیـن لـە دونیـای ئەمڕۆدا دەکات. لـە زۆر ڕووەوە ئـەم گرنگیدانـە بـە دین پێچەوانەی بیرکردنـەوە و نووسـیەکانی ئـەم فەیلەسـوفەیە تـا کۆتایـی سـاڵانی نـەوەد. لـەو قۆناغـەدا هابرمـاز دینـی وەک دیاردەیەکـی لاوەکیـی نـاو دونیـای مۆدێـرن تەماشـا دەکـرد و تێگەیشـتنی بـۆ ڕۆڵـی دیـن لـەو دونیایـەدا پابەسـتی تێـزەی "بەعەلمانیبوونـی دونیا" بـوو. بـەڵام لـە پازدە سـاڵی ڕابردوودا هابرمـاز لـە دوو ئاسـتدا بـاس لـە دیاردەی دیـن و خـوداناسـی دەکات، جیـاواز لـە نووسـینەکانی پێشـتری. یەکەمیـان ئاسـتی باسـکردنی ڕۆڵـی دینـە لـە ژیانـی گشـتیی کۆمەڵگادا. دووهەمیـان پەیوەندیـی نێـوان بـاوەڕی دینـی و عەقڵـی عەلمانیـی مۆدێرنـە. لـە یەکەمیانـدا هابرمـاز بەرگـری لـە دیـدی دیالۆگـی و کـاری

پێکەوەیی و کرانەوە بە ڕووی یەکتری و بە ڕووی بەشداریی دین لە ژیانی گشتیدا، دەکات. لە دووهەمیاندا بەرگری لە تێکەڵنەکردنی سنوورەکانی دین و سنوورەکانی مەعریفەی زانستیی بەیەکتری دەکات، بەڵام بەبێ ئەوەی دین بە ئەفسانە و خورافەت و سیحر یەکسان بکات و ڕووتی بکاتەوە لە هەموو توانایەک بۆ بەرهەمهێنانی هەقیقەت. بەم کارەشی هابرماز دین و خوداناسی دەهێنێتەوە ناو فەلسەفەی سیاسی و ناو تیۆرەی کۆمەڵایەتیی ڕەخنەیی.[1] لە هەردوو دۆخەکەدا ئەوەی لە فیکری هابرمازدا ڕوو دەدات دوورکەوتنەوەیەکی بەرچاوە لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا. ئەو چەمکەشی کە هابرماز بەکاری دەهێنێت بۆ قسەکردن لە دونیای ئەمڕۆ، چەمکی "پۆست عەلمانیەت"، یان "پۆست سێکلیور"ە.

**هابرماز و دین**

هابرماز بە فەیلەسوفێکی ڕۆشنگەر ناسراوە، پرۆژە فیکری و ڕەخنەیی و کۆمەڵایەتی و فەلسەفییەکەی وەک پرۆژەیەکی ڕۆشنگەرانە و کارەکانی وەک بەرگریکرن لە پرۆژەی

---

١ - ئەمە برێک لەو نووسینە سەرەکییانەی هابرمازە لەسەر دین:
... Habermas, Jurgen. 'Religion in the Public Sphere', European Journal of Philosophy, 14:1 (2006), pp. 1–25; Jurgen Habermas, 'Notes on a Post-Secular Society', signandsight.com (18 June 2008), Jurgen Habermas, Between Naturalism and Religion: Philosophical Essays (Cambridge: Polity Press, 2008); Jurgen Habermas and Joseph Ratzinger, The Dialectics of Secularization: On Reason and Religion (San Francisco: Ignatius Press, 2007); Jurgen Habermas et al., An Awareness of What is Missing: Faith and Reason in a Post-secular Age (Cambridge: Polity Press, 2011).

ڕۆشنگەری و مۆدێرنە دادەنرێت. هابرماز سەر بە نەوەی دووهەمی قوتابخانەی فرانکفۆرتە و یەکێکە لە ناوە فیکرییە گەورەکانی دونیای ئەمڕۆ. مەسەلەی پەیوەندیی نێوان عەقڵ و دین، باوەڕداری و بێباوەڕی، بەشێک بووە لەو بابەتانەی بەهۆیەوە تیوریزەی مۆدێرنە و هاتنەکایەی دونیای مۆدێرنی کردوە. بەڵام ئەم وەرچەرخانە تازەیە بەرەو گرنگیدان بە دین و خوداناسی لە دیدگایەکی تەواو تازەوە، ڕووداوێکی نوێی ناو گەشەی فیکریی ئەم فەیلەسوفە ئەڵمانییەیە. شارەزایەکی فیکری هابرماز، سێ قۆناغی سەرەکی لە چۆنیەتیی مامەڵەکردنی ئەم فەیلەسوفەدا بۆ دین لەیەکتری جیا دەکاتەوە.[1] یەکەمیان قۆناعی ساڵانی سەرەتا و کۆتایی هەفتاکانە، لەم قۆناغەدا هابرماز ئایین لەو ڕوانگەیەوە مامەڵە دەکات کە تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" گریمانی کردوە و وەک دیاردەیەکی لاوەکیی ناو دونیای مۆدێرن وێنای کردوە کە گوایە کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر فیکر و کردە و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی لە دونیای مۆدێردا نەماوە. ئەو چوارچێوە فەلسەفییەی لەم قۆناغەدا بۆ وێناکردنی دین و خوداناسی هەیبووە، چوارچێوەی تێگەیشتنی مارکسیزمە بۆ دین، واتە مامەڵەکردنی دینە وەک جۆرێک لە "هۆشیاریی هەڵە" و وەک قۆناغێکی نزم و گەشەنەکرد و لە گەشەی فیکری زانستی و فەلسەفی. لەم قۆناغەدا قسەکردنی هابرماز لەسەر دین بەشێک بووە لە ڕەخنەکردنی ئایدیۆلۆژیا

---

1 -Harrington, Austin (2007). Habermas and the 'Post-Secular Society'. European Journal of Social Theory. 10 (4). P. 543.

بەگشتی و بۆ ڕەخنەکردنی ئەو دیاردانەی کە لە دیدی هابرمازدا وەک ڕێگر لەبەردەم گەشەکردن و پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا دەوەستن. واتە ئەم قۆناغە قۆناغی بینینی دینە وەک جۆرێک لە فیکری هەڵە و جۆرێک لە خورافەت و ڕێگر لەبەردەم گەشەکردن و پێشکەوتنی فیکری و کۆمەڵایەتیدا.[1] قۆناغی دووهەمیان قۆناغی سالانی هەشتایە، تێزەی سەرەکیی ئەم قۆناغە بریتییە لە تێزەی "بەزمانکردنی موقەدەس"، Linguistification of the sacred، واتە مامەڵەکردنی موقەدەس وەک دروستکراوێک لەناو زمان و بەهۆی زمانەوە. لەم قۆناغەدا هابرماز لە مارکسەوە دەگوزێتەوە بۆ دورکهایم و لەپاڵ بۆچوونەکانی ئەم کۆمەڵناسە فەرەنسییەدا لە دین و موقەدەس ڕادەمێنێت.[2] دۆرکهایم موقەدەس وەک دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی سیحر و خورافەت نابینێت، بەڵکو وەک دەرنجامی پرۆسەیەکی هێمن و لەسەرخۆی بەعەقڵانیبوونی کۆمەڵگا وێنای دەکات، پرۆسەیەک بەرەو ئەوە گەشە دەکات ببێت بە بەشێک لە گوتارێکی دونیایی دەربارەی دروستکردنی ئەرگومێنتی ئەخلاقیی گەردوونی. تێزەی "بەزمانبوونی موقەدەس" لە جەوهەردا دووبارەکردنەوەیەکی تری تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیایە و داماڵینی بەرگی دینییە لە موقەدەس. لەم تێزەیەدا هابرماز دەیەوێت بڵێ لە دونیای مۆدێرندا موقەدەس لەوە کەوتووە ئینسان بترسێنێت، یان

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٤٢.

2 -Harrington, Austin (2007b). Habermas's Theological Turn. Journal for the Theory of social Behaviour 37:1. P45.

سـەرچاوەیەک بێت بۆ ترساندنی مرۆڤ و کۆمەڵگا. لە دونیای مۆدێرنـدا هـەم بیرکردنـەوەی خەڵـک و هـەم هەڵسـوکەوتیان چیتـر لەژێـر ڕەحمـەت و نیـگای موقەدەسـێکدا نییـە توانـای ئـەوەی هەبێت خەڵـک بترسـێنێت. چیـدی تـرس لـە موقـەدەس ئـەو هێـزە نییـە کـە بیرکردنـەوە و هەڵسـوکەوتی ئینسـانەکان ئاراسـتە بـکات، ئـەوەی هەڵسـوکەوت و بیرکردنـەوەکان ئاراستە دەکات هەندێک مانا و بۆچوون و لێکدانـەوەی عەقڵین کـە بکرێـت شـەرعیبوون و نەبوونیـان ڕەخنـە بکرێت، بکرێـت زانسـتیبوون و نەبوونیـان پاسـادان بکرێت. لـە دیـدی هابرمـاز ئـەم گۆڕانـە لـە موقـەدەس و لـە پەیوەندیی نێوان موقـەدەس و مرۆڤـدا هەنگاوێکـە بـەرەو پێشـەوە. لـەم هەنـگاوەدا موقـەدەس گـۆڕاوە بـۆ ئەرگومێنتێـک کـە بکرێـت ڕاسـتی و ناڕاسـتییەکەی بسـەلمێندرێت.[1]

بەکورتی، ئەوەی هابرماز لێرەدا بەرگریی لێ دەکات ئەوەیە کە چیتر کۆمەڵگا گوێ لەو بەها و نۆرم و کەسانە ناگرێت کە بە ناوی موقەدەسێکەوە ئەدوێن نەکرێت پرسیار و گومانی لێ بکرێت، نەکرێت عەقڵانیبوون و نەبوونیان بسەلمێندرێت، یاخود هێزێک ئەم موقەدەسە بپارێزێت کە خۆی وەک هێزی پارێزگاریکردن لە موقەدەس بناسێنێت و نەکرێت گومان لە ناوەرۆک و بۆچوون و لێکدانەوەکانی بکرێت. هابرماز پێی وایە لە ڕێگای پرۆسەی "بەزمانبوونی موقەدەس"ەوە ئینسان پەنا بۆ بەرخورد و لێکدانەوە عەقڵانییەکان دەبات، موقەدەس

1 -Harrington, Austin (2007). Habermas and the 'Post-Secular Society' ل ٥٤٤

خۆشی دەبێت بە زمان و وەک هەموو دیاردەیەکی زمانەوانییش دەکرێت لە مانا و ناوەرۆک و بەهانەکانی بکۆڵدرێتەوە و ڕاستیودروستییەکانی دەستنیشان بکرێت.

قۆناغی سێهەم، بریتییە لەو نووسینانەی کە هابرماز لەساڵی ٢٠٠١ەوە تا ئەم ساتە لەسەر دین و خوداناسی نووسیونی. لەم قۆناغەدا گەرچی هابرماز واز لە تێزەی "بەزمانبوونی موقەدەس" ناهێنێتو بڕێکی زۆر لە پێدراوەکانی دەهێڵێتەوە، بەڵام هاوکات لەباتیی قسەکردن لەسەر بەزمانبوونی مەقەدەس، باس لە "وەرگێڕانی ناوەرۆکە دینییەکان" دەکات. مەبەستی هابرماز لە "وەرگێڕانی ناوەرۆکە دینییەکان" تەرجەمەکردنی زمان و گوتارە دینی و خوداناسییەکانە بۆ زمان و گوتارێکی دونیایی کە بکرێت هەموو ئەوانەش کە دینێکی جیاواز، یان بێدینن، لە خواست و دید و تێڕوانینی ئەو کەس و گروپ و گوتارە دینییانە تێبگەن. لەمەدا هابرماز پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە ئەگەر گوتارە دینییەکان بە زمانی دین خۆی و بە زمانی خوداناسیی نەنووسرێن دەشێت هەڵگری ناوەرۆکێکی عەقڵانی بن و بەکەڵکی دونیای ئەمڕۆکە بێن. هابرماز لێرەدا باس لە دروستکردنی پردێک دەکات لەنێوان زمانی دینیی گوتارە ئایینییەکان و زمانی عەلمانی و ڕۆژانەی کۆمەڵگادا. ئەم تێزی "تەرجەمەکردن"، یان وەرگێڕانە، تێزی تازەی هابرمازە بۆ جێکردنەوەی دین لە "مەجالی گشتی"دا و بۆ بەشداریکردنی دین لە گفتوگۆ سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی ناو کۆمەڵگادا. هابرماز ئەم کردەی وەرگێڕانەی ناوەرۆکە دینییەکان بۆ ناوەرۆکێک کە کەس و

بەشە نادینییەکانی ناو کۆمەڵگا لێی تێبگەن بە "واجب" یان "ئەرکێکی ئەبستیمی" دەزانێت، 'epistemic duties'، واتە بە ئەرکێکی مەعریفی.[1] لە ساڵی ٢٠٠١ بەدوا هابرماز بە گژ دوو شێواز لە بیرکردنەوەدا دەچێت، یەکەمیان ئوسوڵیەتی دینییە، ئەوی تریان عەلمانیەتی پەڕگیرە. هابرماز لە نووسینێکی بەناوبانگیدا لە ساڵی ٢٠٠١ داوای پێگەیەکی مامناوەند دەکات لەنێوان ئۆتۆدۆکسیەتی ئوسوڵیەتی دینی و متمانە و باوەڕی فووتێکراوی تازەبوونەوەیەکی عەلمانیانەیە. ئەمەش بە مانای گەڕاندنەوە بۆ ئەو کەلەپوورە دینییەی کە هەیە و هەوڵدان بۆ سەرلەوێ نرخاندنەوەی، بەبێ ئەوە سنوورەکانی دین و مەعریفەی زانستی بەیەکتری تێکەڵ بکرێن.[2]

ئێستا با کەمەکێک زیاتر لەسەر "تێزەی وەرگێڕانی ناوەرۆکە دینییەکان" بۆ زمانێکی نادینی بوەستین.

**وەرگێڕانی ناوەرۆکە دینییەکان بۆ زمانێکی دونیایی**

هابرماز لە وتاری "دین لە مەجالی گشتیدا" باس لە دوو مەسەلەی سەرەکی دەکات. یەکەمیان چۆنیەتیی پارێزگاریکردن لە سەرەتاکانی سیستمی دیموکراسیی لیبرال و ڕێزگرتنی ئەو داخوازییانەی کە دروستکردنی سیستمێکی لەو بابەتە پێویستی پێیەتی. دووهەم پێداویستیی دەستەبەرکردنی بەشداریی سیاسیی ئەو هاوڵاتییانەی کە دین بنەمای بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٤٤

2 -Harrington, Austin (2007b). Habermas's Theological Turn. ل ٤٦

ئەخلاقییانە. واتە مەسەلەکە لای هابرماز هەر لە سەرەتاوە دوو ڕەهەندی هەیە، لە سەرێکەوە پەیوەستە بە پارێزگاریکردن لە سیستمی دیموکراسیی لیبرالیدا، لە سەرێکی ترەوە مەسەلەی چۆنیەتیی بەجیدیوەرگرتن و دەستەبەرکردنی بەشداریی سیاسیی هاوڵاتیان و هێزە دینییەکانە. لە پاراستنی پرنسیپە سەرەکییەکانی دیموکراسییەتی لیبرالیدا هابرماز باس لە گرنگیی بێلایەنیی دەوڵەت لە بواری دینیدا دەکات. هەروەها بەرگری لەوەش دەکات کە دەزگاکانی حوکمڕانی نابێت لۆژیک و عەقڵیەتێکی دینیی بیانبات بەڕێوە، واتە دەزگا سیاسییەکانی حوکمڕانی نابێت دەزگای دینی بن یان خواست و ویستی دینێکی تایبەت ئاراستەیان بکات. لەم ڕووەوە هابرماز دوو جۆر "مەجالی گشتی" لە یەکتری جیا دەکاتەوە، یەکەمیان "مەجالی گشتیی ڕەسمی"یە، کە لە دەزگاکانی حوکمڕانیی وەک پەرلەمان و دادگا و وەزارەتەکان و دەزگا بیرۆکراتییەکانی دەوڵەتدا بەرجەستەیە. ئەوی تریان "مەجالی گشتیی ناڕەسمییە"، واتە سەرجەمی ئەو دەزگا و دامەزراو و ناوەندە گشتییانەی تر کە لە کۆمەڵگادا ئامادەن. بە بۆچوونی هابرماز نابێت لە یەکەمیاندا لۆژیکی دینی لۆژیکی کارکردنی ئەو دەزگایانە بێت، بەڵام لە دووهەمدا، لۆژیکی دینی دەتوانێت وەک دین بەشدار بێت لە سەرجەمی موناقەشە و کێبەرکێ و دیالۆگەکاندا. لێرەدا، واتە لە "مەجالی گشتیی ناڕەسمیدا" هاوڵاتییە دینییەکان دەتوانن بە لۆژیکی دینی بەرگری لەم یان لەو سیاسەتی دیارکراوی دەوڵەت بکەن، یان دژ بەم یان بەو سیاسەتی دەوڵەت بوەستنەوە. بەڵام هاوڵاتییە دینییەکان بۆ ئەوەی بتوانن قەناعەت بە هاوڵاتییە

نادینییەکان، یان ئەوانەی خاوەنی دینێکی ترن، یان دژ بە دینن، بهێنن، پێویستە ڕا و بۆچوونە دینییەکانیان تەرجەمە بکەن بۆ زمانێک کە هاولاتییەکانی تریش لێی تێبگەن و قبوولی بکەن. بۆ نموونە ئەو هاولاتییە دینییانەی کە دژ بە لەباربردنی منداڵن، ئەبێت هەوڵی ئەوە بدەن ئەو بۆچوونە دینییەیان کە دەڵێت "خودا دژ بە قەتڵی منالە لە سکی دایکیدا"بگۆڕن بۆ بۆچوونێکی بێلایەنی وەک "بەرگریکردن لە مافی ژیان"، یان بەرگریکردن لەوەی "هەموو بوونەوەرێک مافی هەیە ژیانی بپارێزرێت." لە یەکەمیاندا بەرگرییکەرەکە بە زمانی دین ئەدوێت، لە دووهەمیاندا بە زمانێکی گەردوونی، کە دەشێت کەسە نادینییەکانیش تێبگەن و قبوولی بکەن. یان لە دژایەتیکردنی ئەلکهول و خواردنەوەدا دژایەتییەکە وا نەبێت بە زمانە دینییەکە بگوترێت خودا حەرامی کردوە، بەڵکو بەو زمانە بێلایەنە نادینییە گشتییە بێت کە دەڵێت ئەلکهول کاریگەریی خراپ لەسەر تەندروستی و ئاستی بیکردنەوەی عەقڵانی دادەنێت. بەکورتییەکەی دینی و نادینی بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە بدوێن و دیالۆگ بکەن دەبێت بە زمانێکی گەردوونیی بێلایەن قسە بکەن کە زمانی دین نەبێت. بە بۆچوونی هابرماز هاولاتییە دینییەکان دەتوانن لە "مەجالی گشتیی نارەسمی"دا، واتە لە مەجالی میدیا و مەجالی کۆمەڵگای مەدەنی و مەجالی دیالۆگی سیاسیدا، بەرگریی لە بۆچوونی خۆیان بەو زمانە دینییەی کە هەیانە بکەن، بەلام لە "مەجالی گشتیی ڕەسمیدا" نابێت ئەو زمانە دینییە بەکار بهێنن، بەڵکو دەبێت ناوەرۆکی دینیی بۆچوونەکەیان تەرجەمە بکەن بۆ زمان و ناوەرۆکێکی نادینی. هێزێکی دینی دەتوانێت لەسەر

ڕادیۆ و تەلەفیزۆن و لە کۆڕ و کۆبوونەوە گشتییەکاندا ئەوە بڵێت کە لەباربردنی منداڵ حەرامە، چونکە خودا داوای ئەمەی کردوە، بەڵام نەتوانێت لە پەرلەماندا ئەو داوایە بەو شێوەیە بکات، بەڵکو دەبێت ئەو داوایە تەرجەمە بکات بۆ زمانێکی نادینی، کە بکرێت هەمووان لێی تێبگەن و قبوولی بکەن. هابرماز تا ئەو شوێنە دەڕوات کە بڵێت ئەم پرۆسەی تەرجەمەکردنەی زمانی دینی بۆ زمانێکی نادینی، نابێت هەمووی بخرێتە سەر شانی کەسە دینییەکان، بەڵکو دەبێت کەس و هاوڵاتییە نادینی و عەلمانییەکانیش هاریکاریان بن لە ئەنجامدانی ئەم کارەدا. بە بۆچوونی هابرماز گەیشتن بەم دۆخەش نەک تەنها پێویستی بە هاریکاریی هاوڵاتییە دینی و نادینی و دژەدینییەکان بەیەکەوە هەیە، بەڵکو ئەوە ئەرکی ئەوانە وەک هاوڵاتیی ئەو کارە ئەنجام بدەن. واتە ئەرکی دۆزینەوەی زمانێکی هاوبەش لەنێوان دین و نادیندا ئەرکی هەموو هاوڵاتییەکانە، بە دینی و نادینییشیانەوە. لە سەرێکەوە دەبێت هاوڵاتییە دینییەکان بێلایەنیی دەزگاکانی حوکمڕانیی بەرانبەر بەم یان بەو دین و عەقیدە قبووڵ بکەن، ئەو یاسا و سیاسەتانەی کە ڕووی لە هەموو کۆمەڵگایە نابێت شەرعیەتی خۆی لە دینێک لە دینەکانەوە وەر بگرێت، لە سەرێکی دیکەوە پێویستە هاوڵاتییە عەلمانییەکان بیرکردنەوەی دینی بەجیددی وەر بگرن و قورسایی دۆزینەوەی زمانێکی هاوبەش و تەرجەمەکردنی بەهانە دینییەکان بۆ بەهانەی نادینی، وەک بەشێک لە ئەرکی خۆیان وێنا بکەن. ئەمەش مانای دروستکردن و گەشەدان بە مەیل و عەقڵیەتێکی مەعریفیی تایبەت کە توانای دیالۆگ و لێکتێگەیشتنی دیدە

جیاوازەکانی هەبێت. بە بۆچوونی هابرماز بنەما ئەخلاقییەکانی سیستمێکی دیموکراسیی لیبرالی تەنها ئەو کاتە ئەتوانن دروست ببن کە جۆرێک لە "پرۆسەی فێربوون" دروست بووبێت، لەم پرۆسەیەدا هێزە جیاواز و ناکۆکەکان، بە دینی و نادینییانەوە، توانای ئەوەیان تیادا دروست بووبێت بتوانن گوێ لە یەکتری بگرن و یەکتری قبوول بکەن. واتە لەم پرۆسەی فێربوونەدا هەم دینییەکان و هەم عەلمانییەکان دەبێت زۆر شت، کە دروستکردنی سیستمێکی دیموکراسی پێویستی پێیەتی، فێر ببن. دینییەکان فێر ببن ڕەخنەگرانە لە خۆیان و بۆچوونەکانیان ڕابمێنن، ئەوە قبوول بکەن کە لەناو دینەکانی تر و لەناو نادینیشدا هەقیقەت هەیە، فێر ببن ڕێزی دەسەلاتی مەعریفەی زانستی بگرن و لە مەسەلەی حوکمڕانییشدا ڕێزی بێلایەنبوونی دەوڵەت بەرانبەر بە دینەکان و بە نادین بگرن. هاوکات دەبێت عەلمانییەکانیش دیدێکی ڕەخنەییان بەرانبەر بە خۆیان هەبێت و باوەڕیان بەوە بێت کە عەقڵ سنوورێکی تایبەتی هەیە و دینیش مەسەلەیەکی گرنگی ژیانی کەسانێکی زۆرە و دونیا بەرەو هاتنەکایەی جۆرێک لە کۆمەڵگا دەچێت، کە دەشێت بە کۆمەڵگای "پۆست عەلمانیەت" ناو ببرێت. ئەمەش مانای پێویستیی هاتنەکایەی گۆڕانکارییە لە تێگەیشتنی هاوڵاتییە عەلمانیەکاندا بۆ مۆدێرنە خۆی، واتە کورتنەکردنەوەی مۆدێرنە بۆ پرۆژەیەکی عەلمانیی بەتەنها، باوەڕهێنان بەوە کە دین دەشێت لە ڕووی ناوەڕۆکەوە شتێک پێشکەش بە پرۆژەی مۆدێرنە بکات و هەڵگری دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی هەقیقەت بێت.

هەندێک نووسەر ئەم گۆڕانە لە فیکری هابرمازدا بۆ کۆتایی

هەشتاکان دەگەڕێننەوە، بەتایبەتی بۆکتێبی "*بیرکردنەوەی پۆست میتافیزیک*،" کە تیایدا هابرماز بەرگری لەوە دەکات کە یەکێک لە سەرچاوەکانی لێکدانەوەی عەقڵانی بۆ دونیا، لەناو دین خۆیەوە، یان لەناو سەرچاوە دینییەکانی بیرکردنەوەوە، هاتوە. واتە ڕەگێک لە ڕەگەکانی بیرکردنەوەی عەقڵانییانە لەناو دین خۆیدا دروست بووەوە و لەناو سەرچاوە دینییەکانەوە هاتووە، دین هەموو خورافەت و غەیبانیەت نییە. لەم قۆناغە نوێیەدا هابرماز قورسایی زیاتر بۆ لێکدانەوە و ئەرگومێنتە دینییەکان دادەنێت و خۆشی لە بەشێک لەو تێزانە دوور دەخاتەوە کە پێشتر لەپاڵ تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیادا بەرگریی لێ کردون.[1]

### دونیای دوای ١١ سێپتێمبەر

دەرکەوتە گەورەکانی گرنگیدان بە دین و خوداناسی لە فیکری هابرمازدا، بە شێوەیەکی تایبەت لە دوای ساڵی ٢٠٠١ەوە دەر دەکەوێت. هابرماز مانگێک دوای پەلامارەکانی ١١ سێپتێمبەر لە شاری فرانکفۆرت موحازەرەیەک بە ناوی "باوەڕ و مەعریفە"وە پێشکەش دەکات و تیایدا دیدێکی نوێ بۆ شوێن و جێ و ڕۆڵی دین لە دونیادا پێشکەش دەکات. ئەم موحازەرەیە، کە دواتر وەک وتارێک بڵاو دەبێتەوە، کۆمەڵێک موناقەشە و دیالۆگی زۆر بەدوای خۆیدا دروست دەکات. دوای ئەمە هابرماز لە ساڵی ٢٠٠٤دا تێکستێکی تر لەسەر دین بە ناوی "دیالێکتیکی بەعەلمانیبوون" دەنووسێت، کە ئەویش هەمان کاردانەوە و باسکردن بەدوای خۆیدا دەهێنێت، لەم تێکستەدا هابرماز دەچێتە دیالۆگەوە لەگەڵ

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٤٤

قەشەیەکی مەسیحیدا.[1] لە تێکستێکی دیکەدا بە ناوی "دین لە ڕووبەری گشتیدا" کە لە ساڵی ٢٠٠٦دا بلاو دەبێتەوە، هابرماز بەوردیی مەبەستی خۆی لە تێزەی "وەرگێڕانی ناوەرۆکە دینییەکان" بۆ سەر زمان و ناوەۆکێکی دونیایی ڕوون دەکاتەوە.[2] دواتر لە ساڵی ٢٠٠٨دا دوو تێکست لەسەر کۆمەڵگای "پۆست عەلمانیەت" ئەنووسێت کە بە چەمکی "پۆست عەلمانیەت" ناوبانگێکی گەورە دەبەخشێت.[3] لە موحازەرەکەی ساڵی ٢٠٠١دا هابرماز داوای دۆزینەوەی ڕێگایەکی مامناوەندی دەکات لە نێوان پرۆژەیەکی تازەبوونەوەی عەلمانییانەی پەڕگیر و پرۆژەیەکی ئوسوڵییانەی دینیی پەڕگیردا. هەردوو فۆرمە پەڕگیرەکەی عەلمانیەت و ئایینی بەسیاسییکراو، یان ئوسڵیەت، بە شوێنی مەترسی دەزانێت و وەک دوو پرۆژەی تەواو نوقسان مامەڵەیان دەکات. هابرماز باس لەوە دەکات کە هەم دینداران و هەم بێدینان ئەرکێکی مەعریفیی هاوبەشیان لەسەرە و پێویستیان بە فێربوونێکی دووسەرە هەیە لە یەکتری. ئەرکە مەعریفییە هاوبەشەکە ئەرکی دەستنیشانکردنی ئەو سنوورەیە کە دینی لە نادینی، یان دینی لە دونیای، یان دینی لە عەلمانی جیا دەکاتەوە. ئەم جیاکارییە لە بنەڕەتدا جیاکارییەکە لە

---

1 -Jurgen Habermas and Joseph Ratzinger (2007) The Dialectics of Secularization: On Reason and Religion. San Francisco: Ignatius Press,

2 -Habermas, Jurgen. 'Religion in the Public Sphere', European Journal of Philosophy, 14:1 (2006), pp. 1– 25;

3 -Jurgen Habermas, 'Notes on a Post-Secular Society', signandsight.com (18 June 2008),

فەیلەسوفی ئەڵمانیی ئیمانوێل کانتەوە سەرچاوە دەگرێت. کانت باس لە سنوورە تایبەتەکانی عەقڵ دەکات و پێی وایە هەندێک شت هەن دەکەونە دەرەوەی ئەو سنوورانەوە و عەقڵ ناتوانێت شتێکی ماقووڵیان لەسەر بڵێت. کانت دین لەودیوی ئەو سنوورەوە دادەنێت کە عەقڵ نایگاتێ. لەسەر هەمان هێڵ هابرماز باس لەوە دەکات کە دین و نادین دەبێت سنوورەکانی خۆیان بزانن و لە ڕووی مەعریفییەوە بەیەکدی تێکەڵ نەکرێن، بەڵام دەکرێت پرد دروست بکەن و لەیەکتری تێبگەن و فێر ببن.[1]

دۆزینەوەی ئەو سنوورانە ئەرکێکی هاوبەشە لەنێوان ئیمانداران و بێئیماناندا و پێویستە بە هاریکاریی هەردوو لا ئەنجام بدرێت. بە مانایەکی دیکە ئەرکی جیاکردنەوەی دین لە نادین، ئەرکی دیندارەکان و بێدنیەکانە بەیەکەوە، پێویستی بە هاریکاریکردنی هەردوولایە پێکەوە و پێویستی بە لەیەکتریفێربوونیش هەیە. هابرماز پێی وایە ئەم کارە بەوە ئەنجام ئەدرێت هەردوو لا پێکەوە هەوڵ بدەن و هاریکار بن بۆ وەرگێڕانی ناوەڕۆک و بەهانە و ئەرگومێنتە دینییەکان، بۆ زمانێکی گەردوونیی هاوبەش، کە هەمووان بتوانن لێی تێبگەن. ئەمەش مانای گۆڕینی زمانی دینیی ئەرگومێنت و بەرخوردەکان بۆ زمانێکی نادینی کە بکرێت ئەو کەسانەش کە دینی نین، یان دژەدینن، بتوانن تێیبگەن و قبووڵی بکەن. واتە هابرماز داوا لە کەسە دینییەکان دەکات کە بۆچوون و بەهانە دینییەکانیان بگۆڕن بۆ زمانێکی نادینیی قابیلی قبووڵکردن لەلایەن هێز و کەسە نادینی و عەلمانییەکانەوە

---

١ - وتارەکەی تری ئەو پیاوە

کاتێک ئەو کەسە دینییانە لەناو ڕووبەری گشتیدا ئامادەن و گفتوگۆ دەکەن. هاوکات لە بەرانبەر ئەمەدا هابرماز داوا لە کەس و هێزە عەلمانییەکان دەکات کە ئامادەگیی ئەوەیان تێدا بێت ئەگەری ناوەرۆکی عەقڵانییانە لەناو بیرکردنەوەی دینیدا ببینن و بناسنەوە، واتە دین کورت ناکەنەوە بۆ خورافەت و جەهالەت و گەمژەیی و شتی تری لەم بابەتە. بەم مانایە مەسەلەکە تەنها تەرجەمەکردنی ناوەرۆکە دینییەکان نییە بۆ زمانێکی گەردوونی لەلایەن کەسە دینییەکانەوە بە شێوەیەک هەمووان بتوانن لێی تێبگەن، بەڵکو ئامادەگیی لایەنە عەلمانی و نادینییەکانیشە بۆ بینینی ناوەرۆک و ڕەهەندی عەقڵانیی لەناو بۆچوون و دیدە دینییەکاندا. بەکورتی ئەوەی هابرماز داوای دەکات دوورکەوتنەوەیە لەو تێگەیشتنە عەلمانییە سادەیەی کە دین و وەک ڕێگرێک لەبەردەم تازەبوونەوەی دونیا و لەبەردەم گەشەکردنی عەقڵی و ویژدانی ئینساندا دەبینێت و بەم بۆنەیەشەوە دەیکاتە دەرەوەی پرۆژەی مۆدێرنەوە. لە دیدی هابرمازدا ئەوەی پێویستە ڕوو بدات بریتییە لە دروستکردنی پردێک لەنێوان دین و دونیاییبووندا، هێنانەکایەی زەمینەیەکی هاوبەشە کە هەردوولا تیایدا ئامادەی دانپیانان بن بەیەکدا. بە مەرجێک ئەم پردە نەبێتە هۆی وێرابوونی ئەو زمان و کولتوورە عەلمانییەی کە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دروست بووە. هەموو ئەمانەش لە ڕێگای تەرجەمەکردنی ناوەرۆکە دینییەکانەوە بۆ زمانێکی نادینی و لە ڕێگای قبووڵکردنێکی ڕەخنەگرانەی ئەرگومێنتە دینییەکانەوە (ه. س. پ ل٥٤٤). لە هەموو ئەو دۆخانەشدا

هابرماز داوا دەکات لەو تێگەیشتنە عەلمانییە تایبەتەی کە دین و وەک ڕێگرێک لەبەردەم تازەبوونەوەی دونیا و لەبەردەم گەشەکردنی عەقڵی و ویژدانیی ئینساندا دەبینێت و دەیکاتە دەرەوەی پرۆژەی مۆدێرنەوە، دوور بکەوینەوە.

### تیورییەکی نوێ بۆ گەشەکردنی کۆمەڵایەتی

هابرماز لەم نووسینە تازانەدا داوای تیورەیەکی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی دەکات کە هەڵەکانی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دووبارە نەکاتەوە و ئەو دیدە نەسەلمێنێت کە پێی وایە دین لەناو پرۆژەی تازەبوونەوە و گۆڕانکارییەکی دونیای مۆدێرندا شوێنی نابێتەوە. هابرماز پێی وایە هەر تیورەیەکی کۆمەڵایەتی کە پێی وا بێت دین تەنها لە ڕابردوودا قورسایی هەبووە و لە دونیای ئەمڕۆدا بێڕۆڵ و بێقورساییە، ناتوانێت شوێن و جێی باوەڕی دینی لە دونیای مۆدێرندا بخوێنێتەوە و تێبگات. بۆیە، بە بۆچوونی هابرماز، تیورەیەکی کۆمەڵایەتیی نوێ پێویستە کە باز بەسەر ڕەهەندە زیندوو و چالاکەکانی دیندا نەدات و ئەرگومێنتە دینییەکانیش وەک ئەرگومێنتی ناعەقڵانی و چەپێنەر مامەڵە نەکات. بێگومان هابرماز کە باس لە چۆنیەتیی قسەکردنی زانستییانە لەسەر دین و لە چۆنیەتیی مامەڵەکردنی دین دەکات وەک بابەتێکی زانستی، باس لە دیالۆگی نێوان دین و دونیا ناکات، باس لە ڕوانینێک ناکات بۆ دین کە لەسەر مۆدێلی دانووسانی سیاسی بونیاد نرابێت، واتە زانست ناچێت موفاوەزات لەگەڵ دیندا بکات. هابرماز زۆر بەسەختی پێ لەسەر تێکەڵنەکردنی سنووری دین و مەعریفەی زانستی بەیەکتری دادەگرێت. پێشی وایە هەرکاتێک

باوەڕی دینیی دزەی کردە ناو لێکدانەوەی زانستییەوە، ئەوەدەم عەقڵ ناتوانێت بوونی سەربەخۆی بپارێزێت و دەکرێتە دەرەوەی کردەی بەرهەمهێنانی زانستییانەی مەعریفەوە. هابرماز پێی وایە ئەم تیورە کۆمەڵایەتییە نوێیە پێویستی بە شتێکە لە دەرەوەی تیورەکە خۆیدا، پێویستی بە ئاسۆیەکە بتوانێت وێنەیەکی ژیان پێشنیار بکات کە تێک نەچووبێت و هانی ئینسانیش بدات و هاریکاریشی بێت بۆ ئەوەی بەدوای دونیای باش و ژیانی باش و چاکەدا بگەڕێت.[1]
هەموو ئەو خاڵانەی لەسەرەوە باسم کرد ئەوەمان نیشان ئەدات هابرماز لە قۆناغی سێهەمی گەشەکردنی بیرکردنەوەیەدا دیدێک بۆ دین گەشە پێ ئەدات کە هەم وەک بەشێک لە دونیای مۆدێرن دەبینێت و هەم بە سیحر و خورافەت و نەزانی یەکسانی ناکات. ئەم دۆخەش پەیوەندیی بە ئامادەگیی ئەم یان ئەو گروپی دینییەوە نییە لەناو کۆمەڵگا ئەورووپییەکانی ئەمرۆدا، بەڵکو پەیوەستە بەو قەیرانانەوە کە پارادایمی بەعەلمانیبوونی دونیا تیایدا دەژی و پەیوەستیشە بە گەشەکردنی دیدی نوێوە لەناو زانستە کۆمەڵایەتییەکان و لەناو فەلسەفەی سیاسیدا بۆ ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا. ئەمە جگە لە پێداویستیی دروستبوونی دیالۆگ لەنێوان دین و نادیندا وەک بەشێک لە چارەسەر بۆ کۆمەڵێک لە کێشەکانی ناو دونیای مۆدێرن، کە دونیایەکی پلورال و پڕ جیاوازیی دینی و نادینییە.

---

1 -Harrington, Austin (2007b). Habermas's Theological Turn. ل ٤٦، ٤٧، ٤٨، ٤٩

**عەقڵ و باوەڕ**

لە کتێبێکی گرنگدا بە ناوی "*هۆشیاربوون بەوەی کە ونە: باوەڕ و عەقل لە سەردەمی پۆست عەلمانیەتدا*" هابرماز جارێکی دیکە دێتەوە سەر مەسەلەی شوێن و جێی دین لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا.[1] لەم نووسینەدا بەرگری لە عەقڵی مۆدێرن و ڕۆشنگەر دەکات و وەک عەقڵێکی عەلمانی دەیناسێنێت، هەروەها بە هێزی ژمارە یەک و هەرە گرنگی دونیای ئەمڕۆی دادەنێت، بەڵام هاوکات پێی لەسەر ئەوەش دادەگرێت کە ئەم عەقڵە سنووری تایبەتی هەیە، تواناکانی ڕەها نییە، لەوە ئاگادارە کە شتێکی ون کردوە، نوقسانییەک هەیە کە بە عەقڵ خۆی پڕ ناکرێتەوە. هاوکات هابرماز عەقڵ لەوەش ئاگادارە کە خەریکە لەوە دەر دەچێت کۆنترۆڵ بکرێت و سنوورێک بۆ تەماحەکانی دابنرێت، هابرماز باوەڕی وایە دەشێت دین لەم ئاستەدا بتوانێت بەشێک لەو نوقسانییە پڕ بکاتەوە، هاریکاری ئینسان بێت بۆ هەڵسوکەوتێکی تەندروستتر لەگەڵ دونیادا. ئەوەی خوێنەر دەبێت لێی ئاگادار بێت ئەوەیە هابرماز ناڵێت دین شوێنی عەقل بگرێتەوە، یان دین بچێتە شوێنی عەقڵ، یان دین دونیا ڕزگار دەکات، یان عەقڵ لەسەر بنەمای دین سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوە، یان سنوورەکانی نێوان عەقڵ و دین بسڕینەوە، بەڵکو باس لەوە دەکات کە دەشێت دین هەندێک لەو نوقسانییانە پڕ بکاتەوە کە دەمێننەوە و عەقڵ ناتوانێت پڕیان بکاتەوە. لەم کتێبەدا هابرماز دین وەک "هێزێکی نەپڕووکاو" The

---

1 - An Awareness of What is Missing: Faith and Reason in a Post-secular Age.

unexhausted force وێنا دەکات،[1] هێزێک کە کۆتایی نەهاتووە و نەکوژاوەتەوە، هێزێک ئەتوانێت لە هۆشیاریی ئینسانی عەلمانیدا ئاگایی ئەوە زیندوو بکاتەوە کە دونیای ئەمڕۆ پێویستی بە هاریکاری و بە بەدەمەوەچوونی ئینسانی هەیە، چونکە وەک هابرماز دەڵێت: مەسەلەی هاریکاری و بەدەمەوەچوونی ئینسانەکان بۆ یەکتری لە ئاستی دونیادا، وێران و نابوت کراوە و دەشێت دین بتوانێت ڕۆڵ لە زیندووکردنەوەی ئەم هاریکارییە دونیاییەدا ببینێت. لەم ڕووەوە هابرماز سەبارەت بەم ئاگاییە دەنووسێت: "ئاگایی شتێکە کە نوقسانە و هاوار بۆ ئاسمان دەکات."[2] بەڵام هابرماز کە ئەمە ئەڵێت لەبیری ناچێت پێ لەسەر دوو داواکاریی سەرەکی دابگرێت، یەکەمیان داواکارییە لە عەقڵیەتی دینی و ئەوی تریان داواکارییە لە عەقڵیەتی دونیاییی عەلمانیی. لە یەکەمیاندا هابرماز داوای ئەوە لە عەقڵیەتی دینیی دەکات کە دان بە دەسەڵاتی عەقڵی دونیای و عەلمانیدا لە دوو بواردا بنێت، لە بواری دەسەڵاتی زانست و دەسکەوتە گەورەکانیدا، هەروەها لە بواری دانان بە پرنسیپەکانی یەکسانیی گەردوونیی ئینسانەکان لەگەڵ یەکدا لە بواری یاسایی و ئەخلاقیدا. دووهەم، داواکاریی هابرماز داواکارییە لە عەقڵیەتی عەلمانیی کە نابێت خۆی وەک تاکە داوەرێک نیشان بدات بۆ بڕیاردان لەسەر هەقیقەتی ئیمان و باوەڕی دینی. لەم ڕووەوە هابرماز داوای ئەوە دەکات عەقڵ و دین، یان عەقڵی عەلمانی و باوەڕی دینی بکەونە دیالۆگەوە لەگەڵ

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٨

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٩

یەکتریدا و یەکتری بدوێنن، نەک ئەوەی هەریەکێکیان بە جیا و بەتەنها قسە لەسەر ئەوی تریان بکات.[1]

**دین و سیاسەت**

سەرەڕای ئەو وەرچەرخانە تیورییەی لە سەرەوە باسمان کرد و سەرەڕای باسکردنی هابرماز لەوەی کە تیورییەکی کۆمەڵایەتیی نوێ پێویستە، بەڵام خەمی سەرەکیی هابرماز لەم قۆناغی سێهەمدا خەمێکی سیاسییە. ئەو نووسینانەشی کە لەسەر دین نووسیوونی دەربڕی ئەو خەمە سیاسییەن. مەبەست لەمەش خەمی گونجاندنی دین و نادینە بەیەکەوە لە دونیای ئەمڕۆدا کە دونیایەکی پڕبووە لە جیاوازی و بە شێوەیەکی هەمەلایەن پلورال و هەمەڕەنگ بووە. بێگومان هابرماز کە باس لە سیاسەت دەکات، باس لە درۆکردن و دزی و فێڵ و تەڵەکەبازی ناکات، باس لەو دیدو گوتارە سادەیە ناکات کە سیاسەت کورت دەکاتەوە بۆ خراپەکاری و ململانێی توندوتیژ لەسەر پارە و دەسەڵات لە دەرەوەی یاسا و نۆرم و ئەخلاقدا، هەروەها ئینشا نانووسێت لەسەر ئەوەی سیاسەت ئەرزێکی بەیارە و هیچی تیا سەوز نابێت. هابرماز باس لە سیاسەت ناکات وەک خراپەکاری، بەڵکو باس لەو ڕەهەندە تایبەتەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئینسانی دەکات کە پەیوەندیی هەیە بە پێکەوەبوونی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا و وەک چوارچێوەیەکی گشتیی گرنگ و ماناداری پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتییش ئامادەیە. لە ڕاستیدا هابرماز ڕووبەری سیاسیی ناو ژیانی کۆمەڵایەتی بە یەکێک لە گرنگترین و

---

١ - هەمان سەرچاوی پێشوو ل ١٦

پڕماناترینی ئەو چوارچێوانە دادەنێت کە فیکر بتوانێت لەناویدا بیر لە کێشە فیکری و فەلسەفییەکان بکاتەوە. واتە هابرماز فیکر و سیاسەت بەتوندی بەیەکەوە گری ئەدات و لەو نووسینە تازانەشدا لەسەر دین ئەم کارە بەوردی ئەنجام ئەدات. هابرماز لەم نووسینانەدا ململانێی نێوان دین و عەقڵ کەمتر وەک ململانێییەکی مەعریفی و ئەبستمۆلۆژی و زیاتر وەک ململانێیەکی سیاسی و یاسایی دەبینێت و مامەڵە دەکات.[1] لە ئاستە سیاسییەکەدا هابرماز دەیەوێت قسەکردن لەسەر دین وەک بەشێک لە قسەکردن لەسەر کێشەی پلورالیزمی دینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و وەک کێشەیەک پەیوەست بە مەسەلەی لێبوردنەوە لەناو کۆمەڵگای دیموکراسدا مامەڵە بکات. کۆمەڵگایەک ئامادە بێت کێشە و ململانێکانی بە شێوەیەکی دیموکراسانە و لە ڕێگای یاساوە ڕێک بخات.

ئەوەی بەلای منەوە گرنگە خۆخەریککردن نییە بەو پەیوەندییانەوە کە دین و عەقڵ وەک دوو مەسەلەی مەعریفی و ئەبستمۆلۆژیی بەیەکەوە گری ئەدەن، ئەوەی بۆ مەبەستی ئەم کتێبە گرنگە: پێداگرتنی هابرمازە لەسەر دیالۆگی نێوان دین و دونیا، نێوان دینیبوون و دینینەبوون، عەلمانیەت و ئیمان و ڕێکخستنێکی هێمن و دیموکراسییانە و مافپەروەرانە و لێبوردوانەی پەیوەندییەکانی نێوان ئەو لایەنانە. ڕێکخستنێک بکەوێتە ئەودیوی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و ئەودیوی ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەتەوە کە ڕۆڵێکی قابیلی باسکردن بۆ

---

1 -Harrington, Austin (2007). Habermas and the 'Post-Secular Society'. ل ٥٤٨

دین لە دونیای مۆدێرندا ناهێڵنەوە. وەک چۆن بکەوێتە ئەودیوی دیدی هێزە ئوسوڵییە دینییەکانەوە بۆ دین و نادین و نمایشکردنی عەلمانیەت وەک ئەهریمەنێکی گەورە کە دوژمنی ژمارە یەکی دین و دنیدارانە. ئەوەی هابرماز لەم ئاستەتە بەرگریی لێ دەکات و دەشتوانێت هاریکارمان بێت بۆ تێپەڕاندنی دووانەی "عەلمانیەت و دین" و تێپەڕاندنی جەنگە ئایدیۆلۆژی و خوێناوییەکانیان، ئەو پرۆژە دیموکراسییە پلوراڵەیە کە کولتووری لێبووردن و بوونی یاسای دیموکراسییانە و ماف پەیوەندییەکان ڕێک دەخات و ئاراستەیان دەکات، پرۆژەیەک کە هابرماز بەتەنها کورتی ناکەتەوە بۆ پرۆژەیەکی عەلمانی.

## هابرماز و کۆمەڵگای پۆست عەلمانیەت

هابرماز بۆ یەکەم جار دەستەواژەی "پۆست عەلمانیەت" لەو موحازەرەیەدا بەکار دەهێنێت کە لە ساڵی ٢٠٠١دا و دوای ڕووداوەکانی یازدەی سێپتێمبەر لە ئەڵمانیا پێشکەشی دەکات، دواتر لە هەندێک نوسینی تردا کە لە ساڵی ٢٠٠٨دا دەینووسێت ئەم چەمکە سەرلەنوێ بە شێوەیەکی درێژتر و وردتر شی دەکاتەوە و باس دەکات.[1] بە شێوەیەکی گشتی

---

١ - بڕوانە:

Jurgen Habermas, 'Notes on a Post-Secular Society', signandsight.com (18 June 2008),

هەروەها بڕوانە:

Jurgen Habermas et al., An Awareness of What is Missing: Faith and Reason in a Post-secular Age (Cambridge: Polity Press, 2011)

مەبەستی هابرماز لە چەمکی "پۆست عەلمانیەت" باسکردنی ڕۆڵی سیاسی و ڕۆڵی گشتیی دینە لە دونیای ئەمڕۆدا، ڕۆڵێک ناکرێت کورت بکرێتەوە بۆ ڕووبەری تایبەت و ژیانی شەخسیی تاکەکەس، بەتەنها. بە شێوەیەکی گشتی هابرماز پۆست عەلمانیەت بە مانای دروستبوونی سەردەم و قۆناغێکی مێژوویی نوێ بەکار دەهێنێت، هاتنەکایەی ڕۆژگارێکەوە کە دین ڕۆڵ لە دەرکەوتە جیاوازەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیدا دەبینێت. پۆست عەلمانیەت لێرەدا پەیوەندیی بە دوو کۆمەڵە مەسەلەی سەرەکییەوە هەیە. یەکەمیان دروستبوونی کۆمەڵگایەکە تا دێت پلورالتر و پڕ جیاوازیتر دەبێت و ژمارەیەکی گەورەتر لە هاوڵاتیان تیایدا باوەڕیان بە دینە و ئەم باوەڕەشیان لەناو زیاد لە ئاستێکی ژیانی کۆمەڵایەتیاندا بەکار دەهێنن. ئەمە وا دەکات مرۆڤ ناچار بێت بیر لە چوارچێوەی تازە بۆ ژیانی مەدەنی و پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی بکاتەوە. دووهەمیان هاتنەپێشەوەی کۆمەڵێک مەسەلە و بابەتی تازەیە کە جگە لە هۆشیاریی عەلمانییانە، هۆشیاریی دینییش دەتوانێت شتی گرنگیان لەسەر بڵێ، لەوانە بۆ نموونە، مەسەلەی لەباربردنی منداڵ، کۆتاییهێنانی خۆویستانە بە ژیان، مەسەلەی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، هتد. لە هەموو ئەو بابەتانەدا هۆشیاریی دینی دەتوانێت شتی مانادار و گرنگ بڵێت. ئەمەش مانای بوونی سەرچاوەی تر بۆ ئیلهامی ئەخلاقی و بۆ لێکدانەوە و تەفسیرکردنی دونیا لە دەرەوەی هۆشیاریی عەلمانی و نادینیدا.[1]

---

1 -Habermas, 'Notes on a Post-Secular Society'. signandsight.

هابرماز مەسەلەی پۆست عەلمانیەت بەو فۆرمەی عەلمانیەتیەشەوە گری ئەدات کە توانای ئەوەی هەیە رەخنە لە خۆی بگریت و پرسیار دەربارەی سنوورەکانی خۆی بکات. واتە پەیوەندیی بە عەقلیەتیکی عەلمانییەوە هەیە، کە بەئاگایە لەوەی دەشیت شتی مانادار و گرنگ لە دەرەوەی خۆیدا هەبیت. ئەمەش بیگومان دوای رەخنەکردنی عەلمانیەت لە سالانی شەستەوە تا ئەمرۆ هاتوتە کایەوە. هاوکات هاتنەکایەی قۆناغی پۆست عەلمانیەت پەیوەندیی بەو هۆشیارییە دینییەشەوە هەیە کە ئەویش لە پەیوەندییەکی رەخنەگرانەدایە لەگەل خۆیدا و دەتوانیت سنوورەکانی خۆی و هۆشیاریی دینی بزانیت و ئەمیش لە دەرەوەی بوونی خۆیدا هۆشیاریی رەخنەیی گرنگ و مانادار دەبینیت. بەم مانایە پۆست عەلمانیەت بەرهەمی کاری پیکەوەی و هاریکاریی هۆشیاریی عەلمانیی رەخنەیی و هۆشیاریی دینیی رەخنەییی ئەو هاولاتییانەیە کە سنووری تواناکانی خۆیان دەناسن و ئامادەن پرد لە نیوان خۆیاندا دروست بکەن.[1]

لیرەدا هابرماز قسە لەو کۆمەلگایانە دەکات کە بەرانبەر بە ئامادەگیی دین لە دونیادا هۆشیارن و ئامادەن حیساب بۆ ئەو ئامادەگییەش بکەن. نەک هەر ئەمە، لەم کۆمەلگایانەدا ئامادەگیی ئەوە هەیە کە ئینسان، چ وەک هاولاتی و چ وەک بیرمەند و رۆشنبیر، لە دینەوە فیری شتگەلیکی تایبەت ببن.

---

com (18 June 2008),

ئەم نووسینەی هابرماز لەسەر ئەم سایتە بەدەست دەکەویت:

{http://www.signandsight.com/features/1714.html/}

١ - بروانە:

Habermas, 'Religion in the Public Sphere', p. 15.

بە بۆچوونی شارەزایانی ئەم بوارە چەمکی پۆست عەلمانیەت لای هابرماز تا ئێستاش چەمکێکە بەباشی کاری لەسەر نەکراوە و مانا و دەرەنجامەکانی بەوردی لێک نەدراوەتەوە. جارێک هێما بۆ مانەوەی گروپە دینییەکانی ناو ژینگەیەکی عەلمانی دەکات، جارێک هێما بۆ دروستبوونی سەردەم و قۆناغێکی تایبەتیی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی دەکات، هەندێک جاریش هێما بۆ دروستبوونی جۆرێک لە هۆشیاری نوێ بەرانبەر بە دین لە دونیای مۆدێرنەدا دەکات، جۆرێک لە هۆشیاری کە باوەڕی بە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و لاوازبوون و کۆتاییهاتنی دین نییە، هۆشیارییەک دەزانێت دین نەک تەنها بەشێکە لە ژینگەی کۆمەڵایەتی، بەڵکو دەشێت شتگەلێکی گرنگیش لەسەر دونیا و کێشەکانی بڵێت.

دواخاڵ لە پەیوەندیدا بە چەمکی پۆست عەلمانیەتەوە بکرێت جەغتی لێ بکەین ئەوەیە کە هابرماز ئەم دەستەواژەیە تەنها بۆ کۆمەڵگا ئەوروپییەکان و کەنەدا و ئوستورالیا و نیوزلەندا، دەگونجێت. واتە تەنها بۆ قسەکردن لەسەر بڕێک لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆکەی دونیا دەگونجێت، نەک بۆ هەموو کۆمەڵگاکان.

**دەرەنجام**

گرنگیدانی هابرماز بە دین لە پازدە ساڵی ڕابردوودا دیاردەیەکی لاوەکیی نییە و پەیوەندیی بە ئامادەگیی هەندێک گروپی دینیی لەناو کۆمەڵگا ئەوروپییەکانەوە نییە. بوونی دین بە بەشێک لە کارەکانی ئەم فەیلەسوفە پەیوەندیی بەو گۆڕانە گەورانەوە هەیە کە هەم لە بواری فیکری زانستی و هەم لە واقیعی سیاسی و

فەرهەنگیی بڕێکی زۆری کۆمەڵگاکانی دونیادا دروست بووە. هابرماز لە پازدە ساڵی ڕابردوودا لەو پارادایمە عەلمانییە دوور دەکەوێتەوە کە چوارچێوەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و چوارچێوەی بڕێکی زۆری کارە فەلسەفییەکانی خۆشی بووە. ئەوەی هابرماز لەو ماوەیەدا لەسەر دین دەیڵێت، تەواو جیاوازە لەوەی کە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت لەسەر دین دەیڵێن. لەمەشدا هابرماز دژ بە هەندێک لەو بۆچوونانە قسە دەکات کە خۆی لە قۆناغێکی تایبەتی گەشەکردنی فیکریدا هەڵگریبووە. بە بۆچوونی هابرماز دەشێت دین هەم لە ئاستی ویژدانی و ئەخلاقی و مەعریفیدا شتێک بڵێت بەکەڵکی دونیای ئەمڕۆ بێت، هەم دەشێت بەشداریی سیاسیی دین بەشێک بێت لە پرۆسەی دروستکردن و پاراستنی سیستمی دیموکراسی خۆی. لە هەردوو دۆخەکەدا هابرماز باس لە کورتهێنانی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەکات. خاڵێک کە لە دیدی هابرمازدا گرنگە: مەسەلەی کاری پێکەوەیی کەس و هێزە دینییەکانە لەگەڵ کەس و هێزە عەلمانییەکاندا و دروستکردنی پردی دیالۆگ و پردی هاریکاریی سیاسی و فیکرییە.

# سەرچاوەکان

Habermas, Jurgen (2006). Religion in the Public Sphere. European Journal of Philosophy, 14:1, pp. 1– 25.

Habermas, Jurgen and Joseph Ratzinger (2007). The Dialectics of Secularization: On Reason and Religion San Francisco: Ignatius Press.

Habermas, Jurgen, (2008). 'Notes on a Post-Secular Society. signandsight.com.

Habermas, Jurgen, (2008). Between Naturalism and Religion: Philosophical Essays. Cambridge: Polity Press.

Habermas. Jurgen (2011). An Awareness of What is Missing: Faith and Reason in a Post-secular Age. Cambridge: Polity Press, 2011.

Harrington, Austin (2007). Habermas and the 'Post-Secular Society'. European Journal of Social Theory. 10 (4)

Harrington, Austin (2007b). Habermas's Theological Turn. Journal for the Theory of social Behaviour 37:1.

# دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٦)

## دیموکراسیەت یان عەلمانیەت؟

## ڤایت بادەر و جیاکردنەوەی دیموکراسیەت و عەلمانیەت لە یەکتری

## دەرچوون لە پارادایمی عەلمانیەت (٦)
## دیموکراسیەت یان عەلمانیەت؟
## ڤایت بادەر و جیاکردنەوەی دیموکراسیەت و عەلمانیەت لە یەکتری

**سەرەتا**

لە نووسینێکدا بە ناوی "پلورالیزمی دینی: کامیان لە پێشتر بێت، دیموکراسیەت یان عەلمانیەت؟" کۆمەڵناس و فەیلەسوفی سیاسیی ئەڵمانی-هۆڵەندی: ڤایت بادەر، باس لە پەیوەندیی نێوان سیستمی دیموکراسیی لیبرالی و ئایین لە دونیای ئەمڕۆدا دەکات. ڤایت بادەر بە ئەسڵ ئەڵمانییە و بەلام لە کۆتایی هەشتاکانەوە لە هۆڵەندا دەژی. وەک پرۆفیسۆری فەلسەفەی سیاسی و کۆمەڵناسی لە زانکۆی ئەمستردام دەستبەکارە. ڤایت بادەر نووسنێکی زۆری لەسەر تیورەی دیموکراسی هەیە و یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی کە بەرگرییەکی گەورە دەکات لە دیموکراسیەتی لیبرالی، بەلام بێگومان لەو فۆرمەدا کە بە associative democracy واتە دیموکراسیەتێک کە کەسان و گروپی جیاواز بتوانن

خۆیان ڕێک بخەن و دەزگای تایبەتیان هەبێت و ئازادانە بەشدار بن لە ژیانی گشتیدا.[1] ڤایت بادەر لە تیورەی دیموکراسیەتدا پێی لەسەر جیاکردنەوەی دیموکراسیەت لە عەلمانیەت دادەگرێت و باس لەوە دەکات کە بۆ دروستکردن و بونیادنانی دیموکراسیەت، عەلمانیەت پێشمەرجێکی حەتمی نییە.[2] بە مانایەکی دیکە ئەم پیاوە ئەو پەیوەندییە حەتمییە لە نێوان دروستکردنی دیموکراسیەت و ئامادەگیی عەلمانیەتدا نابینێت، بەو جۆرەی کە ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت بانگەشەی بۆ دەکات. لە نووسینەکانیدا بەشی هەرە زۆری ئەو ڕەخنانەی لە سی ساڵی ڕابردوودا لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و لە ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت گیراوە کۆ دەکاتەوە و دەیانخاتە بواری بەرهەمهێنانی دیدێکی نوێوە بۆ دیموکراسیەت، دیدێک ئەو پەیوەندییە میکانیکی و حەتمییە تێدەپەڕێنێت کە لە نێوان عەلمانیەت و دیموکراسیەت پێشنیار دەکرێت. ڤایت بادەر ئەم تێزە و کۆمەڵێک تێزەی تر لە کتێبی: "*دیموکراسیەت یان عەلمانیەت*"دا، کە لە ساڵی ٢٠٠٧دا چاپ دەکات، هەروەها پەرەیان پێ ئەدات و قووڵتریان دەکاتەوە.[3]

---

١ - بڕوانە:

Bader, Veit (2007). Secularism or Democracy? Associational Governance of Religious Diversity. Amsetrdam University Press.P 20-22.

٢ - بڕوانە:

Bader, Veit (1999). Religious Pluralism: Secularism or Priority for Democracy?. Political Theory, Vol. 27, No. 5, pp. 597-633

3 -Bader, Veit (2007). Secularism or Democracy? Associational Governance of Religious Diversity. Amsetrdam University Press.

کتێبی "دیموکراسیەت یان عەلمانیەت" لە ڕەوتی ئەو گفتوگۆ فیکرییانەدا نووسراوە کە لەسەر تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" وەک بابەتێکی تیوری و لەسەر چۆنیەتیی ڕێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگا فرەکولتوورییەکانی خۆرئاوا هاتۆتە کایەوە. دین لە دیالۆگ لەسەر کۆمەڵگای فرەکولتووریدا وەک بەشێک، زۆر جار بەشێکی گرنگی کولتوورەکان مامەڵە کراوە. ئەو ڕەهەندە کردەییەش کە کتێبەکە ئاراستە دەکات مەسەلەی چۆنیەتیی ئامێزانبوونی گروپە دینییە جیاوازەکانە لەناو کۆمەڵگایەکی دیموکراسیی فرەکولتووریدا. لە ئاستە تیورییەکەیدا کتێبەکە دەیەوێت ئەوە ئاشکرا بکات چ جۆرە سیاسەت و چ جۆرە دەزگا و چ جۆرە ئەخلاقیاتێک پێویستە بۆ ئەوەی بکرێت دین و دیموکراسیەت پێکەوە بژین.

کتێبەکە بە ڕەخنەکردنی تێزەی "بەعەلمانیبوونی دونیا" دەست پێ دەکات و لەم ئاستەشدا بەشی هەرەزۆری ئەو ئەرگومێنت و بەهانانە دووبارە دەکاتەوە کە لە سەردەمی نووسینەکانی داڤید مارتینەوە باس دەکرێن. ڤایت بادەر بەتایبەتی بۆ ڕەخنەکانی جۆزێ کازانۆڤا لە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا دەگەڕێتەوە و ئەو تێزە دووبارە دەکاتەوە کە دین نەک تەنها لە دەرەوەی خۆرئاوادا ڕۆڵ و کاریگەریی سیاسیی هەبووە و هەیە و لە سیاسەت جیا نەبووە، بەڵکو لەناو خۆرئاوا خۆشیدا دین بەبەردەوامی بەشێک بووە لە سیاسەت و کاریگەریی لەسەر ژیانی گشتی هەبووە و هەیە. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەش ڤایت بادەر

باس لەوە دەکات کە شێوازی ڕێکخستنی دەزگاییيانەی دین لە خۆرئاوادا فرەجۆرە و زیاد لە ڕێکخستنێکی دەزگای و ڕێکخراویی دین لەو بەشەی دونیادا لەئارادایە. ئەم نووسەرە تا ئەو شوێنە دەڕوات کە بڵێت ناتونین لە هەموو دونیادا یەک دەوڵەت بدۆزینەوە کە عەلمانی بێت و دین و سیاسەت، یان دین و دەوڵەت، یان دین و ژیانی گشتی تیایدا بەتەواوی لەیەکتری جیا کرابنەوە. بە بۆچوونی ڤایت بادەر تەنانەت ئەو دەوڵەتانەی کە کەنیسەی ڕەسمییان نییە، بۆ نموونە ئەمەریکا و فەرەنسا، چەندان ئیجرائات و ڕێکخستنی تایبەتیان هەیە کە بوونەتە هۆی ئەوەی کەنیسە و ڕێکخراوە دینییەکان، بۆ نموونە باج نەدەن و سوود لە پارە و سامانی گشتیی وەر بگرن، تەنانەت لە ولاتێکی وەک فەرەنسادا چەندان قوتابخانەی دینی هەن کە یارمەتیی مادی لە دەوڵەت وەر دەگرن.

لە ئاستێکی دیکەدا ئەم کتێبە بەرگرییەکی تیوری و سیاسی و فەرهەنگییە لە پلورالیزمی ئەخلاقی، پلورالیزمێک کە هەم پێویستی بە تیورەیەکی سیاسی و ئەخلاقیی هەیە، کە ڤایت بادەر ناوی دەنێت "لانی کەمی ئەخلاقیات" و هەم پێویستی بە ڕێکخستنێکی دەزگایی هەیە کە ناوی دەنێت "دەزگاگەرایی" من لە کۆتایی ئەم نووسینەدا لەسەر تێزەی "لانی کەمی ئەخلاقیات" دەوەستم و هێڵە گشتییەکانی بە خوێنەر دەناسێنم، بەڵام لە ڕەهەندە دەزگاییيەکەی بێدەنگ دەبم، چونکە هەم کات و شوێنێکی زۆری دەوێت، هەم ئەو ڕەهەندە دەزگاییيە ناتوانرێت بەگشتی بکرێت و لە هەموو شوێنێکدا داوای دروستکردنی هەمان دەزگا بکرێت.

ئەوەی خوێنەر لێرەدا دەیخوێنێتەوە کورتەی تێزەکانی ئەم نووسەرەیە لەو کتێبە و هەندێک نووسینی دیکەیدا. شایانی باسکردنە ئەمڕۆ لە ناوەندە ئەکادیمییەکاندا، بەتایبەتی لە بواری "کۆمەڵناسیی دین" و "تیورەی سیاسی"دا قسە و باسێکی زۆر لەسەر تێزەکانی ئەم نووسەرە دەکرێت. ئەگەر شتێک هەبێت ناوی دەرچوونی تەواو بێت لە پارادایمی عەلمانیەت بە مانا هەرە کامڵەکەی، ئەوا نووسینەکانی ئەم پیاوە هەڵقەیەکی زۆر گرنگی ئەو دەرچوونەن و کتێبی: "*دیموکراسیەت یان عەلمانیەت*" یەکێکە لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی ئەم دەرچوونە. وەک وتم، ڤایت بادەر بە یەکێک لە دەنگە جیهانییە گرنگەکانی بواری تیورەی دیموکراسی و پلورالیزمی سیاسی و پەیوەندیی نێوان دین و دیموکراسیەت و دین و عەلمانیەت دەزانرێت.

**کێشەی فرەدینی**

بابەتی سەرەکی لە بیرکردنەوەی ئەم نووسەرەدا مەسەلەی پێشکەشکردنی تیورەیەکی تازەیە دەربارەی دیموکراسیەت، بەتایبەتی دیموکراسیەتێک بتوانێت لەگەڵ ئاڵۆزییەکانی دونیای ئەمڕۆ و لەگەڵ دۆخی فرەکولتووری و فرەدینی و فرەئینتیمای ئینسانیی ناو کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا، بەتایبەتی کۆمەڵگا خۆرئاواییەکاندا، بگونجێت. دیموکراسیەتێک بتوانێت پلورالیزمی بەرفراوانی دونیای ئەمڕۆ لەئامێز بگرێت و سنوورەکانی بۆ زۆربەی ئینسان و دین و فەرهەنگ و گرووپە جیاوازەکانی دونیا بکاتەوە.

لە سەرەتای وتاری "*پلورالیزمی دینی: کامیان لە پێشتر بێت، دیموکراسیەت یان عەلمانیەت؟*"دا، ڤایت بادەر هێما بۆ ئەوە دەکات چۆن زۆربەی ئەوانەی لیبرالیزم و سیستمی سیاسیی کۆماریان تیوریزە کردوە، چۆن زۆربەی فێمینست و سۆسیالیستەکان لە باسکردنی دیموکراسیەت و مۆدێرنەدا پێیان لەسەر گرنگیی جیاکردنەوەیەکی دەستووری و یاسایی و ئیداری و سیاسی و کولتووریی سەرتاسەریی دین و دەوڵەت داگرتوە. هەموو ئەمانە پێیان وایە بۆ ئەوەی دیموکراسیەت دروست ببێت پێویستە دین ڕۆڵ لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتیی گشتیدا نەبینێت و کورت ببێتەوە بۆ پەیوەندییەکی شەخسیی تایبەت لەنێوان تاکەکەس و خوداوەندا. هەر لە سەرەتای ئەو نووسینەدا ڤایت بادەر باس لە دوو گفتوگۆی تیوری دەکات کە بەو شێوازە لێکدانەوەیە بۆ پەیوەندیی نێوان دین و سیاسەت، دین و ژیانی گشتی ڕازی نین و نیشانەی پرسیار دەخەنە سەر ئەو خواست و داخوازییە عەلمانییە سەرتاسەرییە. گفتوگۆی یەکەمیان لە بەریتانیا سەر هەڵئەدات، کە تیایدا دەوڵەت خاوەنی کەنیسەی تایبەتی خۆیەتی و دین لە دەوڵەت جیا نەکراوەتەوە بەو مانایەی ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت داوای دەکات. گفتوگۆی دووهەمیان لە ئەمەریکادایە کە دەوڵەت هیچ دینێکی ڕەسمیی نییە، بەلام دین بەشێکی هێجگار گرنگی ژیانی مەدەنی و گشتیی کۆمەڵگای ئەمەریکییە.[1] ئەو پرسیارانەی لەمیانی ئەم

---

1 -Bader, Veit (1999). Religious Pluralism: Secularism or Priority ل۵۹۷-۵۹۸

گفتوگۆیەدا لە بەریتانیا دێنە پێشەوە لەم جۆرەن: ئایا بوونی ئازادیی دینی و مامەڵەکردنی یەکسانی هاوڵاتیان لەلایەن دەوڵەتەوە، پێویستی بەوەیە دین و دەوڵەت لەیەکتری جیا بکرێنەوە یان نا؟ ئایا یەکسانیی سیاسی پێویستی بە جیاکردنەوەی تەواوی دین و دەوڵەتە، واتە پێویستی بە "ناگشتیبوون و بەشەخسیکردن"ێکی تەواوی دین هەیە یان نا؟ هەرچی گفتوگۆکانی ئەمەریکایە پەیوەندیی بە ڕۆڵی دین لە ژیانی گشتییەوە هەیە، خاڵی سەرەکی لێرەدا دیالۆگە لەسەر بوون یان نەبوونی شەرعیەت بۆ ئەو ئەرگومێنت و بەهانە دینییانەی کە لە گفتوگۆ گشتییەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایەدا دەهێنرێنەوە. ئایا ڕاستە ئینسان لە کۆمەڵگایەکی دیموکراسدا بۆ سەلماندنی ڕا و بۆچوونەکانی لەسەر ئەم یان ئەو دیاردەی دیاریکراو، یان لە موناقەشەکردنی گوتارە دەستوورییەکاندا، بتوانێت بۆ ئەم یان ئەو تێکستی دینی، یان بۆ پێدراوەکانی دینێک لە دینەکان، بگەڕێتەوە یان نا؟ ئایا دەکرێت دین بکرێت بە بنەمایەک بۆ سەلماندنی ڕاستی و دروستیی ڕا و بۆچوونەکانی ناو گفتوگۆ گشتییەکان؟ ڤایت بادەر نیشانی ئەدات کە زۆربەی فەیلەسوفە لیبراڵەکانی ئەمەریکا، لەوانەش: دۆرکین، گالستۆن، ئەودی و ڕاوڵز و ئەوانی تر... باوەڕیان وایە بەهاکانی ئازادی و یەکسانی و لێبوردن کاتێک دەتوانرێت باشتر بپارێزرێن، کە دین کرابێتە دەرەوەی ژیانی گشتییەوە و بەشێک نەبێت لێی. لەباتیی ئەمە دین تەنها پابەست بێت بە چۆنیەتیی ڕێکخستنی ژیانی تایبەتیی تاکەکەسەکانەوە. بە بۆچوونی ئەم فەیلەسوفە

لیبرالانە هەم بۆ دۆخی فرەدینی و هەم بۆ دیموکراسیەت خۆشی، وا باشترە کە بەهانە و ئەرگومێنتە دینییەکان بەشێک نەبن لە گفتوگۆ و بەرخوردەکانی ناو ڕووبەری گشتیی کۆمەڵگا.[1]

ئەوەی ڤایت بادەر لە ئەنجامی ئەدات تەحەداکردنی ئەم شێوازە تایبەتەی بیرکردنەوەیە لە پەیوەندیی نێوان دین و سیاسەت، دین و ژیانی گشتییدا، هەروەها پێشکەشکردنی ئەلتەرناتیڤێکی فیکرییە بۆ ڕێکخستنی ئەو پەیوەندییانە لە کۆمەڵگایەکی دیموکراسدا. کتێبی "*دیموکراسیەت یان عەلمانیەت*" وەلامی درێژی ئەم فەیلەسوفەیە بەو بۆچوونانەی سەرەوە.

### دیموکراسیەت بەر لە عەلمانیەت

ئەو خاڵی سەرەتایەی کە ڤایت بادەر لێییەوە دەست پێ دەکات، بریتییە لە جیاکردنەوەی دیموکراسیەت و عەلمانیەت لەیەکتری و بەخشینی ئەولەویەتیش بە دیموکراسیەت نەک بە عەلمانیەت.[2] ئەوەی لای ئەم نووسەرە گرنگە دروستکردنی سیستمێکی دیموکراسییە نەک سیستمێکی عەلمانی. چونکە وەک چۆن کەسان و هێزە دینییەکان پێویستیان بەوەیە فێر ببن ڕێز لە دیموکراسیی لیبرالانە بگرن و وەک چوارچێوەی سەرەکیی ژیانی سیاسی قبووڵی بکەن، ئاواش کەسان و هێزی عەلمانییش

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٩٨

٢ - بڕوانە بەشی سێهەمی کتێبی

"Secularism or Democracy? Associational Governance " ل٩٣-١٢٥

پێویستیان بەو فێربوونە هەیە.[1] هاوکات ڤایت بادەر پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە دەشێت گفتوگۆ و ڕەفتار و بیروبۆچوونی کەس و هێزە دینییەکان دیموکراسییانە بێت، بەڵام بەبێ ئەوەی قبووڵی بکەن دین بۆی نەبێت لە ژیانی گشتیدا ڕۆڵی هەبێت. واتە دەشێت دین هەم ڕۆڵی لە ژیانی گشتیدا هەبێت و هەم بەشێکیش بێت لە سیستمێکی دیموکراسی. واتە دەشێت دین ببێت بە دینێکی دیموکراسی و بەشێک بێت لە پێکهاتی سیستمێکی دیموکراسی، بەڵام هاوکات نەیەوێت ئایدیۆلۆژیای عەلمانیی قبووڵ بکات و بە خواستی ئەو ئایدیۆلۆژیایە خۆی لەناو سنووری ژیانی تایبەتدا سنووردار بکات.

لە بەشی سێیەمی کتێبەکەیدا بە ناوی "من لەبەر چی عەلمانیی نیم" بەرگری لەو دیدە دەکات کە دەوڵەتە لیبرال دیموکراتەکانی ئەمڕۆی دونیا دەوڵەتی عەلمانی نین، بەڵکو دەوڵەتی دەستوورین. ئەم دەوڵەتانە بەرگری لەم دین یان ئەوی تریان، لەم یان ئایدیۆلۆژیی نادینی ناکەن، بەڵکو بەرگری لەو شتە دەکەن کە ڤایت بادەر ناوی "لانی کەمی ئەخلاقیات"ی لیبرال دیموکراسییانەی لێ دەنێت.

لە دیدی ڤایت بادەردا هێزە دینییەکان دەتوانن لە یەک کاتدا هەم دیموکرات بن و هەم ڕۆڵێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گرنگ بە دین لە ژیانی گشتیدا ببەخشن. جگە لەمە هێزە ئوسوڵییەکانیش فرەجۆرن، هەیانە دەکرێت

---

١ - بڕوانە:
Bader, Veit (1999). Religious Pluralism: Secularism or Priority ل
٦١٣-٦١٢

دیدە ئوسوڵییەکانی لەناو چوارچێوەکانی دەوڵەتێکی لیبرال دیموکراسی و دەستووریدا قبووڵ بکرێت و دەتوانن ئۆرگان و رێکخراوی خۆشیان هەبێت، بەلام هەیانە ناتوانن تەنانەت رێزی ئەو لان یکەمی ئەخلاقیاتە بگرن کە ئەو دەوڵەتە پێویستی پێیەتی. ئەوەی گرنگە قبووڵکردنی ئەو لانی کەمەی ئەخلاقیاتی دیموکراسییانە و مەدەنیانە و دەستوورییانەیە. ئەوە گرنگ نییە ئایا ئەو هۆکار و بەهانە و ئەرگومێنتانەی بۆ بەرگریکردن لە دیموکراسیەت دەهێنرێنەوە و بەکار دەهێنرێن، یان ئەو هەڵسوکەوت و پراکتیکانەی کە نیشان ئەدرێن، دینین یان نا، ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئەو بەهانە و ئەرگومێنت و هەڵسوکەوتانە لەگەڵ سەرەتا و ماف و کولتوور و پراکتیکی کۆمەلایەتیی دیموکراسیەتێکی دەستووریدا بگونجێن.[1] دینیبوون و نەبوونی پاساو و بەهانە و پراکتیک و رەوایەتییەکان گرنگ نین، گرنگ ئەوەیە ناکۆک نەبن بە کولتوور و بنەماکانی دیموکراسیەت. (وەک خوێنەر دەبینێت ڤایت بادەر لێرەدا ئەو تێزەی هابرماز تێدەپەڕێنێت کە داوای ئەوە دەکات لە دیالۆگە گشتییەکانی ناو کۆمەڵگادا ئەرگومێنتە دینییەکان تەرجەمە بکرێن بۆ زمانێکی گەردوونیی نادینی، بۆ ئەوەی بتوانن لە رووبەری گشتیدا ئامادە بن و کەسانی نادینییش تێبگەن کەسە دینییەکان چیان دەوێت. ڤایت بادەر پێی وایە دین دەتوانێت بە هەمان زمانی دینیی خۆی بدوێت بە مەرجێک بنەماکانی سیستمی دیموکراسی و مافە

---

١ - بڕوانە:
Secularism or Democracy? Associational Governance ل ٤٩.

بنەڕەتییەکانی تاکەکەس و مافی گروپەکان ژێرپێ نەخات).
بە بۆچوونی بادەر ئەم جیاکارییە گرنگە، واتە جیاکاریی لە نێوان ئەوەی ئایا ئەرگومێنێت و کردەیەک دیموکراسە یان دینییە، چونکە وەک چۆن دەشێت دید و لێکدانەوە و هەڵسوکەوتی دینی هەبێت لەگەڵ دیموکراسیەتدا بگونجێت، بە هەمان شێوە دەشێت دید و لێکدانەوە و هەڵسوکەوتی نادینی و عەلمانییانە هەبێت ناکۆک بێت بە دیموکراسیەت. ڤایت بادەر باس لەوە دەکات کە بەشی هەرەزۆری خراپەکاری و جینۆساید و پاکتاوکردنە ئەتنی و نەتەوەییەکانی سەدەی بیستەم لەلایەن ئایدیۆلۆژیا عەلمانییەکانەوە شەرعیەتیان پێ دراوە. بەڵام بێگومان بەبێ ئەوەی ئەو تاوان و بەربەریەتەش لەبیر بکرێت کە لەلایەن هێزە دینییە ئوسوڵی و توندڕەوەکانەوە ئەنجام دراون. بەکورتی، عەلمانیبوون و دیموکراسیبوون دووانەیەک نین نەتوانرێت لە یەکتری جیا بکرێنەوە، وەک چۆن شوورایەکی گەورە لەنێوان دین و دیموکراسیەتیشدا بوونی نییە. عەلمانیەت دەکرێت بەشێک بێت لە ئەزموونی سیاسی و کۆمەڵایەتیی نادیموکراس و تۆتالیتاری، وەک چۆن دینیش دەتوانێت بەشێک بێت لە هەمان ئەزموونی نادیموکراس و تۆتالیتاری. بۆیە ئەوەی گرنگە ئەوە نییە ئایا ئەرگومێنت و پراکتیکەکان دینین یان عەلمانین، لەناو دینەوە هاتوون یان لە فیکر و دیدێکی عەلمانییەوە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئایا ئەو بیرکردنەوە و پراکتیکانە دیموکراسن یان نا، پلورالیزم و مافی ئەوانی تریان قبووڵە یان نا. ئەوەی لای ڤایت بادەر گرنگە ئەوەیە

هیچیان بە ناوی هەقیقەتێکی ڕەهاوە قسە نەکەن، نەبنە ڕێگر لەبەردەم بیرکردنەوە و تێڕامانی دیموکراسییانەی ئازاد و لەبەردەم بڕیاردانی دیموکراسییانە و ئازاددا. ئەم خاڵە دواتر دێمەوە سەری.

بەم جۆرە ئەوەی بۆ بوونی دیموکراسیەت پێویستە: بوون یان نەبوونی عەلمانیەت نییە، بەڵکو ناٸامادەگی و پەنانەبردنە بۆ هەقیقەتێکی ڕەها کە بتوانێت تواناکانی بیرکردنەوە و ئاڵوگۆڕ و دیالۆگی ئازاد وێران بکات. ئەوەی گرنگە ئامادەگیی پراکتیک و ڕۆحیەتێکی لیبرال و ئازادە لە بیرکردنەوە و هەڵسوکەتی کۆمەڵایەتیدا، نەک ئەوەی ئایا ئەوەی دەگوترێت دینییە یان عەلمانی. ئەوەی بۆ دیموکراسیەت گرنگە بوون و ئامادەگیی دین و نادینێکی لیبرالە، نەک بوون یان نەبوونی دین خۆی، یان بوون یان نەبوونی عەلمانیەت. ئەوەی دەبێت بەرگریی لێ بکرێت ئازادیی ویژدانە، بەرانبەر بە هەر بەهانە و ویست و ئەرگومێنتێک ئەم ئازادییە بۆ هەموو بیرکردنەوە و ویژدانە جیاوازەکان نەسەلەمێنێت. هەر دین یان نادینێک بیەوێت خۆی بە ڕەها بکات و بە ناوی هەموو "ئەخلاقی گشتیی"ەوە، یان بە ناوی "ئەخلاقی کۆمەڵگاوە" یان بە ناوی "هەموو کولتوور"ەوە قسە بکات، شوێنی لە سیستمی دیموکراسیدا نامێنێتەوە. دین و نادینی ڕەهای لەو باباتە ناتوانن بەشدار بن لە دروستکردن و پاراستنی سیستمی دیموکراسیدا. هەر دین و نادینێک بەهانەی موتڵەقیان هەبێت بۆ کارکردنی سیاسی، یان داوای موتڵەقیان لەناو سیاسەتدا هەبێت، یاخود دیدی موتڵەق بەسەر ژیانی دەستووریدا بسەپێنن، یان بە ناوی

هەقیقەتێکی موتڵەقی بێموناقەشـەکردنەوە قسـەیان کـرد و جووڵانـەوە، ناتوانـن بەشـێک بـن لـە سیسـتمی دیموکراسـی.[1] داوای ئوسـوڵییانە لـە سیاسـەت، جا ئـەم ئوسـوڵەیەتە دینی یان نادینی بێت، لـە "ئەخلاقی گشـتی" و لـە "ژیانی گشـتی" داوای نادیموکراتن. پاراسـتنی دیموکراسیەت لە ئەرگومێنت و ویسـتی ڕەهـا ئەرکـی هەمـوو ئەوانەیـە خۆیـان بـە هێـزی دیموکـراس دەزانـن. ڤایـت بـادەر ئـەم دیـدە نـاو دەنێـت دیـدی "بەخشـینی ئەولەویەت بە دیموکراسیەت"، دانانی دیموکراسیەت لـە پێشـی پێشـەوەی شـتەکانی تـر، یەکـەم جـار دیموکراسـیەت و دوای ئـەوە شـتەکانی تر. بۆ ئەمـەش جیاکردنـەوەی دین و سیاسـەت و دیـن و ژیانـی گشـتی پێشـمەرج نیـن. ڤایـت بـادەر لـە ڕێگای نیشـاندانی ئەزموونـی سیاسـی و مۆدێلی حوکمڕانیی ئەمەریکا و بەشـێکی زۆری وڵاتانـی ئەوروپـاوە نیشـانی ئـەدات کـە پەیوەندیی نێوان دین و دەوڵـەت لەم ئەزموونانەدا بەو شێوەیە لەئـارادا نییـە کـە تیـۆرەی عەلمانیـەت باسـی دەکات، دیـن لـەم ئەزموونانـەدا بەشـێکە لـە ژیانـی گشـتی و سیاسـی. لەمەشـدا بەشـێکی زۆری ئـەو نموونـە و ئەرگومێنتانـە دەگێڕێتـەوە، کـە لـە سـەردەمی داڤیـد مارتینـەوە تـا بـە جـۆزێ کازانۆڤـا دەکات بـاس دەکرێـن و نیشـان ئەدرێـن.

### "هەڵە و ڕاستی" لە دیموکراسیەتدا

بـە بۆچوونـی ڤایـت بـادەر دیموکراسـیەت وەک سیسـتم و دەرکردنـی بڕیـاری دیموکراسـییانە وەک کردەیەکـی سیاسـی، پێویسـتیان بـە هەمـوو ڕا و بۆچوونەکانـی نـاو کۆمەڵـگا

[1] - هەمان سەرچاوەی پێشوو ١١٢-١١٣

هەیە. لە هەر کات و شوێنێکدا باس لە پرۆسەی بڕیاردانی دیموکراسییانە کرا، دەبێت ئەوە ئاشکرا بێت کە مافی هەڵەکردن بەقەد مافی ڕاستیگوتن قورسایی هەیە. ئەوەی لە سیستمی دیموکراسیدا گرنگە بوونی هەقیقەتێکی دینیی یان نادینیی ڕەها نییە کە هەمووان ناچار بن گوێی لێ بگرن و پێدراوەکانی بکەن بە یاسا و بە بڕیار، ئەوەی پێویستە گەیشتنی هەموانە، بە دینی و نادینییەوە، بەو قەناعەتەی ئەوەی هەریەکێک لەوان وەک هەقیقەت دەیبینێت و مامەڵەی دەکات، لەناو پرۆسەی بڕیاردانی دیموکراسیدا، دەبێت بە ڕا و بۆچوونێک لەپاڵ ڕا و بۆچوونەکانی تردا. نەک هەر ئەمە، بەڵکو لەناو "ڕووبەری گشتی" و لە بەردەم "عەقڵی گشتی"ی کۆمەڵایەتیدا قورسایی هەر "هەقیقەت"ێک کە بووە بە ڕا و بۆچوون، بەقەدەر قورسایی هەر ڕا و بۆچوونێکی ترە.[1] ئیدی گرنگ نییە سەرچاوەی ئەو هەقیقەتە چ کەس و لایەنێکە، بۆ نموونە ئایەتوڵڵا و مەلا و موفتییەکە، پاپایە یان قەشەیەک، یاخود ڕۆشنبیرێکی عەلمانی و خۆ بە فەیلەسوف و پێغەمبەر زان، یان هەر کەسێکی تر. هەموو ئەمانە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕن، ئەوەی گرنگە فێربوون و قبووڵکردنی گۆڕینی هەقیقەتە بۆ ڕا و بۆچوون. ئەمەش کارێکی ئاسان نییە، دینییەک کە بە ناوی خودا و پێغەمبەرەوە قسە دەکات، زەحمەتە قسەکانی خۆی وەک ڕای خۆی وێنا بکات، یان وەک ڕایەکی دینیی تایبەت، وەک چۆن عەلمانییەک یان مارکسییەک یان لیبراڵێک، زەحمەتە ڕوانینەکانی خۆی وەک

---

١ - بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٣

ڕای خۆی یان ڕایەکی تایبەت ببینێت و ماڵە بکات. هەر ئەمەیە وا دەکات دروستکردنی سیستمی دیموکراسیی کارێکی ئاسان نەبێت. پێویستی بە کردەی فێربوونێکی زۆر هەبێت کە تیایدا هەم دینی و هەم نادینییەکان لەوە تێبگە کە بوونەوەری ڕێژەیی و ئەوەی دەیڵێن لەناو ڕووبەری گشتیی کۆمەڵگادا تەنها ڕایەکە و هیچی تر. بێگومان هەریەکێک لە کەسە دینی و عەلمانییە هەقیقەتگەراکان دەشێت لەناو کۆڕ و کۆمەڵە تایبەتەکانی خۆیاندا بۆچوونەکانیان وەک هەقیقەتی ڕەها و دواهەمین ڕاستی مامەڵە بکەن و ببینن، بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە هاتنە ناو ژیانی گشتییەوە و کە مەسەلەکە هاتە سەر بڕیاردانێکی دیموکراسییانە، ئەودەم هەقیقەتە ڕەهاکانی ئەو کەسانە دەچنە پاڵ چەندان هەقیقەتی کەسانی ترەوە و بەمەش هەموویان دەگۆڕێن و کورت دەبنەوە بۆ ڕایەک لەپاڵ کۆمەڵێک ڕای تردا. ئەوەی دیموکراسیەت پێویستی پێیەتی ئەم گۆڕینی هەقیقەتەیە بۆ ڕا لەناو ژیانی گشتیدا، ئەوەیە هەمووان ئەم "ڕاستییە" فێر ببن، ئەم تێگەیشتنە بۆ هەقیقەت گەشە پێ بدەن. هەم دینییەکان ئەوە فێر ببن کە هەقیقەتەکانیان لە "مەجالی گشتی"دا وەک ڕا ببینرێن و هەم عەلمانییەکانیش دید و بۆچوونە عەقڵیی فەلسەفییەکانیان بە هەمان شێوە، هەم ئەوانەی بە ناوی موقەدەسی دینییەوە ئەدوێن و هەم ئەوانەش بە ناوی موقەدەسی دونیاییەوە، ئەوەی بە ناوی پێغەمبەرەوە قسە دەکات و ئەوەش بە ناوی مارکس و نیتشەوە دەدوێت. واتە مەسەلەکە لە بنەڕەتەوە مەسەلەی فێربوونێکی فرەجەمسەرە، مەسەلەی تێگەیشتنی

هەمووانە لە ڕێژەییبوونی خۆیان لەناو سیستمی دیموکراسیدا. بە مانایەکی تر دیموکراسیەت بۆ ئەوەی دروست ببێت و بژی، پێویستە هەموو هێزەکان بەسەر ڕەهەندە ئوسوڵییەکەی ناو خۆیاندا زاڵ ببن، بەسەر ئەو موتڵەقگەرا و هەقیقەتفرۆش و موقەدەسچییەی لەناویاندا ئامادەیە، سەر بکەون. ئەم کردەی فێربوونە هەم بۆ دینییەکان ڕاستە هەم بۆ نادینییەکان، هەم ڕووی لەوانەیە کە خۆیان بە فەیلەسوف و ئەدیب و زانا دەزانن و هەم لەوانەش خۆیان وەک ئایەتوڵڵا و موفتی و ئەمیری دینی، وێنا دەکەن. ڤایت بادەر باس لەوە دەکات لەنێوان ئەم ڕێگا دینی و ئەم ڕێگا عەلمانییەدا "ڕێگای سێهەم" پێویستە، کە ڕێگای گەیشتنە بە "گەیشتن بە ڕێکەوتن".[1]

بۆ گەیشتن باوەڕبوون بەوەی مۆدێلێکی ئایدیالی و پێرفێکت و بێهەڵە هەیە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان دین و ژیانی گشتی و دین و سیاسەت، ڕێگرێکی گەورەیە لەبەردەم دروستبوونی دیموکراسیەتدا. ئەوەی پێویستە دیالۆگی و گوێگرتنی بەردەوامە لە یەکتری، پەرستنی مۆدێلێکی دینی یان عەلمانی ڕێگرێکی گەورەیە، ئەوەی پێویستە دۆزینەوەی چارەسەری عەمەلی و کردەییە بۆ ئەو کێشانەی دێنە پێش و خۆپاراستنە لە باوەڕبوون بە دیدێکی گەردوونی و لە بوونی مۆدێلێکی پێرفێکت و بێهەڵە کە بۆ یەک جار دروستی دەکەین و تا هەتاهەتایە لەپاڵیدا بەئاسوودەیی دەژین. ئەوەی پێویستە هۆشیارییەکی دیموکراسییانەیە کە ڕێگر بێت لە فۆرمە جیاوازەکانی ئوسڵیەتی پەڕگیر و توندوتیژ کە دژ بە کرۆکی

---

1 -Bader, Veit (2007). Secularism or Democracy? P. 19, 291.

سەرەکیی بەها دیموکراسییە لیبرالییە دەستوورییەکانە.[1] ڤایت بادەر کە باس لە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان دەکات باس لەوە دەکات کە کەنیسە و پیاوانی ئایین و ئەوانی تر ئەم ڕێژەگەراییە زۆر بەباشی فێر بوون، بەڵام ئەوانەی ئەم وانەیە نەک تەنها فێر نەبوون، بەڵکو بیر لەوەش ناکەنەوە فێری ببن، بڕێکی زۆر لە ڕۆشنبیر و لێزان و زانای کۆمەڵایەتی و فەیلەسوفە نادینی و عەلمانییەکانن. بادەر دەڵێت ئەم بۆچوونە تەنها بۆ ئەو فەیلەسوفانە ڕاست نییە کە ئێستا بوون بە مۆدێل و ناوەکانیان لەسەر زاری هەموو کەسێکە، لەوانەش نیتشە و کارل شمیت و هایدگەر، بەڵکو بۆ هەموو ئەوانەش ڕاستە کە لە دیدێکی نوخبەگەرای بەرتەسکەوە تەماشای دیموکراسیەت دەکەن. لە خۆرئاوادا ئەوانە نادیموکراس نین کە بە ناوی دینەوە قسە دەکەن، بەڵکو ئەوانە نادیموکراسن کە بە ناوی هەقیقەتە فەلسەفییە نەمرەکانەوە قسە دەکەن. بە بۆچوونی بادەر مێژووی فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکان پڕە لە ئایدیۆلۆژیا، بەتایبەتی ئایدیۆلۆژیای "زانستی" یان خۆبەزانستیزان، کە پڕن لە هەڵەی گەورە و بۆچوونی ترسناک دەربارەی ئینسان و کۆمەڵگا و چۆنیەتیی ڕێکخستنی پەیوەندییەکان و ئیدارەدان و مامەڵەکردنی جیاوازییەکان. لەوانەش لە "دینی زانستی"ی سان سیمۆنەوە بیگرە، بە تێپەڕین بەناو "ڕاسیسمی زانستی"دا، تا بە داگیرکردنی سیاسەتە دیموکراسییەکانی ئەمڕۆ دەگات لەلایەن ئایدیۆلۆژیای "نیوکلاسیکی ئابووری"ی مۆدێرنەوە. ئەمە جگە

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٩٠.

لە پڕبوونی دونیای ئەمڕۆ لە ڕا و بۆچوون و هەڵسوکەوتی ئەو ژمارە زۆرە لە "خەبیر" و "شارەزا" کە زۆربەیان بە ناوی زانست و فیکر و فەلسەفەوە وەک هەقیقەتگەرا و ڕاستیفرۆش قسە دەکەن، کەچی زۆر جار ئەمیان تەواو ناکۆک بەوی تریان قسە دەکات. بە بۆچوونی ڤایت بادەر هەموو ئەمانە دەبێت فێری ئەوە ببن کە ئوسوڵییەکەی ناویان بکوژن و چارەسەری کێشەی ئوسوڵیەتی فەلسەفی و زانستی و فیکریی خۆیان بکەن. ئەم هەقیەتگەرایانە دەبێت لە بیرکردنەوە و دانوسانی دیموکراسییانەدا لەوە تێبگەن کە هەقیقەتەکانیان لە بۆچوونێک لەپاڵ بۆچوونەکانی تردا زیاتر نییە. بەکورتی ئەوەی ڤایت بادەر لێرەدا دەیڵێت ئەوەیە کە چەندە دینییەکان پێویستیان بەم فێربوونە هەیە بۆ ئەوەی دین و دیموکراسیەت بەیەکەوە بگونجێنن، بە هەمان شێوە نادینییەکانیش پێویستیان بە هەمان پرۆسەی فێربوون هەیە.

ئەوەی دەبێت ئاگامان لێ بێت ئەوەیە، کە ڤایت بادر ئەو قسانە لەسەر کۆمەڵگا خۆرئاواییەکانی ئەمڕۆ دەکات، بێگومان ئەو دۆخەی لە دونیای ئێمەدا ئامادەیە تەواو لە دۆخی بڕێکی زۆری کۆمەڵگاکانی خۆرئاوا جیاوازە، لای ئێمە نە دینییەکان دیموکراسن و نە نادینییەکان، نە عەبدولناسر و سەدام حوسەین دیموکراس بوون، نە خومەینی و پاشای سعودیە، نە ئەوانەی بە ناوی پێغەمبەر و ئەسحابەکانەوە ئەدوێن، نە ئەوانەش بە ناوی فیکر و فەلسەفە و زانست و پێشکەوتن و تازەگەری و داهێنانەوە. دونیای ئێمە پڕە لە ئوسڵی دینی و ئوسوڵی فیکری، لە هەقیقەتگەرای دینی

و لـە هەقیقەتفرۆشـی نادینـی و فەلسـەفی. بۆیـە مەسـەلەی فێربوونـی دووجەمسـەرە، کـە خاڵێکـە ڤایـت بـادەر زۆر پێـی لەسـەر دادەگرێت بۆ کۆمەڵگا خۆرئاواییـەکان، بۆ کۆمەڵگای ئێمـە سـەرەتای هـەرە سـەرەتاکان و هەنگاوی ژمـارە یـەک و مەسـەلەیەکی لەڕادەبەدەر گرنگە. لای ئێمـە هـەم بۆ ئـەو نوخبە ڕۆشـنبیر و سیاسـییە عەلمانییـە کـە کۆمەڵگا وەک ئاژەڵێکـی گەمـژە دەبینێت، هـەم بـۆ ئـەو نوخبـە دینییـە کـە دەرەوەی دین وەک سـەرزەمینی کوفر و بەدڕەوشتی وێنا دەکات، هـەم ئەوانـەی بـە نـاوی ناردنـەوەی دینـەوە بۆ ماڵـەوە قسـە دەکەن و هەم ئەوانەش دین دەبنە ناو هەموو وردەکاری و تەفاسیلەکانی ژیانـەوە، پێویسـتیان بـەو وانـە سـادە و سـەرەتاییانە هەیـە. ئـەو ئیسـلامییانەی کـە یـەک سـەدەی ڕەبەقـە قسـە بـە عەلمانیـەت دەڵێن و وەک دێو و ئەهریمەنێکی خۆرئاوایی سـەیری دەکـەن و ئـەو عەلمانییانـەش کە پێیـان وایـە دیـن ئیشـێکی ئەوتـۆی لـە دونیـای ئەمـڕۆدا نەمـاوە و مرۆڤـی دینـی جگـە لـە مرۆڤێکـی گەمـژە زیاتـر نییـە، دەبێـت ببرێنـە قوتابخانـە و سـەرلەنوێ پـەروەردە بکرێنـەوە. بـەڵام پەروەردەیـەک تیایـدا لانـی کەمـی ئەخلاقیاتـی دیموکراسـیی لیبرالیـی دەسـتووریی ئامـادە بێت و مرۆڤێک پـەروەردە بکات بتوانێت ڕێژەگـەر بێت و ئەوانـی تر وەک خۆیـان قبـووڵ بـکات، تـا ئـەو سـنوورەی ئـەو قبوڵکردنـە نابێت هـۆی وێرانکردنـی ئـەو لانـی کەمی ئەخلاقیاتـەی باس کرا. وەک پێشـتریش وتـم، هەمـوو فۆرمێک لـە فۆرمەکانی دین لەگەڵ دیموکراسـیەت و ئەخلاقیاتـی دیموکراسـیەتێکی دەسـتوریدا ناگونجێـت. بۆیـە پرسـیاری سـەرەکیی ئەوەیـە ئایـا دینێـک

لەگەڵ دیموکراسیدا بگونجێت کام ئاکار و دەرکەوتی هەیە؟ ئەگەر ئەولەویەت بۆ دیموکراسیەت بێت ئایا ئەو دینەی ئەم ئەولەویەتە قبووڵ دەکات چ ئاکارێکی هەیە؟ بە مانایەکی دیکە دیموکراسیەت لەگەڵ هەموو دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی دیندا ناگونجێت، بۆ ئەوەی دین و دیموکراسیەت بتوانن پێکەوە بژین پێویستە دین بچێتە ناو پرۆسەیەکی مێژوویی گرنگی فێربوونەوە. بەخشینی ئەولەویەت بە دیموکراسیەت کۆمەڵێک داواکاریی تایبەتی لە دین هەیە کە ڤایت بادەر لەو خاڵانەی لای خوارەوەدا کورتیان دەکاتەوە.

**کام داواکاری لە دین؟**

بەخشینی ئەولەویەت بە دیموکراسیەت، یان دانانی دیموکراسیەت لە پلەی یەکەمدا، کۆمەڵێک داواکاری هەم لە دین و دینداران هەیە، هەم لە کەس و هێزە نادینی و بێدین و دژەدینەکانیش. لێرەدا و لەم پێنج خاڵەدا ئەو داواکارییانەی ڤایت بادەر باسیان دەکات کورت دەکەمەوە:[1]

یەکەم: وازهێنان لەو بۆچوونەی کە پێی وایە پێویستە ئەخلاق هەمیشە بنەمایەکی دینیی هەبێت، ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە ئەگەر دین نەبێت شتێک بە ناوی ئەخلاقەوە بوونی نابێت و نامێنێتەوە. ئینسان دەشێت دینی هەبێت و بەدئەخلاق بێت، دەشێت بێدینیش بێت، بەڵام کەسێکی ئەخلاقی بێت. واتە پێویستە واز لەو دیدە بهێنرێت کە دین وەک بنەمایەکی ڕەهای ئەخلاق دەبینێت و دەرەوەی دینیش

---

١ - بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٢، ١٢٣، ١٢٤.

وەک سەرزەمنی بەدئەخلاقی. ئەمەش مانای کرانەوە بە ڕووی ئەگەری بیناکردنی ئەخلاق لەسەر دید و بۆچوونی نادینی و تەنانەت دژەدینیش. کێشەکە لەوەدایە زۆرێک لە ئیمنادارن و پیاوانی دین پێیان وایە سەرەتا و کۆتایی ئەخلاق لە دیندایە، ئەگەر یاسایەکی دینیی موقەدەس و ئەگەر خودایەکی دینیی بە ئاسمانەوە بوونی نەبێت لە دونیاکەی تردا لە مرۆڤ بپرسێتەوە، مرۆڤ ترسی لە هیچ شتێک نامێنێت و هەموو ئەو شتانە ئەنجام ئەدات کە نابێت ئەنجامیان بدات. ئەمە وا دەکات هەم دین و هەم پیاوانی دین و هەم زۆرێک لە ئیماندارانیش شتێک بە ناوی ئینسانیەت لە دەرەوەی دیندا، یان بە ناوی بوونی بنەمای ئینسانیی نادینییەوە بۆ ئەخلاق، نەبینن. وازهێنان لەم تێڕوانینە و گرێنەدانەوەی ئەخلاق بەتەنها بە دینەوە، پێداویستییەکی گرنگی دروستکردنی ژینگەیەکی دیموکراسە.

دووهەم: وازهێنان لەو دیدەی کە پێی وایە عەلمانیبوون و دونیاییبوون مانای نوقمبوونێکی حەتمی و بێسنوور لەناو بەرخۆری و گەڕان بەدوای لەزەت و سەرقاڵبوون بە ڕابواردنی بەردەوامەوە، هەروەها وازهێنان لە یەکسانکردنی عەلمانیبوون و دونیاییبوون بە بەهێزکردنی ئەنانیەت و باڵادەستکردنی غەریزەی مادی و وێرانکردنی ڕۆحانیەت هتد... ئەمەش مانای وازهێنان لە بەرگریکردن لە دین وەک تاکە ئەلتەرناتیڤێکی گشتیە بۆ ئەو دۆخە کە گوایە عەلمانیەت وێرانی کردوە و وێرانی دەکات.

سێهەم: وازهێنان لەو بیرۆکەیەی کە پێی وایە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دەسەلات و ستەمی دەولەت و بۆ

ڕێگەگرتن لەوەی دەسەڵاتی ڕێکخراوی دەوڵەت ببێتە دەعبایەکی گەورە و زەبەلاح، بەردەوام گەڕاندنەوە بۆ دین و بۆ خودا پێویست بێت. چونکە بۆ دانانی بەربەست لەبەردەم بوونی دەوڵەت بە دەعبایەکی تۆقێنەردا، کە توانای هەڵلووشینی کۆمەڵگای هەبێت، دەکرێت ئینسان بێجگە لە پەنابردن بۆ دین و خودا، پەنا بۆ میکانیزمی تر ببات، لەوانەش بەهێزکردنی کۆمەڵگای مەدەنی، بەهێزکردنی فۆرمە جیاوازەکانی پلورالیزم و بەرگریکردن و داواکردنی لیبرالیزم و ئازادیی و مافی زیاتر. ئەمەش مانای تێگەیشتن لەو ڕاستییە کە لە دۆخێکدا کە دەوڵەت خەریکە دەبێت بە درندە و دەعبایەکی گەورە، دین شتێکی نییە زیاتر و باشتر بێت لەو ئامرازە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییانەی تر کە دەکرێت بە هۆیانەوە ڕێ لە دیاردەی دەوڵەتپەرستی و دەسەڵاتگەری و ستەمی ڕەها، بگیرێت.

چوارهەم: وازهێنان لەو دیدەی کە مافەکانی مرۆڤ و بیرۆکەکانی تر سەبارەت بە ئازادیی لیبرالانە بە "خۆرئاوا" و "دینی مەسیحی" و " جوولەکەوە" گرێ بدرێن. وازهێنان لە نیشاندانی ئەم مافانە، لە سەرێکەوە وەک دەرکەوتی دینی مەسیحی و جوولەکە و لە سەرێکی دیکەوە گرێدانیان بە "کولتوور"ێکی گریمانکراوەوە بۆ خۆرئاوا. نەبەستنەوەی ئەم دەسکەوتە مۆدێرنانەی مێژووی ئینسان بەم یان بەو دینی تایبەت و بێبەشنەکردنی ئەم یان ئەو دینی تر لێیان، هەنگاوێکی گرنگی خۆگونجاندنە لەگەڵ دیموکراسیەتدا. ئەمەش مانای دوورکەوتنەوە لە دوو بەهانە و ئەرگومێنێت. یەکەمیان نەبەستنەوەی ئەم دەسکەوتە ئینسانییە گرنگانە

بە مەسیحیەت و دینی جوولەکە و کولتووری گریمانکراوی خۆرئاواوە. دووهەم: وازهێنان لەو دیدەی کە پێی وایە ئەم دەسکەوتانە لەگەڵ ئەم یان ئەو دینی تردا ناگونجێن، یان بنەما ئەخلاقییەکانیان بەم یان بەو کولتوورەوە گرێ دراوە و بەکەڵکی کولتوورەکانی تر نایەت. لە ئاستە تیورییەکەدا ئەمە مانای دوورکەوتنەوە لە کولتوورگەرایی و مامەڵەنەکردنی دیاردە سیاسییەکان وەک دیاردەی کولتووری. مافەکانی مرۆڤ بەشێک نییە لە کولتووری ئەم یان ئەو میلەت و ئەم یان ئەو دین، بەڵکو بەشێکە لە کولتووری سیاسیی مۆدێرن کە پابەستەی خەباتی چەندان سەدەی چین و گروپ و میلەتە جیاوازەکانی دونیایە.

پێنجەم: هەموو ئەوانەی دەیانەوێت لە کۆمەڵگایەکی دیموکراس و پلورالدا بژین دەبێت ئامادە بن هەندێک تەنازولات بکەن، قوربانی بە بەشێک لە خواست و چاوەڕوانییەکانیان بدەن، باجی ئەوە بدەن کە بەتەنها لە کۆمەڵگادا ناژین و ئەوەی ئەوان بە هەقیقەتی دەزانن بۆ هەمووان هەقیقەت نییە. واتە تێگەیشتن لەو ڕاستییەی کە هەموو کۆمەڵگایەک کۆمەڵگایەکی پلورالە، کۆمەڵگایەکی فرەبۆچوون و فرەدین و فرەچاوەڕوانی و فرەتەماح و فرە بەهایە. ئەمەش مانای ئەوەی هەموو ئەوانەی دەیانەوێت لە کۆمەڵگایەکی دیموکراسدا بژین پێویستە هەندێک شت قبووڵ بکەن کە قبووڵکردنی لە ناچارییەوەیە نەک لە حەزەوە، باجی ئەوە بدەن کە دونیا لەگەڵ کەسانی تردا دابەش دەکەن، نەک لە دونیایەکی یەکدەنگ و یەکڕەنگ و یەکباوەڕ و یەکبۆچووندا دەژین.

**کام داواکاری لە فیکری نادینی؟**

لەپاڵ ئەو داواکارییانەی سەرەوەدا لە دین، ڤایت بادەر پێی وایە کە بەخشینی ئەولەویەت بە دیموکراسیەت کۆمەڵێک داواکارییشی لە فیکری نادینی هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت ببێت بە بەشێک لە دونیایەکی دیموکرات. ڤایت بادەر کە باس لە فیکری نادینی دەکات دەستەواژەی "فەلەسەفە" بۆ ناساندنی ئەم فیکرە بەکار دەهێنێت، باس لەو شێوازە لە فیکر دەکات کە عەقلانییە و بەرخورد و گریمانە و پاسادانەکانی بە ناوی عەقڵ و زانستەوە پێشکەش دەکات. بۆ ئەوەی دیموکراسیەتی لیبرالی بتوانێت لە دونیای ئەمڕۆدا بە شێوەیەکی گونجاو کار بکات، پێویستە فیکر لەو شتە ڕزگاری ببێت کە بادەر ناوی دەنێت "ئیمپریالیزمی فەلسەفی". مەبەستی بادەر لەم بۆچوونە پەیڕەویکردنی کۆمەڵێک خاڵە، لەوانە بۆ نموونە:

یەکەم: لە کۆمەڵگای دیموکراسیدا هەڵسوکەوت و پرنسیپەکانی دیموکراسیەت لە هەموو ئەو تیورە "فەلسەفییە گەورانە" گرنگترە کە هەر یەکێکیان بە شێوەیەکی تایبەت و زۆر جار ناکۆک بەوی تریان باس لە چییەتیی کۆمەڵگا دەکەن و هەریەکێکیان "بنەما" و "جەوهەر" و "کۆڵەکە"ی تایبەت بە بنچینەی ژیانی کۆمەڵایەتی دادەنێن. لەباتیی ئەمانە و هەوڵدان بۆ زاڵکردنی یەکێکیان بەسەر ئەوی تریاندا ئەوەی گرنگە دەستەبەرکردنی ئەخلاقیاتێکی گشتیی ئازاد و دادپەروەری سیاسییە، فراوانکردنی ئەو جۆرەیە لە هەڵسوکەتی کۆمەڵایەتی و دامەزراندنی ئەو تۆڕەیە لە دەزگا،

کە دەتوانن دیموکراسیەت بپارێزن. لەم ڕووەوە وەک چۆن دەستەبەرکردنی مافەکانی مرۆڤ پێش هەموو تیورەیەک دەکەوێت دەربارەی ماف، ئاواش دەستەبەرکردنی هەڵسوکەتی دیموکراسییانە و پاراستنی پرنسیپە سەرەکییەکانی، پێش هەر تیورەیەک دەکەوێت بیەوێت پێمان بڵێت کۆمەڵگا چییە و ئینسان چۆن هەڵسوکەوت دەکات. ئەمەش مانای ئەوە نییە دیموکراسیەت سیستمێکی ناتیورییە، پێویستی بە دۆخێکە دژ بە تیورە و تیوریزەکردن، واتە مانای دروستبوونی دۆخێک نییە کە دژی تیوریزەکردن بێت، بەڵکو مانای هێنانەکایەی دۆخێکە تیورەی تەماح گەورەی تێدا نەبێت. فیکرێک تیایدا باڵادەست نەبێت هەڵگری ڕۆحێکی ئیمپریالییانە بێت، تیورەیەک نەیەت بە ناوی فیکر و فەلسەفە و زانستەوە دەست بخاتە ناو هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی ئینسان و هەموو "جەوهەر"ە گریمانکراوەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگامان بۆ شی بکاتەوە. لەباتیی ئەمە دیموکراسیەت پێویستی بە تیورەی کەمتەماحە، پێویستیی بە زانیارییەکە لە ڕێژەییبوونی خۆی ئاگادار بێت، موتڵەقگەرا و هەمووشتزان نەبێت. واتە دیموکراسیەت ئەو جۆرە تیورانەی ناوێت کە دەیانەوێت هەمووشتێک لێک بدەنەوە و بەدوای "بنەما سەرەکییەکان" و "جەوهەرە قووڵەکان" و دەستەواژەی گشتیی تری لەم بابەتە، کە تەواو ترسناک و تۆتالیتارن، بگەڕێت.

دووهەم: دانانی دیموکراسیەت لە پلەی یەکەمدا تەنها مانای خۆڕزگارکردن نییە لە پاشماوەکانی ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت، بەڵکو مانای دەرگاکردنەوەشە بۆ سەرجەمی ئەو

بەرخورد و ئەرگومێنتە دینییانەش کە لەگەڵ دیموکراسیەتی لیبرالانەدا دەگونجێن. ئیتر گرنگ نییە ئەم ئەرگومێنتە لە ئایینی مەسیحییەوە یان دینی بوزا یان جوولەکە یان ئیسلام یان هەر ئایینێکی ترەوە هاتووە یان نا. ئەم ئەرگومێنتانەش مەرج نییە هەمیشە دەرەنجامی بیر و ڕا و زانیاریی عەقڵانی و سەلمێندراو بن، بەڵکو دەشێت جۆرێک لە "زانیاریی عەمەلی" و تەنانەت جۆرێک لە حەز و هەستی تایبەتییش بێت. بەکورتی، ئەوەی کە دەبێت وازی لێ بهێنرێت: دوورکەوتنەوەیە لە پێناسەیەکی نوخبەوی بۆ ئەوەی چی عەقڵانی و چی ناعەقڵانییە، چی دەکرێت بەشێک بێت لە عەقڵی گشتی و چی نابێت بەشێک بێت لەو عەقڵە.

سێهەم: ڕێنەگرتن لە هەر جۆرە گفتوگۆ و دیالۆگ و موناقەشەیەکی گشتیی بە ناوی ئەوەوە گوایە نازانستین و لەگەڵ فیکر و فەلسەفە و عەقڵ و عەقڵانیەتدا یەک ناگرنەوە. واتە لەباتیی ئەوەی بە ناوی فەلسەفە و فیکر و عەقڵ و عەقڵانیەتەوە ڕێ لە موناقەشەکردنی گشتیی زۆر بابەت بگیرێت و نەهێڵدرێت هەندێک ڕا و بۆچوون دەر ببڕدرێن، پێویستە گفتوگۆ گشتییەکان کراوە بن بە ڕووی هەموو هەقیقەتەکاندا، بە مەرجێک ئەو گفتوگۆیانە بە زمانێک بکرێت خەڵک بتوانێت لێیان بگات و بە شێوەیەکی مەدەنی و شارستانییش ئەنجام بدرێن.

چوارەم: ئەوەی کە دەبێت چاوەڕوان بکرێت، ئەوە نییە زانست و فیکر و فەلسەفە یارمەتیمان بدەن بەسەر زۆرێک لە ناکۆکییەکانماندا زاڵ ببین و خۆمان لە جیاوازییەکانمان

ڕزگار بکەین. جیاوازییەکان هەن و دەمێنن و فیکر و زانست ناتوانن بنبڕیان بکەن و بیانسڕنەوە. ئەمەش مانای ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە نەبین زانیاریی گشتی و زانست و فەلسەفەی ئەخلاقیی بەرەوە ئەوەمان ببەن لەگەڵ یەکتریدا ڕێک بکەوین و ناکۆکییەکانمان لەبیر بکەین. لەباتیی ئەمە پێویستە خەریکی دۆزینەوەی شێواز و ڕێگەچارەی شارستانی و ڕێزبەخشانە بین بۆ ڕێکخستنی ژیانمان لەگەڵ یەکتریدا بە هەموو جیاوازییەکانمانەوە. دۆزینەوەی ڕێگاچارەی تایبەت بۆ ئەوەی بتوانین بە جیاوازی و ڕێکنەکەوتنەکانمانەوە لەگەڵ یەکدا بژین. بۆ ئەم مەبەستەش ئەوەی گرنگە پەروەردکردن و دەستەبەرکردنی فەرهەنگی لیبرال دیموکراسی و بەهێزکردنی مەیل و عادەت و کەلەپووری نرخاندنی باش و هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە یەکتری. ئەمەش دەکرێت لە ڕێگای خوێندن و پەروەردە و پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە ئەنجام بدێت، یان لە ڕێگای ژیان و هەڵسوکەوتەوە لەناو تۆڕێک دەزگای دیموکراسیدا. بەکورتی، دەبێت واز لەو تێگەیشتنە بهێنین کە فیکر و زانست و فەلسەفە و ئەدەبیات ئینسان ڕزگار دەکەن و کۆتایی بە ناکۆکی و ململانێ و جیاوازییەکان دەهێنن.

بەکورتی، ئەوەی ڤایت بادەر باسی دەکات دروستبوونی کۆمەڵێک گۆڕانی دیموکراسییانەی دووسەرەیە، هەم لای هێزە دینییەکان و هەم لای هێزە نادینییەکان. ناکرێت چاوەڕوانی دروستبوونی سیستمێکی دیموکراسی بین بەوەی تەنها داوای گۆڕانکاریی لە دین و هێزە دینییەکان بکەین، بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی دروستبوونی هەمان گۆڕانکاری بین لای نادین

و کولتوورگەرا و هەقیقەتفرۆش و زانستچی و فەیلەسوف و خوێندەوار و نیمچەخوێندەوارە عەلمانییەکان.

ئەو داواکارییانەی سەرەوە لە دین و لە نادین بەشێکە لە دیدێکی تایبەت سەبارەت بە شێوازێک لە ئەخلاق، کە کۆمەڵگای دیموکراس و پاراستنی بەها سەرەکی و بنەڕەتییەکانی سیستمێکی دیموکراسی لیبرالی دەستووری، پێویستی پێیەتی. ڤایت بادەر ئەو ئەخلاقە تایبەتە ناو دەنێت ئەخلاقیاتی جیاواز، Differentiated morality.

**ئەخلاقیاتی جیاواز**

لە بەشی دووهەمی کتێبەکەیدا ڤایت بادەر دێتە سەر باسکردنی ئەو فەلسەفە سیاسییەی کە ئەولەویەت بە دیموکراسیەت ئەدات و بنەما فەلسەفی و ئەخلاقییەکانی دەستنیشان دەکات. ڤایت بادەر لێرەدا تێزەی "ئەخلاقیاتی جیاواز"، differentiated morality پێشنیار دەکات و لەم ڕووەوە چوار شێوازی ئەخلاقیات لە یەکتری جیا دەکاتەوە.[1]

یەکەم: "ئەخلاقیاتی لانی کەم"ە، کە مافی پاراستنی ژیان و بژێوی و ژیان لە ئاساییشدا دەستەبەر دەکات.

دووهەم: "ئەخلاقیاتی زیاتر لە لانی کەم" کە دەستەبەری هەموو مافە مەدەنییەکان و سیاسییەکانیش دەکات.

سێیەم: "ئەخلاقیاتی یەکسانی" کە مافی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووریی یەکسان بۆ هەمووان دەستبەر دەکات.

چوارەم: "ئەخلاقیاتی یەکسانیی زیاتر" کە ڤایت بادەر

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧٢، ٧٣، ٧٤

بە ئەخلاقیاتی سیستمێکی دیموکراسی لیبرالیی پێرفێکت و بێهەڵەی ناو دەبات.

ئەوەی ئەم چوار شێوازە لە ئەخلاقیات لە یەکتری جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە لە یەکەمیاندا مافی کەمتر و لە چوارەمیاندا مافی زۆر زیاتر بۆ ئینسان دەستەبەر دەکرێت. ڤایت بادەر پێی وایە بۆ دروستبوونی دیموکراسییەت ئەوەی پێویستە پەیڕەویکردنی "ئەخلاقیاتی لانی کەم"ە. واتە پێشمەرجی دروستبوونی دیموکراسیەت، لەباتیی ئەوەی عەلمانیەت بێت، دەستەبەرکردنی "ئەخلاقیاتی لانی کەم"ە. ئەم ئەخلاقیاتە کۆمەڵێک مافی بنەڕەتیی دەگرێتە خۆی، کە دەکرێت وەک لانی کەمی مافەکان پێناسە بکرێن کە پێویستە ڕێزیان لێ بگیرێت و دابین بکرێن بۆ ئەوەی دیموکراسیەت بتوانێت وەک سیستم ئامادە بێت. سێ شێوازەکەی تری ئەخلاقیات مافی زیاتر و دەسکەوتی زیاتر دەستەبەر دەکەن کە دیموکراسیەت لەدوای دروستبوون و لە ڕێگای گەشەکردن و پێشکەوتنیەوە دەتوانێت دەستەبەریان بکات. من لێرەدا شوێن و کاتی ئەوەم نییە بەدرێژیی باسی هەر چوار شێوەکەی ئەو ئەخلاقیاتانە بکەم، بۆیە تەنها باس لە "ئەخلاقیاتی لانی کەم" دەکەم، کە ڤایت بادەر ئامادەبوون و ڕەچاوکردنی وەک پێشمەرجی دروستبوونی دیموکراسیەت مامەڵە دەکات.

### ئەخلاقیاتی لانی کەم

ئەم "ئەخلاقیاتی لانی کەم"ە مانای دابینکردن و پاراستنی کۆمەڵێک مافی سەرەتایی، بەلام بنەڕتی، بۆ ئەوەی بکرێت

سیستمێکی دیموکراسی لیبرالی دروست بکرێت و بپارێزرێت. لەدوای دابینکردنی ئەم مافە سەرەتایی و بنەڕەتییانەوە و لە ڕێگای فێربوون و گەشەکردنەوە، بتوانرێت بەرەو دەستەبەرکردنی دەسکەوت و مافی زیاتر بۆ تاکەکەس و گروپەکان گەشە بکات. ئەخلاقیاتی لانی کەم یان لانی کەمی ئەخلاقیات دەستەبەرکردنی ئەم حەوت مافە بنەڕەتییانە دەگرێتەوە:[1]

١- مافی هەبوونی ئاسایش و بژێوی

٢-مافی ژیان و مافی ئازادی و مافی پاراستنی جەستە لە توندوتیژی

٣-مافی دابینکردنی بژێوی و خوێندن و خزمەتگوزاریی بنەڕەتی

٤- مافی لانی کەمی مامەڵەکردنێکی مافپەروەرانە

٥-مافی لانی کەمی ڕێزگرتن

٦- مافی ئازادیی ویژدان (کە مافی بوون و نەبوونی دین و مافی گۆڕینی دین و دەرچوون لە دینیش دەگرێتەوە.)

٧-مافی مامەڵەکردنی ئینسان وەک بکەر و کەسایەتییەکی یاسایی سەربەخۆ

ئەم حەوت مافە پێویستە هەم دیندار و هەم بێدین، هەم هێزە دینییەکان و هەم هێزە نادینییەکان ڕێزی بگرن و لەسەری ڕێک بکەون بۆ ئەوەی بتوانن بەیەکەوە سیستمێکی دیموکراسیی قابیلی گەشەکردن و پێشکەوتنی زیاتر دروست بکەن و مافەکان تا دێت زیاتر بکەن.

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧٢

ئەوەی لەو لیستی مافدا ئاشکرایە هێما نەکردنە نە بۆ دین و نە بۆ عەلمانیەت. ئەم مافانە کە دەستەبەرکردنیان بنەمای دروستبوونی دیموکراسیەتە، دەکرێت هەم لە ڕێگای دینەوە و هەم لە ڕێگای فیکری نادینییەوە بەرگرییان لێ بکرێت و ڕەوایەتییان پێ ببەخشرێت. مەسەلەی سەرەکی لەم مافانەدا دروستکردنی ناکۆکی نییە لەنێوان دین و عەلمانیەتدا، بەڵکو بریتییە لە بوونی ناکۆکی لەنێوان دیموکراسبوون و نادیموکراسبووندا، لەنێوان لیبرالبوون و نالیبرالبووندا، لەنێوان دەستەبەرکردنی ئەو مافانە و دەستەبەرنەکردنیاندا. ئەوەی دەبێت هەوڵی بۆ بدرێت دروستکردنی ناکۆکیی نییە لەنێوان دینیبوون و عەلمانیبووندا، بەڵکو ڕازیکردن و ئامادەکردنی هەموو لایەنەکانە، بە دینی و نادینییەوە، بۆ قبووڵکردنی ئەو لانی کەمی ئەخلاقیاتە و ئەو مافە دیموکراسییانەی بەو ئەخلاقیاتەوە گرێ دراوە. مەسەلەی چۆنیەتیی مامەڵەکردنی دەوڵەت بۆ کەسانێک کە دینین و بۆ کەسانێکی تر کە نادینین، یان دژەدینین، مەسەلەی چۆنیەتیی مامەڵەکردنی بوونی جیهانبینی و شێوەژیانی جیاواز لە کۆمەڵگادا، بەوە نابێت دەوڵەت بڵێت نابێت شێوەژیانی دینی و ئەرگومێنتی دینیی بەشێک بێت لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگا، بەوەش نابێت داوای جیاکردنەوەی دین و سیاسەت لەیەکتری بکرێت، بەڵکو بەوە دەبێت دەوڵەت پێ لەسەر قبووڵکردن و سەلماندنی ئەو لانی کەمی ئەخلاقیاتە لای هەمووان دابگرێت و بەرگری لە بەخشینی ئەولەویەت بە دیموکراسیەت بکات.

ڤایت بادەر پێی وایە هەڕەشەکردن لەو مافانەی سەرەوە، یاخود پێشێلکردن و پەراوێزخستنیان، دەکرێت هەم لەلایەن

هێزی دینییەوە ڕوو بدات، هەم لەلایەن هێزی عەلمانییەوە. نە عەلمانیەت و نە دین ناتوانن وەک پارێزەر و دەستەبەرکەرێکی ئۆتۆماتیکی و خۆبەخۆ و پێشینی ئەو مافانە ببینرێن، بەڵکو هەم هێزە دینییەکان و هەم هێزە عەلمانییەکان دەبێت خۆیان لەگەڵ ئەو مافانەدا بگونجێنن، فێر ببن ڕێزیان بگرن و بیانکەن بە بەشێک لە بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی خۆیان. ئەمەش مانای ئەوەی هەردوو لا ببن بە هێزی دیموکرات، هەردوولا فێری ڕێزگرتنی ئەو مافانە ببن و بیکەن بە بەشێک لە بیرکردنەوە و پراکتیکی سیاسیی خۆیان. ڤایت بادەر پێی وایە هەم مێژووی دین و هەم مێژووی عەلمانیەت پڕیەتی لە هێرشبردن بۆ سەر ئەزموون و فیکری دیموکراسی، هەم پڕیشیەتی لە نموونەی پاڵپشتیکردن لە دیموکراسیەت و هەوڵدان بۆ بەرقەرارکردنی. (دەبێت لێرەدا ئەو خاڵەمان لەبەرچاو بێت کە ڤایت بادەر باس لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ناکات، چونکە لەم ناوچەیەدا نە دین لەگەڵ دیموکراسیەتدا تەبایە و نە عەلمانیەتیش، لەم ناوچەیەدا پێویستە هەردوو بەرەکە فێری ئەوە ببن کە ببن بە دیموکرات و ئەو لانی کەمی ئەخلاقیاتە قبووڵ بکەن کە باسمان کرد.)

## دەوڵەت و دین

دواهەمین خاڵێک بمەوێت لێرەدا باسی بکەم هەڵوێستی دەوڵەت خۆیەتی لە دین. ئایا دەوڵەت لەم پرۆسەی فێربوون و پاراستنەی "لانی کەمی ئەخلاقیات"دا چ هەڵوێستێکی لە دین هەبێت؟ ئایا دەوڵەت پێویستە بە درێژایی کات و لە هەموو ڕەوتێکدا بێلایەن بێت بەرانبەر بە دین و گروپە دینییەکان؟

لەم ئاستەدا ڤایت بادەر باس لە گرنگیی سەربەخۆبوونی دەوڵەت بەرانبەر بە دین دەکات، پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە دەوڵەت پێویستە بە یەک مەسافە بەرانبەر بە هەموو دینەکان و نادینەکان بوەستێت. فەزلی هیچیەکێکیان نەدات بەسەر ئەوی تریاندا و هیچکامێکیشیان نەکاتە بەرنامەی داڕشتنی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگادا. ئەمەش بە مەبەستی ڕێگرتن لەوەی دەوڵەت هەوڵی سەپاندنی ئەم یان ئەو دین بەسەر هەموو کۆمەڵگادا بدات، یان بیەوێت فەزڵی دیندار بەسەر بێدیندا، یان هی بێدین بەسەر دینداردا بدات. هەروەها بۆ ئەوەش دەوڵەت نەتوانێت ئەم یان ئەو ئایدیۆلۆژیای عەلمانی بکات بە ڕێنومای خۆی و بەسەر کۆمەڵگادا بیسەپێنێت. بەکورتییەکی دەوڵەت نە دەبێت دینێکی تایبەتی هەبێت، نە ئایدیۆلۆژیاکی نادینی و عەلمانی. دەوڵەت دەبێت بێلایەن بێت.

بەلام ئەم پرنسیپە تیورییە مانای ئەوە نییە کە دەوڵەت هەمیشە و هەردەم پێویستە بێدین بێت. دەوڵەت دەشێت خاوەنی دینی تایبەت بە خۆی بێت، وەک لە بەشێک لە دەوڵەتە ئەوروپییەکاندا دەیبینین، بەلام ئەم دۆخە نابێت ببێتە هۆی ئەوەی ئازادیی ئایینی و ئازادیی ویژدان و سەرجەمی ئازادییە دەستوورییەکانی تر سنووردار بکات. هاوکات نابێت دین پرۆسەی دەرکردنی یاساکان ئاراستە بکات کە یاساکان بۆ هەموو کۆمەڵگایەک بە دیندار و بێدینەوە. بوونی دین بۆ دەوڵەت نابێت بۆ نموونە ئەو یاسایانە تێک بدات کە ئازادیی ویژدان و بیرکردنەوە دەستەبەر دەکات، ناشبێت ئەو یاسایانەی کە دەر دەکرێن و ڕوویان لە هەموو کۆمەڵگایە یاساکانی ئەم یان ئەو دینی ناو کۆمەڵگا بن. بەکورتی،

ئـەوەی شـێوازی کارکردنـی دەوڵەتێکـی دیموکراسـی ئاراسـتە دەکات، دیـن نییـە، بەڵکـو ئـەو لانـی کەمـی ئەخلاقیاتەیـە کـە لەسـەرەوە باسـم کـرد. لـەم دۆخـەدا نـە دەوڵـەت دەسـت دەخاتـە نـاو کاروبـاری دینییـەوە، نـە دینیـش دەسـت دەخاتـە نـاو کاروبـاری دەوڵەتـەوە. ئـەوەی دەوڵـەت وەک دەوڵـەت بـە هێزە دینـی و نادینییەکانـەوە گرێ ئـەدات ڕێزگرتنـی ئـەو لانـی کەمـی ئەخلاقیاتەیـە. ئـەو ئەخلاقیاتەیـە بنەمـای پەیوەندییەکانـی دەوڵـەت لەنـاو خـۆی و بـە دەرەوەی خۆیـەوە ڕێـک دەخـات.

وەک دەبینین مەسەلە لێرەدا مەسەلەی جیاکردنەوەی دین و سیاسەت نییە لەیەکتری بەو مانایەی دین نابێت بەشێک بێت لە ژیانی سیاسی و لە ژیانی گشتی، یان نابێت پارت و ڕێکخراوی دینی بوونیان هەبێت، بەڵکو مەسەلەکە مەسەلەی ڕێزگرتنی ئەو مافانەیە کە وەک لانی کەمی ئەخلاقیات ئامادەیە و وەک بنەمای دروستبوون و کارکردنی سیستمێکی دیموکراسی کار دەکەن. ئەمەش دەبێت هەم دینییەکان و هەم نادینییەکان ڕێزی بگرن. وەک پێشتریش هێمام پێ کرد هەڕەشە بۆ سەر ئەم مافانە دەشێت هەم لەلایەن هێزە دینییەکانەوە دروست ببێت هەم لەلایەن هێزە عەلمانییەکانەوە. مەسەلەی ڕێزگرتنی ئەو ئەخلاقیاتی لانی کەمە هەر لە بنەڕەتەوە پەیوەندیی بە دینیبوون و عەلمانیبوونەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە دیموکراتبوون و دیموکراتنەبوونەوە هەیە. دین و عەلمانیەت دەتوانن دین و عەلمانیەتێکی سیاسی بن، بەڵام بوونیان بە دین و عەلمانیەتێکی دیموکراس پێویستی بە پاراستن و جێبەجێکردنی ئەو مافانە هەیە کە باس کران. هەموو ئەمانە لە چوارچێوەی هەستێکی مێژوویی و کردەیی قووڵ بە پێداویستییەکانی ئەو ساتەوەختە

مێژووییەی کە لە ئارادایە و بە خۆڕزگارکردن لە گەڕان بەدوای فیکر و پراکتیکی فریادڕەسدا. لە پەیوەندییشدا بە گروپە دینییەکانەوە دەوڵەت دەتوانێت لە ڕەوتێکی دیاریکراودا هاریکاریی گروپێکیان بکات بۆ ڕاستکردنەوەی هەندێک نایەکسانیی بونیادی یان غەدری مێژوویی، دەتوانێت فشار لەسەر هەندێک گروپی دینیی تر دروست بکات کە بەرەو ئەوە بچن ئەو لانی کەمی ئەخلاقیاتە لەناو ببەن. هتد... واتە مەرج نییە دەوڵەت هەمیشە لە ڕووی دینییەوە بێلایەن بێت، یان هەقی بەسەر ژیانی گروپە دینییەکانەوە نەبێت. هاوکات خاڵێکی دیکە کە گرنگە بەردەوام ئاگاداری بین ئەوەیە لەو ڕاستییە تێبگەین کە کۆمەڵگا پێدراو و شتێکی نەگۆڕ نییە، بەڵکو ڕووبەرێکە پڕ لە ململانێ و تەماحی کۆمەڵایەتی و سیاسیی جیاواز کە پێویستی بە گفتوگۆ و دانوسانی بەردەوام و بە سەرلەنوێ نرخاندنەوەی مافەکان هەیە. دەشێت لە ساتێکدا پاراستنی ئەم مافیان لەوی تریان گرنگتر بێت، زاڵکردنی فەزڵی ئەمیان بەسەر ئەوی تریاندا ناچاریی بێت. ئەوەی گرنگە بزانرێت ئەوەیە تیوریەک نییە پێمان بڵێت چۆن لە سیاقە مێژووییە تایبەت و ئاڵۆزەکاندا هەڵسوکەوت بکەین و وەک جەدوەلی زەرب لەبەری بکەین، ئەوەی هەیە کۆمەڵێک هێڵ و ئاراستەی گشتی و بیرکردنەوە و گفتوگۆ و دانوسانی بەردەوامە.

**دەرەنجام**

ڤایت بادەر تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت بە یەکێک لە "حیکایەتە گەورەکان" ناو دەبات و بەرگری لەوە دەکات کە پێویستە تیورەی دیموکراسیەت

و لیبرالیزم لە ئایدیۆلۆژیای عەلمانیەت جیا بکرێتەوە. بە بۆچوونی ئەم کۆمەڵناس و فەیلەسوفە سیاسییە بۆ ئەوەی دیموکراسیەتمان هەبێت، مەرج نییە عەلمانیەتمان هەبێت، عەلمانیەت پێشمەرجی دروستبوونی دیموکراسیەت نییە و پەیوەندیی نێوان دیموکراسیەت و عەلمانیەت پەیوەندییەکی حەتمی نییە.

بە دیوی ئەودویدا دینیش جەوهەرێکی دژەدیموکراسی یان دۆستەدیموکراسی نییە، بەڵکو پابەستە بە تێگەیشتن و هەڵسوکەوتی کەسەکانەوە. بۆیە دینێک بۆ ئەوەی بتوانێت بەشێک بێت لە سیستمێکی سیاسیی دیموکراسی پێویستی بەوەیە ئەو لانی کەمی ئەخلاقیاتەی قبووڵ بێت کە لە سەرەوە باسکرا. ئەم قبووڵکردنە بۆ هێزە عەلمانیەکانیش هەر ڕاستە.

بەم مانایە دیدی ڤایت بادەر چەندە ڕەخنەیە لەو پراکتیک و دەزگا دینییانەی کە ناتوانن لەگەڵ دیموکراسیەتدا بژین و بەها سەرەکی و بنەڕەتییەکانی دیموکراسیەت قبووڵ بکەن، ئەوەندەش ڕەخنەیە لەو دیدانەی کە دروستبوونی دیموکراسیەت بە عەلمانیەتەوە گرێ ئەدەن. ئەم کتێبەی لەم بەشەدا باس کرا هەوڵدانە بۆ گەڕان بەدوای هاوکێشەیەکی دیموکراسیدا، کە بتوانێت ژیانی پێکەوەیی دین و نادین لە دونیای مۆدێرندا بۆ دانیشتووانی کۆمەڵگا فەراهەم بکات. ئەویش لێرەشدا هەمان ئەو تێزی فێربوونی فرەجەمسەرییە دووبارە دەکاتەوە کە داوای ئەوە دەکات هەم دین و هەم عەلمانیەت زۆر شت لەسەر پرنسیپ و ئەخلاقیات و بەهاکانی مەسەلەی پێکەوەژیانێکی دیموکراسییانە فێر ببن.

# سەرچاوەکان

Bader, Veit (1999). Religious Pluralism: Secularism or Priority for Democracy?. Political Theory, Vol. 27, No. 5, pp. 597-633

Bader, Veit (2007). Secularism or Democracy? Associational Governance of Religious Diversity. Amsetrdam University Press

# کۆمەڵێک دەرەنجامی گشتی

# ڕەخنە لە عەلمانیەت بە چ مانایەک؟

**پێشەکی**

لـە بەشـی یەکەمـی ئـەم نووسـینەدا هەوڵـم دا ئـەو بۆچوونـە سـەرەکی و گرنگانـە نیشـان بدەم کە لـە سـەدەی نۆزدەهەمـەوە بـاس لـە شـوێن و پێگـەی دیـن لـە دونیـای مۆدێرنـدا دەکـەن. سـەرەتا باسـی ئـەو نووسـەر و زانـا کۆمەڵایەتـی و فەیلەسـوفانەم کـرد کـە قسـە لـە لاوازبوونـی حەتمیانـەی دیـن و پەراوێزکەوتنـی ڕۆڵـە سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و مەعریفییەکـەی لـە دونیـای مۆدێرنـدا دەکـەن. ئەوانـەی جۆرێـک لـە پەیوەندیـی حەتمـی لەنێـوان پرۆسـەی تازەبوونـەوەی کۆمەڵایەتـی و سیاسـیی لـە لایەکـەوە و لاوازبوونـی هەمەلایەنـی دیـن لـە لایەکـی دیکـەوە گریمـان دەکـەن. یاخـود بـاس لـە حەتمیەتـی کورتبوونـەوەی دیـن بـۆ پەیوەندییەکـی شەخسـی و تایبـەت لەنێـوان مرۆڤـی دینـی و خواکەیـدا، دەکـەن. بـەم جـۆرە باسـم لـە هاتنەکایـەی تێـزی "بەعەلمانیبوونـی دونیـا" وەک تێزێکـی وەسـفی کـرد، وەک تێزێـک کـە دەخوازێـت وا دەر بکەوێـت بـە شـێوەیەکی بێلایـەن و زانسـتییانە وەسـفی ئـەو دونیایـە دەکات

کە لە سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە خەریکە تازە دەبێتەوە و لە ئەدەبیاتی کۆمەڵناسی و فەلسەفیدا بە دونیای مۆدێرن ناسراوە. هەروەها باسم لە دروستبوونی عەلمانیەت کرد وەک ئایدیۆلۆژیایەک کە جەغت لەوە دەکات نابێت دین ڕۆڵی سیاسی لە ژیانی گشتیدا بگێڕێت و پێویستە بگەڕێتەوە بۆ ناو چوارچێوەکانی ژیانی تایبەتی و تاکەکەسی. بەکورتییەکەی بەشی یەکەمی ئەم کتێبە تەرخان بوو بۆ چۆنیەتیی دروستبوون و باڵادەستبوونی پارادایمی عەلمانیەت. لە بەشی دووهەمی کتێبەکەدا هەوڵم دا باس لە هێڵە گشتییەکانی ئەو پێداچوونەوە و ڕەخنانە بکەم کە لە سەدەی بیستەمدا ڕووبەڕوی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و ڕووبەڕووی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا، کراونەتەوە. هەروەها هێمام بەو شێوازە لە فیکری سۆسیۆلۆژی و فەلسەفی کرد کە لە سەدەی نۆزدەهەم خۆشیدا بە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا ناکۆک بوون و دیدێکی تریان بۆ پێگە و ڕۆڵی دین لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیی تاکەکەس و ژیانی گشتیدا هەبووە. لێرەدا باسم لە دید و بۆچوونەکانی کۆمەڵناسی فەرەنسی: ئەلێکسی دی تۆکفیل و لە بۆچوونەکانی فەیلەسوفی دانیمارکی: سۆرین کیرکیگارد کرد. مەبەست لە گەڕانەوە بۆ ئەم دوو نووسەرەی سەدەی نۆزدەهەم ئەوە بوو نیشانی بدەم کە تەنانەت لەناو سەدەی نۆزدەهەم خۆشیدا جۆرێک بیرکردنەوە سەبارەت بە پێگەی دین و ڕۆڵی لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیدا هەبووە، کە تەواو ناکۆک بووە بەو بیرکردنەوە عەلمانییەی لەو سەدەیەدا دروست دەبێت

و لە سەدەی بیستەمدا وەک پارادایمێک باڵادەست دەبێت.
بۆ ئەوەی خاڵە هەرە سەرەکییەکانی ئەو جیاوازییە لە بیرکردنەوە لە دین لە سەدەی نۆزدەهەمدا جارێکی تر نیشان بدەمەوە، بەراوردێکی زۆر خێرا لە نێوان دیدی ئۆگست کۆمت و دیدی کیرکیگارد بۆ دین دەکەم. وەک پێشتریش باس کرا ئۆگست کۆمت مێژووی مرۆڤایەتی بەسەر سێ قۆناغدا دابەش دەکات کە بریتین لە قۆناغی خوداناسی، قۆناغی میتافیزیک و قۆناغی پۆزەتیڤیزم بە مانای قۆناغی فیکری زانستی. بە بۆچوونی کۆمت لە قۆناغی خوداناسیدا دین بەتەواوی باڵادەستە و لێکدانەوەی دیاردەکان دەدرێتە پاڵ ویست و ئیرادەی هێزێکی ئاسمانی. ئەوەی لەناو ژیان و بووندا ڕوو دەدات بکەرێکی ئاسمانیی بەهێزی بۆ دروست دەکرێت، کە مرۆڤ نایبینێت، بەڵام لە بەرزاییەکانی ئاسمانەوە دیاردە و ڕووداوەکان ئاراستە دەکات و ڕەوتێک بە بوون و ژیانی مرۆڤ دەبەخشێت. لە قۆناغی دووهەمدا، قۆناغی میتافیزیک، زمانە دینییەکەی قۆناغی یەکەم گەشە دەکات و دەگۆڕێت بۆ زمانێکی تیۆریی ئاڵۆزتر و لەباتی گەڕاندنەوە بۆ خودا بۆ لێکدانەوەی دیاردەکان، باس لە ڕۆڵی ڕۆح و عەقڵ و ئیلهام دەکرێت و ئەمانەش وەک چەمکی موجەرد و ئەبستراکت بەکار دەهێنرێن. لە قۆناغی سێهەمدا، قۆناغی زانست، لۆژیکی زانستیی باڵادەست دەبێت و بۆ تێگەیشتن لە دیاردەکان ئینسان بۆ پێدراوە سروشتی و زانستییەکان دەگەڕێتەوە و لەناو هەر دیاردەیەک لە دیاردەکاندا بەدوای یاسای ناوەکی و هۆکاری تایبەتیدا دەگەڕێت. بە بۆچوونی

ئۆگست کۆمت زانست کۆتایی بە هەردوو قۆناغەکەی تر دەهێنێت و ئەم کۆتاییەش لە سەدەی نۆزدەهەم خۆیدا دەستی پێ کردوە. لە دیدی ئۆگست کۆمتدا قۆناغی دین قۆناغێکی منالّیی مرۆڤایەتییە، بەلاّم لە سەدەی نۆزدەهەمدا مرۆڤایەتی گەشە دەکات و کامڵ دەبێت و پێ دەنێتە قۆناغی بیرکردنەوەی زانستییەوە. لە ڕاستیدا بەشی هەرە زۆری بیریاران و تیوریستەکانی سەدەی نۆزدەهەم لەم سەرچاوە کۆمتییەوە دەست پێ دەکەن و گەشە بە تێزەکانی خۆیان ئەدەن. لە پاڵ ئەمە و لە هەمان سەدەدا سۆرین کیرکیگاردی فەیلەسوفی دانیمارکیی دیدێک بۆ دین گەشە پێ ئەدات تەواو پێچەوانەی ئەم دیدە ئۆگست کۆمتە. لە ڕاستیدا ئەوەی قۆناغەکانی گەشەکردنی ئینسان لای کیرکیگارد بخوێنێتەوە ئەوەی بۆ ئاشکرا دەبێت کە کیرکیگارد خەریکی پێچەوانەکردنەوەی ئەو دیدەی ئۆگست کۆمت و هەڵوەشاندنەوەی سێ قۆناغەکەی گەشەی فیکرە لای ئەم فەیلەسوفە فەرەنسییە. کیرکیگارد شێوە ژیان و بیرکردنەوەی دینیی نەک ناخاتە قۆناغی سەرەتای و منداڵیی مرۆڤ و مرۆڤایەتییەوە، بەڵکو وەک قۆناغی کامڵبوون و پێگەیشتنی ئینسان مامەڵەی دەکات. لە دیدی کیرکیگارددا ئینسان لە گەشەکردنیدا بەرەو کامڵبوون بە سێ شێواز و مۆدێلی جیاوازی ژیاندا تێدەپەڕێت، کە بریتین لە: "شێوەژیانی دینی"، "شێوەژیانی ئیستاتیکی" و "شێوەژیانی ئەخلاقی" بە بۆچوونی کیرکیگارد شێوەژیانی دینیی بەرزترین و بالاّترین شێوەژیانی مرۆڤە و ئەگەر شتێک هەبێت ناوی کامڵبوونی

مرۆڤ بێت، ئەوا لەناو ئەو شێوەژیانەدا دەستەبەر دەبێت. کیرکیگارد "شێوەژیانی ئیستاتیکی" و "شێوەژیانی ئەخلاقی" بە کەمتر و نزمتر لە شێوەژیانی دینی دەزانێت. لای کیرکیگارد "شێوەژیانی ئیستاتیکی" ئەو شێوە ژیانەیە کە تیایدا مرۆڤ سەرقاڵ و لە گەڕانێکی بەردەوامدایە بەدوای چێژ و تێرکردنی دەستبەجێی حەز و ئارەزووەکانیدا، چ لە ئاستە مادییەکەی ژیان و چ لە ئاستە ڕەمزی و موفاریقەکەیدا. پاڵەوانی ئەم جۆرە ژیانە کەسێکە ناتوانێت پەیوەندیی قووڵ بە ژیان و بە ئینسان و بە مەسەلە گرنگەکانەوە دروست بکات، لەباتیی ئەمانە پەیوەندییەکانی هەمیشە پەیوەندی کورتخایەن و کاتی و بێقووڵایین و چێژوەرگرتن لۆژیکی ناوەکییان دەستنیشان دەکات. لای کیرکیگارد ئەم جۆرە بوونەوەرە هەمیشەوەک وێڵگەردێک بەناو مەملەکەتی ئەگەرەکاندا دێن و دەڕۆن، بەڵام هەرگیز ناتوانن یان نایانەوێت هەڵبژاردنێکی بنەڕەتی و بنچینەییان لە ژیاندا هەبێت. هەرچی مرۆڤی دینییە ڕێک پێچەوانەی ئەو مرۆڤە چێژپەرست و چێژگەڕەیە کە لە قۆناغی ئیستاتیکیدا دروست دەبێت. مرۆڤی دینیی لە دیدی کیرکیگاردا تاقە فۆرمێکی مرۆڤی کامڵە. لەم ڕووەوە کیرکیگارد دین وەک بەشێک لە قۆناغی کامڵبوونی ئینسان وێنا دەکات و ڕۆڵێکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی هێجگار گەورە و گرنگیشی پێ دەبەخشێت. ئەو خاڵەی من لەو بەشەی ئەم کتێبەدا ویستم بە خوێنەری نیشان بدەم ئەوەیە کە بیرکردنەوە لە دین، تەنانەت لە سەدەیەکی پۆزەتیڤیستی وەک سەدەی نۆزدەهەم خۆشیدا،

کورت ناکرێتەوە بەتەنها بۆ ئەو دیدە عەلمانی و دژەدینیانەی لەو سەدەیەدا لە ئارادا بوون. بەڵکو لەپاڵ ئەمانەدا هێڵێکی گرنگی تری بیکردنەوە لەئارادایە، کە بالادەستبوونی پارادایمی عەلمانیەت، بەتایبەتی لە سۆسیۆلۆژیای ماکس ڤێبەر و دۆرکهایم، تەواو پەراوێزی دەخات. هەمان ڕوانین بەنیسبەت شێوازی شیکردنەوە و لێکدانەوە و ڕۆڵی دین لای کۆمەڵناسی فەرەنسی: ئەلێکسی دی تۆکفیل لەئارادایە. وەک کیرکیگارد، تۆکفیلیش دین بە دیاردەیەکی پەراوێزی نازانێت و لە شیکردنەوەیدا بۆ ڕۆڵی دین لە کۆمەڵگای ئەمەریکیی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەو ڕاستییەی بۆ دەر دەکەوێت کە دین ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانی گشتیی ئەو کۆمەڵگا مۆدێرنەدا دەگێڕێت. بەڵام بالادەستیی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا ئەم ڕوانینە گرنگەی تۆکفیلیش پەراوێز دەخات.

بەڵام وەک بەدرێژیی لەم کتێبەدا باس کرا لە سالانی شەستی سەدەی بیستەمەوە پارادایمی عەلمانیەت بەتوندی ڕووبەڕووی ڕەخنەکردن دەبێتەوە و پێگە زانستییەکەی ڕووبەڕووی چەندەها پرسیار و تەحەدای تیوری و تەجریبیی دەکرێتەوە. ئەو ڕوانینانەی کە تازەبوونەوەی کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگی بە عەلمانیبوونی دونیاوە گرێ ئەدەن دەکەونە ژێر پرسیار و چەندان کۆمەڵناس و ئینسانناس و فەیلەسوفی کۆمەلایەتی و سیاسی دێنە کایەوە کە ئەو گرێدانە حەتمییە دەخنە ژێر پرسیارەوە. ئەمرۆ بە دەگمەن نەبێت کۆمەڵناس و تیوریستێکی کۆمەلایەتی نادۆزینەوە باوەڕی بە تێزە تەقلیدییەکانی بەعەلمانیبوونی دونیا بێت و بەکاریان

بهێنێت بۆ شیکردنەوەی پێگە و ڕۆڵی دین لە دونیادا، یان بۆ خوێندنەوەی پرۆسەی مۆدێرنبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی، بۆ ئەم تێزە بگەڕێتەوە.

بەم جۆرە لە ساڵانی شەستەوە هەم تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و هەم عەلمانیەت خۆشی وەک ئایدیۆلۆژیا دەکەوێتە ژێر ڕەخنە و پێداچوونەوەیەکی هەمەلایەنەوە. تا ئەو شوێنەی کەسێکی وەک یورگن هابرماز باس لە کۆمەڵگای پۆست عەلمانیەت و فەیلەسوفێکی وەک ڤایت بادەر باس لە دابڕانی دیموکراسیەت و عەلمانیەت لە یەکتری و کۆمەڵناسێکی وەک پیتەر بێرگەر باس لە پێداویستیی هاتنەکایەی پارادیمێکی تازە، بکەن. لە ڕاستیدا لیستی ئەو زانا و فەیلەسوفە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا وەک تێزێکی ناڕاست بۆ خوێندنەوەی پێگە و ڕۆڵی دین لە دونیای مۆدێرندا دەبینن، زۆر لەم ناوانە درێژترە کە من لەم کتێبەدا باسم کردن، بەڵام لەبەر نەبوونی ماوە و لەبەر قەبەنەبوونی قەبارەی کتێبەکە تەنها باسمان لە دید و بۆچوونی ئەو ناوانە کردن.

بەڵام بۆ کەسێک لە کۆمەڵگایەکی وەک کۆمەڵگای ئێمەدا بژی، پرسیاری سەرەکیی ئەوەیە: ئایا ئەم ڕەخنەگرتنە لە عەلمانیەت چ مانایەکی هەیە؟ پێویستە چ دەرەنجامێک لەم ڕەخنەیەوە وەدەست بهێنین؟ بەتایبەتی لە دونیای ئێمەدا کە ئیسلام وەک دین تەواو باڵادەستە و هێزەکانی ئیسلامی سیاسی توانایەکی گەورەی تەکفیرکردن و هێرشبردنی مادی و مەعنەوییان بە ناوی دینەوە بۆ سەر ژیانی تایبەت و گشتیی ئەو کەسانە هەیە

کە باوەڕیان بە دین نییە، یان لە دیندا بەدوای ماناکانی ژیانیاندا ناگەڕێن. ئایا لە ڕەوتێکی مێژوویی لەو جۆرەدا ڕەخنەکردنی عەلمانیەت چ مانایەکی هەیە؟

**ئایا ئیسلام چارەسەرە؟**

ئایا ڕەخنەکردنی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و ڕەخنەکردنی عەلمانیەت لە دونیای ئێمەدا مانای ئەوەیە کە ئیتر ناچارین بۆ دین بگەڕێینەوە و دین بە چارەسەری کێشەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆکەی بزانین؟ ئایا بەڕاست بەهێزبوونی دین و بەدەزگایی و بەسیاسیکردنی ڕێگاچارەی کێشەکانی دونیایە ئێمە و کۆمەڵگاکانی دەوروبەرمانە؟ ئایا ڕەخنەکردنی عەلمانیەت مانای ئەوەیە چاوەڕوانی دروستکردنی دەسەڵاتێکی سیاسیی دینی بین بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی دیموکراس و ڕێزبەخش و پێشکەوتوو؟ ئایا ئەم ڕەخنەیە مانای ئەوەیە دین ببێت بە بنەمای هەڵسوکەوتی سیاسی و یاسایی دەوڵەت و ببێت بە شێوازی هەڵسوکەوتی دەزگاکانی حوکمڕانی و ببێت بە لۆژیکی ئیشکردنی دەزگا گشتییەکانی ناو کۆمەڵگا؟ ئایا ڕەخنەکردنی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا و ڕەخنەکردنی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا، مانای نووسینی ڕەچەتەیەکی دینی بۆ کێشەکانی ناو ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی؟ بەکورتی، ئایا ڕەخنەکردنی عەلمانیەت مانای چەپڵەلێدان بۆ ئیسلامی سیاسیی یان ئیسلامیزم و ئایا بە ڕاست ئیسلام چارەسەرە وەک هێزە ئیسلامییەکان بۆ ماوەی سەدەیەکە بێ ماندووبوون سەدبارەی دەکەنەوە؟ بێگومان وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی سەرەوە بە

نەخێرە، نەخێرێکی گەورە و ئاشکراش، بینراو و بیستراو. ڕەخنەکردنی تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیاو ڕەخنەکردنی عەلمانیەت وەک ئایدۆلۆژیا، مانای بانگەشەکردن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی دینی نییە، مانای ئەوە نییە دەوڵەت دین بکاتە بنەمای دەستنیشانکردنی پەیوەندییەکانی بە کۆمەڵگاوە، مانای ئەوەش نییە دین ببێتە بنەمای سیستمی یاساو داوەری، مانای ڕێکخستنی ژیانی گشتیی نییە لەسەر بنەمای دین، مانای بەدینیکردنی دەزگاکانی حوکمڕانی نییە، مانای سەپاندنی دین نییە بەسەر ئەخلاقی گشتیدا، مانای کردنی دین بە سەرچاوەی ئەخلاق و سەرچاوەی یاسا و سەرچاوەی شوناس نییە، مانای ئەوەش نییە دین یان ئیسلام چارەسەری کێشەکانە، هتد... ئەی کەواتە ڕەخنەکردنی عەلمانیەت چ مانایەکی هەیە؟ ئەگەر ئەو ئەرکانەی سەرەوە بە دین نەسپێردرێت ئەی بۆچی ڕەخنە لە عەلمانیەت بگرین؟

بەر لە هەموو شتێک ئەم کتێبە ئەگەر تەنها یەک ئامانجیشی هەبووبێت، ئەوە ئامانجی بەگژاچوونەوەی ئەو لۆژیکە دوولایەنە داخراوەیە کە پێی وایە مرۆڤ و کۆمەڵگاکانە مەحکومن بەوەی لەنێوان دین و عەلمانیەتدا یەکێکیان هەڵبژێرن. یان ئامادەگیی ئەمیان مانای نەمان و سڕینەوەی ئەوی تریان. ئەم لۆژیکە لە پشتی بەشێکی گەورەی بەدحاڵیبوون و کێشە گەورەکانی پەیوەندیی نێوان دین و نادینەوەیە. سەرەڕای هەوڵدان بۆ تێپەڕاندنی ئەم لۆژیکە دەکرێت هەشت مانای سەرەکی بە ڕەخنەکردنی عەلمانیەت وەک ئایدیۆلۆژیا و بە تێزەی بەعەلمانیبوونی دونیا ببەخشین.

یەکـەم: ڕاسـتکردنەوەی مێـژووی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگیـی کۆمەڵـگا هاوچەرخەکانـی دوو سـەدەی ڕابـردوو. مێژوویـەک بـە پێچەوانـەی تێزەی بەعەلمانیبوونـی دونیاوە، دین ڕۆڵێکی گرنـگ و بەرچـاوی تێدا بینیـوە، نەک ئـەوەی بووبێت بە هێز و دیاردەیەکی لاوەکی و پەراوێزی، یـان کورت بووبێتەوە بـۆ پەیوەندییەکـی شەخسـی لەنێـوان ئینسـان و خوداکەیـدا. دەرچوون لـە پارادایمـی عەلمانیـەت ڕزگارمـان دەکات لـە تێزێک کـە مێـژووی دوو سـەدەی ڕابـردوو، بەتایبەتـی ڕۆڵـی دیـن لـەو مێـژووەدا، بـە شـێوەیەکی هەڵـە و ناڕاسـت دەخوێنێتـەوە. دووهەم: قوڵکردنەوەی تێگەیشتنمان بۆ مۆدێرنە و نەبەستنەوەی بـە شـێوەیەکی حەتمییـەوە بـە لاوازبـوون و پەراوێزخسـتنی دینـەوە. واتـە کردنـەوەی پانتاییی فیکری و تیـوری و میتۆدیـی نـوێ بـۆ جێکردنـەوە و نیشـتەجێکردنی دیـن لەنـاو پـرۆژەی مۆدێرنـەدا، جێکردنەوەیـەک لـە دەرەوەی کورتکردنەوەیـدا بـۆ پەیوەندییەکـی تاکەکەسـی بـە خـوداوە بەتەنهـا. ئەمـەش بـە مەبەستی بیرکردنەوە لە تازەکردنەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و فەرهەنگـی و ئەخلاقیـی بەبـێ ئـەوەی ئـەو تازەکردنەوەیـە مانـای ئـەوە بێـت دیـن بکرێتـە دەرەوەی ژیانـی گشـتییەوە. سـێیەم: گەڕاندنـەوەی نـرخ و بەهـا بـۆ بیرکردنـەوەی دینـی و یەکسـاننەکردنی بـە سـیحر و خورافـەت و جەهـل. لەمـەش گرنگتـر نەبینینـی ئینسـانی دینـی وەک ئینسـانێکی گەمـژە و نـەزان. دەشـێت لـە هابرمـازەوە فێـر ببیـن کـە ڕەنگـە دیـن شـتێکی گرنگمـان لەسـەر دونیـا و مـرۆڤ و کێشـەکانی پـێ بڵێـت، کـە شـایانی گوێلێگرتـن و وەرگرتـن و بەکارهێنـان بێـت.

چوارەم: پێداچوونەوە بە تیورەی دیموکراسی و بە مەسەلەی بەدیموکراسیکردنی کۆمەڵگادا و ڕزگارکردنی ئەم تیورەیە لەو بەستنەوە حەتمی و میکانیکییە کە دیموکراسیەت بە عەلمانیەتەوە گرێ ئەدات. بەمەش شوێنکردنەوە بۆ فۆرمێکی گەشەکردوو لە پلورالیزم کە دین یەکێک لە پێکهێنەرەکانی ئەو پلورالیزمە بێت.

پێنجەم: دروستکردنی کایەیەکی سیاسیی پلورال کە تیایدا هێزی دینی وەک هێزی نادینیی ئامادە بێت و بتوانن بەیەکەوە بەشێک بن لە کایەی سیاسی و لە ژیانێکی گشتییش کە هێزە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگا بتوانن قبووڵی بکەن، نەک تەنها زۆرینەیەک لە زۆرینەکان. ئەم پلورالیزمە سیاسییە دەتوانێت بنەمایەکی بەهێز و گشتی بێت بۆ فۆرمەکانی تری پلورالیزمی لە کۆمەڵگادا.

شەشەم: بیرکردنەوە لە فۆرمێکی تری ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان هێزە دینی و هێزە نادینییەکان لە دەرەوەی یەکدینەفیکردن و یەکدیتاوانبارکردن بە دەیان تۆمەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی. واتە هەوڵدان بۆ بنیادنانی پردێک لەنێوان دین و نادیندا بە مەبەستی تێپەڕاندنی ئەو دوالیزمە ترسناکانەی کە مێژووی دین و نادین لە ناوچەکەدا ئاراستە دەکات.

حەوتەم: کردنەوەی ڕووبەرێکی مەعریفی و سیاسیی نوێ بۆ فێربوونی هێزە جیاوازەکان لە یەکترەوە. یەکێک لەو خاڵە سەرەکییانەی کە هەم هابرماز و هەم ڤایت بادەر باسیان لێوە کرد مەسەلەی فێربوونی هێزە دینی و هێزە عەلمانییەکانە لە یەکتری. گوێگرتن و گفتوگۆکردنێکی بەردەوام بە مەبەستی

گەیشتنە چارەسەر بۆ هەندێک لەو کێشانەی کە تەنها لە ڕێگای ڕێککەوتن و نزیکبوونەوەی کۆمەڵایەتییەوە قابیلی چارەسەکردنە. بەمەش خۆڕزگارکردن لە وێنەی دوژمن و تاوانبار کە ڕێ لە هەر کردەیەکی فێربوونی مێژوویی لە یەکتری دەگرێت.

هەشتەم: کۆتاییهێنان بە یەک سەدە موناقەشەی بێزەنتیی ناڕاست و ناتەندروست لەسەر پەیوەندیی نێوان دین و سیاسەت، دین و دەوڵەت. ڕزگاربوون لەو سادەگۆییەی کە لەشکرێک لە خوێندەوار و سیاسی لە هەردوو بەرەکەدا بەرگریی لێ دەکەن و کردنەوەی ئەم موناقەشەیە بە ڕووی ئەگەری میتۆدی و تیوریی تازەدا.

**بەخشینی ئەولەویەت بە دیموکراسیەت**

بە بۆچوونی من ئەو بۆچوونەی ڤایت بادەر کە باس لە "ئەولەویەتی دیموکراسیەت" دەکات دەتوانێت سوودێکی هێجگار گەورەشی بۆ دونیای ئێمە هەبێت. ئەوەی لە دونیای ئێمەدا تەحەدای ژمارە یەکە ڕزگاربوونە لەو سیستمە دەسەڵاتگەرە ستەمگەر و ویراسی و گەندەڵ و مافیاییە سوڵتانییانەی لەئارادان. واتە ئەولەویەتی ناو کایەی سیاسیی ئێمە و کایەی سیاسیی میلەتانی دراوسێمان ئەولەویەتی دیموکراسیەتێکی دەستوورییە کە مرۆڤی ئێمە وەک بوونەوەرێکی خاوەن ماف و خاوەن ڕێز ببینێت. گەشە بەو "لانی کەمی ئەخلاقیات"ە بدرێت کە دروستکردنی سیستمێکی دیموکراسیی دەستووریی پێویستی پێیەتی.

وەک ڤایت بادەر دەڵێت مەسەلەی سەرەکیی لە دیموکراسیەتدا بەخشینی ئەولەویەتە بە دیموکراسیەت خۆی نەک بە عەلمانیەت. ئەوەی گرنگە ئەوە نییە ئایا دەوڵەت و هێزە سیاسییەکان عەلمانین یان نا، ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئایا دەوڵەت و ئەو هێزانە دیموکراسین یان نا، ئایا دەوڵەت و هێزەکان پەیڕەوی لانی کەمی ئاکار و بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی دیموکراسییانە دەکەن یان نایکەن. یەکێک لە ئەمانجەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە نیشان بدات کە مەرج نییە دیموکراسیەت پێویستی بە عەلمانیەت بێت، بەڵام پێویستی بەو ئاخلاقیاتی لانی کەمەیە کە ڤایت بادەر باسی دەکات. بەم مانایە دەشێت هەم دین و هەم عەلمانیەت ڕێگر بن لەبەردەم دروستبوونی دیموکراسیەتدا، بەڵام دەشکرێت هەردووکیان بەشدار بن لە دروستکردنی دیموکراسیەتدا. ئەوەی پێویستە ڕێزگرتنی ئەو لانی کەمەی ئەخلاقیاتەیە کە پێ لەسەر بوونی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەن ماف و خاوەن ئازادی و خاوەن کەرامەت دادەگرێت.

وەک نیشانیشمان دا دابینکردنی "ئەخلاقیاتی لانی کەم" مانای ڕێزگرتنی ئەم حەوت مافە سەرەکییە.

١- مافی هەبوونی ئاسایش و بژێوی. ٢-مافی ژیان و مافی ئازادی و مافی پاراستنی جەستە لە توندوتیژی. ٣-مافی دابینکردنی بژێوی و خوێندن و خزمەتگوزاریی بنەڕەتی. ٤- مافی دابینکرنی لانی کەمی مامەڵەکردنێکی مافپەروەرانە. ٥-مافی لانی کەمی ڕێزگرتن. ٦- مافی ئازادیی ویژدان (کە مافی بوون و نەبوونی دین و مافی گۆڕینی دین و دەرچوون

لە دینیش دەگریتەوە). ٧-مافی مامەڵەکردنی ئینسان وەک بکەر و کەسایەتییەکی یاسایی سەربەخۆ.

بە بۆچوونی من دەشێت ئەم لیستە لە دونیای ئێمەدا مافێکی گرنگ و بنەڕەتیی بۆ زیاد بکرێت کە مافی تەکفیرنەکردنە. واتە هیچ هێز و لایەن و کەسایەتییەکی دینیی بۆی نەبێت هیچ کەس و لایەن و کەسایەتییەکی تر تەکفیر بکات. ڕێگرتن لە تەکفیر مافێکە مرۆڤی ئەو ناوچەیە پێویستییەکی گەورەی پێیە. هەموو تێزە ڕادیکاڵ و ترسناکەکانی هێزەکانی ئیسلامی سیاسی لە ساڵانی هەفتاوە تا سەر داعش لەسەر ئەم مەسەلەی تەکفیرکردنە کاریان کردوە. تەکفیکرکردنی تاکەکەس و گروپ و لایەنی دیاریکراو، تا بە تەکفیرکردنی هەموو کۆمەڵگا دەگات. بۆ ئەوەی هەردوو بەرەکە ببن بە هێزی دیموکراس دەبێت ئەو هەشت مافە بنەڕەتییەی سەرەوە قبووڵ بکەن.

دابینکردنی ئەم مافانە پێویستی بەوەیە هەم عەلمانیەت گۆڕان بەسەر دید و ڕوانینەکانیدا بهێنێت و هەم دین و دینداریی‌ش. هەردوو بەرەکە پێویستیان بە دەسکاریکردنی بۆچوون و تێگەیشتنەکانیان هەیە بۆ خۆیان و بۆ تێز و تیورە و بۆچوونەکانیان. هەروەها پێوستیان بە دەسکاریکردنی تێگەیشتنیان هەیە بۆ ژیانی گشتی و پلورالیزم و ماف و ڕێزگرتنی جیاوازیی. هەموو ئامەنە پێویستیان بە دیالۆگ و دانوسان و گفوتگۆی بەردەوام هەیە.

خاڵێکی تر کە گرنگە لای هەموو لایەنەکان ئاشکرا بێت ئەوەیە: دیموکراسیەت پرۆسەیەکی گەورەی فێربوون

و فێربوونی بەردەوام ئاراستەی دەکات، لەم پرۆسەیەدا هەم هێزە دینییەکان دەبێت فێر بن ببن بە دیموکراس، هەم هێزە عەلمانییەکانیش. کەس لە سکی دایکییەوە وەک کەسایەتیی دیموکراس یان بە دژەدیموکراس لەدایک نابێت، بوون بە دیموکراس و بوون بە دژەدیموکراس پرۆسەی بە کۆمەڵایەتیبوون و شێوازی پیادەکردنی دەسەڵات و چۆنیەتیی کارکردنی دەزگاکان و چۆنیەتیی ڕێکخستنی پەیوەندییەکان و گفوتگۆ و موناقەشەکانی ناو ژیانی گشتی و شێوازی پەروەردەکردن، بەڕێوەی دەبات. لای ئێمە ئەوانەی باس لە دین دەکەن یان ڕقیان لە دینە و ئەم ڕقەش وایان لێ دەکات دین بە سەرچاوەی هەموو نەهامەتییەکانی دونیا بزانن، یان ئەوەتا عاشقی دین بوون و دەیکەن بە سەرچاوەی چارەسەرکردنی هەموو بیمارییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکانی. هەردوو بەرەکەش کۆمەڵێک قسەی گشتیی نازانستی لەسەر دین و لەسەر ڕۆڵ و توانا و شێوازی ئامادەگیی دین لە کۆمەڵگادا دەکەن. لێرەدا هەوڵ ئەدەم جارێکی دیکە پێ لەسەر دوو خاڵی گرنگ دابگرم کە بەشێکە لە هەموو سۆسیۆلۆژیایەکی زانستی بۆ دین، کە دەشێت هاریکارمان بێت بۆ دەرچوون لەو فەوزا نامیتۆدی و لەو گشتگیری و قسەکردنە سادە و زۆر جار سایکۆلۆژییانەی لەسەر دین لە دونیای ئێمەدا دەکرێت.

یەکەم خاڵێک بکرێت لێیەوە دەست پێ بکەم، پێداگرتنە لەسەر ئەو ڕاستییە میتۆدییەی کە زەحمەتە بتوانین دەستنیشانی چییەتیی دین بکەین؟ زەحمەتە بتوانین پێناسێک بۆ دین بکەین

هەموو شێوەکانی دین لە دونیادا بگرێتە خۆی. چونکە ئەگەر باوەڕهێنان بە بوونی خودایەک وەک خاڵی سەرەکیی دین تەماشا بکەین، خودایەک کە دینی جولەکە و مەسیحی و ئیسلام لە وێنەی ئینسانێکی پێرفێکت و هەمەتوانادا وێنای دەکات، ئەوا چەندەها دینی تر لە دونیادا هەیە کە نە خودای تێدایە و نە باوەڕهێنانیش بە خودایەکی ئاسمانی. بۆ نموونە دینی بوزا، یان بودیزم، کە دینێکە ملیۆنەها ئینسان باوەڕیان پێیەتی و بەشێکی هەرە گرنگیی شوناسی ئەوان دەستنیشان دەکات. جگە لەمە چەندان دینی تر لە دونیادا هەیە کە فرەخودایە، وەک دینی یۆنانییە کۆنەکان و دینی هیندۆسییەکان.

خاڵی دووهەم ئەوەیە، ئەگەرچی دین دیاردەیەکی گەردوونییە و کۆمەڵگایەک نادۆزینەوە دینی تێدا نەبێت، بەڵام بە هیچ جۆرێک ناتوانین باس لە یەک جۆر دین و لە یەک شێواز باوەڕی دینی لەناو تەنانەت یەک کۆمەڵگاشدا بکەین. تەنانەت لەناو یەک دین خۆشیدا ناتوانین باس لە بوونی یەک تێگەیشتن بۆ مەسەلە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ئەو دینە بکەین. لە ڕاستیدا هیچ دینێک نییە بەبێ دونیایەک دابەشبوونی ناوەکی، ئیسلام پڕیەتی لە "فیرقە و میلەل و نەحەلی" جیاواز، مەسیحیەتیش لەم دابەشبوونە ناوەکییە بێبەری نییە، هەر بۆ نموونە لە مەسیحیەتدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوان کاتۆلیکیەت و مەسیحیەتی ئەرتۆدەکسی و ئەنگلیکان و پرۆتستانتدا هەیە. چ لە ڕووی مێژوویی و چ لە ڕووی جوگرافی و چ لە ڕووی دەزگای و چ لە ڕووی ناوەرۆک و چ لە ڕووی ڕۆڵی پیاوانی دینەوە، دین چ لە ئێستادا و

چ لە ڕابردوودا دیاردەیەک نەبووە دابڕاو لە جیاوازی و فرەجۆری و فرەدەرکەوتی، لە ناکۆکی و ململانێ و پێکدادانی ناوەکی. کورتکردنەوەی هەموو ئەمانە لەژێر یەک ناودا، بازدانە بەسەر سەرەتاییترین پێدراوە زانستی و میتۆدییەکانی قسەکردن لەسەر دین.

بەکورتی، ئەوەی لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا باس کراوە، هەوڵدانێکە بۆ دوورکەوتنەوە لەو هەژارییە فیکری و سیاسییەی کە هەم لەلای بەشێکی زۆری بەرەی عەلمانیەت و هەم لالەی بەشێکی زۆری بەرەی ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا ئامادەیە. دەرنەچوون لەو دوو لایەنە ترسناکەی کە دونیا بۆ دین و عەلمانیەت دابەش دەکات، دەشێت بۆ جەهەنەممان ببات، بەلام هەرگیز ناتوانێت لە جەهەنەم ڕزگارمان بکات.